# ژانرەکانی ڕۆژنامەوانی
# و
# مێژووی چاپخانە 1450-1500

## د.مەغدید سەپان

هەولێر – ٢٠٠٨

دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

- **ژانرەکانی ڕۆژنامەوانی و مێژووی چاپخانە 1450-1500**
- نووسین: د.مەغدید سەپان
- نەخشەسازی ناوەوە: طـه حسین
- بەرگ: ئاسۆ مامزادە
- ژمارەی سپاردن: (١٦٥٤)
- نرخ: (٣٠٠٠) دینار
- چاپی یەکەم : ٢٠٠٨
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- چاپخانە: چاپخانەی خانی - دهۆك

**زنجیرەی کتێب (٣٠٤)**



ماڵپەڕ: www.mukiryani.com
ئیمەیل: info@mukiryani.com

# پێڕست

ئـــەم کتێبـــە بـــە مامۆســـتا گیـــوی موکریـــانی پێشکەشە... ئەگەر ئـەو نەبووایـە، ئـەم کتێبـەش نەدەبوو...

# پێشەکی

لە ساڵی دوو هەزار کتێبێکم بەناوی تیۆری ڕۆژنامەنووسی بە ٢٠٠ لاپەڕە لە سوید چاپکرد. کتێبەکەم پێشوازی باشی لێکرا و لە گۆڤاری "ڕۆژنامەوانی" ژمارە چوار هەندێك لە نووسینەکانی چاپکرایەوە و کاك حەمەساڵح فەرهادیش لەهەمان ژمارە وتارێکی لەسەر ناوەڕۆکی کتێبەکە لەگەڵ هەندێك ڕەخنە و تێبینی بەجێ نووسیبوو.

من بەپێویستم زانی سەرلەنوێ بەشێك لە کتێبی تیۆری ڕۆژنامەنووسی پاش دەستکاری کردنی زۆر و چاکردنی تێبینی دۆست و برادەران لەم کتێبەم چاپ بکەمەوە.

کتێبی تیۆری ڕۆژنامەنووسی لەو بابەتانەی خوارەوە پێك هاتبوو: هەواڵ، گوتار، ئینتەرڤیو، ڕیپۆرتاژ، نووسین، نیگار لە ڕۆژنامە، سەردێر، پیشەی ڕۆژنامەنووس و ئەخلاق لە ڕاگەیاندن دا. جگە لەوانەی سەرەوە، پاشکۆیەکی لەگەڵ بوو کە دوو گوتار شوێنیان بووبۆوە وەك: گۆڤاری دیدار لەگەڵ دوانزە ژمارەی "کوردستانی نوێ" بە زمانی ڕوسی.

لە بەشی یەکەمی ئەم کتێبە بەناوی "ژانرەکانی ڕۆژنامەوانی"، جگە لە پاشکۆ هەموو نووسینەکانی سەرەوەی تێدان. ئەو بابەتانەی خوارەوەشم خستۆتە سەر: فۆتۆگراف، هەڵسەنگاندن، پوختە، ژانری لێکۆڵینەوە، نامە لەگەڵ ژانری فلیتۆن.

ئەو ژانرانەی ئەم جارە خستوومەتە ناو ئەو کتێبە، هەموو ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی ئەوروپا پڕن لە نووسین بەو ژانرانەی سەرەوە.

لە بەشی دووەمی ئەم کتێبەم بەناوی ڕاگەیاندن، ئەو بابەتانەی خوارەوەی تێدان: ڕاگەیاندن، ڕادیۆ و تەلەفزیۆن، ئاژانسەکان، ڕۆژنامەی بەلاش "میترۆ". لە بەشی سێیەم بەناوی مێژووی چاپخانە، ئەم بابەتانەی خوارەوەی تێدان: سەرهەڵدانی ئەلف و بێ و کاغەز دروستکردن،



هەوڵەکانی دۆزینەوەی چاپ، مێژووی چاپخانە لە ئەوروپا "نیوەی دووەمی سەدەی پازدە" لەگەڵ جۆرەکانی چاپ.

لەسەر بەشی دووەمی ئەم کتێبە بەزمانی کوردی سەرچاوە زۆر کەم هەن. لەسەر چاپخانە کتێبێك بەناوی: چاپکردن و نەخشە سازی هەیە. ئەو کتێبە بەڕێزان: عەبدولقادر عەلی مەردان لەگەڵ ئەحمەد سەید عەلی بەرزنجی نووسیویانە. دەزگای برایەتی لەساڵی ١٩٩٩ لەهەولێر چاپی کردووە. کاك نەژاد عەزیز سورمێ کتێبێکی بەناوی "ڕۆژنامەگەری کوردی چەند سەرەقەڵەمێك لەبارەی تەکنیك و هونەرەکانی" نووسیوە. کتێبی کاك نەژاد، لەدەزگای برایەتی لەساڵی ١٩٩٩ چاپکراوە.

ئەو نووسەرانەی تا ئێستا لەسەر تیۆری ڕۆژنامەنووسیان نووسیوە و بەرهەمەکانیان دەستی من کەوتوون، ژمارەیان زۆر کەمە و کتێبەکانیش کەم و کورتیان هەیە. ئەو کتێبانەی لەزمانی تریش وەرگێڕدراونەتە سەر زمانی کوردی، زمانی وەرگێڕانەکەیان وشك و ڕەقە. خوێنەر خراپ لە مەبەست و ناوەڕۆکی نووسەری یەکەم دەگا. لەگەڵ ئەو چەند تێبینیانەی سەرەوەش نووسین و وەرگێڕانی ئەو جۆرە کتێبانە، هەنگاوی چاك و پێویستن. من بەوردی دەیانخوێنمەوە.

ئەمڕۆ لە کوردستان ڕۆژنامە و گۆڤاری زۆر دەردەچن، ئێزگەی ڕادیۆ و کەناڵی تەلەفزیۆن زۆر هەن. ئەگەر ئەو ڕاگەیاندنانە هەمووشیان حیزبی نەبن، ئەوا حیزبەکان یارمەتی دەرکردنیان دەدەن. بۆیەش ڕاگەیاندنی کوردی ڕاگەیاندنێکی حیزبیە.

حیزبەکان تا ئێستا، هەموو ئەو بەرهەمانەی کە لەپێشدا لەخزمەت و بەرژەوەندی سەرکردە دواتر حیزب، ئینجا گەلانی کوردستان دێن بڵاودەکەنەوە و بایەخی پێدەدەن!!!

لێرەدا نامەوێت ڕەخنە لە ڕاگەیاندنی کوردی بگرم، بەڵام ئەگەر ڕاستت دەوێت هەندێك لەژمارەکانی ڕۆژنامەی "خەبات" و ڕۆژنامەی "کوردستانی نوێ" زۆرتر لەدوو ئەلبومی وێنەی ناشیرن و دوو دەفتەری بیرەوەری خراپی کاك مەسعود بارزانی و مام جەلال تالەبانی دەکەن تا لە دوو ڕۆژنامەی سەردەم!!!

کەناڵەکانی تەلەفزیۆنیش زۆرتر لە کەناڵی "گۆرانی و هەڵپەڕکێ" دەکەن، تا لە کەناڵی گەلێك، کەبەرەو دروستکردنی دەوڵەت دەڕوا!!!

بۆیە ڕاگەیاندنی کوردی پێویستی بەریفۆرم هەیە و ئەو ریفۆرمەش هەرچەند زووتر دەستی پێبکرێ، هێشتا درەنگە.

وەك گوتمان راگەیاندنەكانی كوردی حیزبییە، بەلاّم لە زۆربەی كاتەكان، ئەوكەسانەی كار لەدەزگاكانی راگەیاندن دەكەن، بێ فەرمانی حیزب، سێنسور "رەقابە" یان لەناو ناخی خۆیان چاندووە و هەرخۆشیان بێ ئەوەی هیچ فەرمانێكیان لە مەكتەبی سیاسییەوە پێ بگا، وشەیان بەند كردووە.

لەزۆربەی كاتدا، رۆژنامەنووسان خۆیان بڕیار دەدەن كەچۆن و چەند بنووسن. بۆیە ئەگەر كەم و كورتیەك یان رەخنەیەك هەبێت، چاكترە ئاراستەی دەستەی نووسەران بكرێت تا سەركردەكان.

رۆژنامەنووسانی كورد زۆر لەوە ئازادییان زیاتر لەلایەن سەركردە و حیزبەكانەوە پێدراوە لەوەی ئەوان لەكاتی كاركردن بەكاری دەهێنن. ئەو كەم بەكارهێنانەش لەو دەستەلاّتە زۆرەی كە هەیانە راگەیاندنەكانی ئیفلیج كردووە. باس لەوە هەرناكەین كە ئەو كەسانەی راگەیاندنەكان بەڕێوە دەبەن، زیاتر خۆیان فێركردووە، نەك كۆلێژ و پەیمانگاكان. خۆشەویستی ئەوان بۆ پیشەی رۆژنامەنووسی و پیرۆزی وشەی كوردی، هەندێك لەوانی كردۆتە پسپۆری بەتوانا لەم بوارەدا.

ئەوانەی لە كۆلێژ و پەیمانگاكان لە بواری رۆژنامەنووسی وانە دەڵێنەوە لە راگەیاندن پسپۆر نین. ئەوان ئەزموونی خۆیان و خۆشەویستی بۆ پیشەی رۆژنامەنووسی هانی داون، زانیارییان لەسەر رۆژنامەوانی زۆرتر پەیدا بكەن و ئەو كادیرە باشانەیان لێدەربچێت كە ئەمڕۆ هەن.

لە زانكۆی سلێمانی و بەشی راگەیاندنی ئەوێ، تەنیا دكتۆر موەفەق دەرگەڵەیی هەیە كە پسپۆربێت لە بواری رۆژنامەوانی. خوێندكارەكانی ئەو بەلای كەم پاش دەرچوون دە ساڵیان دەوێت، تا دەخزێنە ناو دەزگاكانی راگەیاندن و ئەزموون لە پیشەی خۆیان پەیدا دەكەن و دەتوانن دەست بەریفۆرم بكەن، ئەگەر لەكاتێكدا مرۆ هیوا بەوان بخوازێت!!!

راگەیاندن لە ناوەرۆكدا، یانی كۆمەڵ گۆڕین، یانی چەسپاندنی دیموكراتی، یانی خزمەتكردنی جەماوەر، یانی نووسین و لێكۆڵینەوە و باسكردن لەسەر هەموو بەشەكانی ژیان. یانی بەرزكردنەوەی ئەو پرسیارانەی كە خزمەت بەجەماوەر دەكەن. یانی گەیاندنی ئێش و ئازاری گەل بە سیاسیەكان. یانی ئاگاداركردنەوەی جەماوەر لە كاری خراپی سیاسیەكان.

ئێمە جارێ ئەو كادیر و پسپۆرانەمان لەم بوارەدا لە كوردستان نییە بۆ ئەوەی بەو ئەركانەی سەرەوە هەڵبستێ.



لەولاّتی سوید ١٥٠ دكتۆر و پرۆفیسۆر لە بواری رۆژنامەوانی لە زانكۆكان و دەزگاكانی دەوڵەت لەسەر بەرنامەكانی رادیۆ و تەلەفزیۆن، ناوەرۆكی گۆڤار و رۆژنامەكان خەریكی لێكۆڵینەوەن.[١]

ئێمە لەكوردستان یەك كەسی پسپۆرمان خەریكی ئەو جۆرە لێكۆڵینەوەیە نییە. هەرچی دەنووسرێ جارێكی تر ناخوێندرێتەوە و باسی لێوە ناكرێ، هەرچی دەبیسرێ، جارێكی تر نابیسرێتەوە و باسی لێوە ناكرێ، هەرچی دەبینرێ جارێكی تر نابینرێتەوە و باسی لێوە ناكرێ. بۆیە نازانین هەڵە و كەم و كورتیەكان لەكوێن؟ هەڵە و كەم و كورتیەكان وەك خۆیان دووبارە و هەزاران بارە دەكرێنەوە. هەرئەوەشە هەموو راگەیاندنەكانی كوردی تەواو ئیفلیج و سەقەت كردووە. خوێنەری رۆژنامە و گۆڤارەكان رۆژ لەدوای رۆژ كەم دەبنەوە و بینەرانی تەلەفزیۆنیش زۆرتر سەیری كەناڵە بیانییەكان دەكەن، بەراورد لەگەڵ كەناڵەكانی خۆماندا !!!

لە هەولێر پەیمانگای راگەیاندن هەیە و بەتەمان لە ساڵی خوێندنی ٢٠٠٥ لە كۆلێژی ئاداب بەشی راگەیاندن بكەنەوە. ئەگەر ئەو بەشەی كە زۆر پێویستە، ئەوساڵ بكرێتەوە، لەگەڵ پەیمانگای راگەیاندنی سلێمانی و بەشی راگەیاندنی دكتۆر موەفەق دەرگەڵەیی و پەیمانگای راگەیاندنی هەولێر، بەهەرچوار لا لەگەڵ بەرنامە و پشتیوانی تەواوی حكومەتی هەرێم لەسەر راگەیاندن، وەك نووسیم لە داهاتووەكی نزیك دەتوانرێ راگەیاندنی كوردی چاك بكرێ.

كتێبی ژانرەكانی رۆژنامەوانی كاری یەك كەسە و بۆیە دوور نییە كەم و كورتی تێدا بێت. من جگە لە خوێندنی رۆژنامەوانی لە زانكۆی سانكت- پێتربورگ، ماستەر و دكتۆرا لە فاكولتێتی رۆژنامەوانی، هەمان زانكۆ، ئەزموونی ژیانیش فێری زۆری كردووم. دە ساڵ لە چاپخانە كارم كردووە حەوت ساڵ لەو دە ساڵە، لە چاپخانەی كوردستان و لەوێش دە مانگ لەگەڵ مامۆستا گیوی موكریانی، دوو پێشانگای فۆتۆگرافی، لە روسیا و لە سوید و لە هەولێر، دوو ساڵ لەگەڵ كاك شۆڕش خالید سەعید و دەركردنی رۆژنامەی "كوردستانی نوێ" بەزمانی روسی. گرتنی كورتە فیلمێكی دیكومێنتی، نووسینی دەیان گوتار بەزمانی كوردی، روسی، سویدی. ئەمانەی سەرەوە لەگەڵ مامۆستای چاك و برادەری دڵسۆز و بەتوانا، منیان گەیاندۆتە ئەمڕۆ كە بتوانم و بوێرم لەسەر تیۆری رۆژنامەنووسی كتێب بنووسم.

1. Stig Hadenius, Lennart Weibull, Massmedier. Falun,2003.p.465.

بۆ نووسینی ئەم کتێبەم، سوودم لەزۆر سەرچاوە بە زمانەکانی سویدی و روسی وەرگرتــووە. وێنەکانی  نێو ئەم کتێبەش لەو سێ سەرچاوە وەرگیراون:

1- Donald Jackson. Skrivkonstens Historia.

2- Hans Sallander. Medeltidens boktryckerihistoria.

3- Jokum Smith. Bokframställning.

سوپاسی دۆست و برادەران دەکەم کەلەگەڵ باسکردنی نووسینی ئەم کتێبە زۆرتر هانیان دام کە زووتر تەواوی بکەم.

**دکتۆر سەپان**

**هەولێر ٢٠-٣-٢٠٠٥**

## پێشەکی بۆ چاپی دووەم

چاپی یەکەمی کتێبی بەردەستت "ژانرەکانی ڕۆژنامەوانی و مێژووی چاپخانە ١٤٥٠ - ١٥٠٠" لەلایەن کۆڕی زانیاری کوردستان لە ساڵی ٢٠٠٥ لە چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە بەتیراژی ١٠٠٠ دانە چاپکرا. بە ماوەیەکی کەم، کتێب لەبازار نەما و کڕیاریشی ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لەزیادبووندا بوو. هۆی کڕینی ئەو کتێبەش، جگە لەوەی بەڕای من یەك لە کتێبە باشەکانە لەسەر تیۆری ڕۆژنامەنووسی، کەنووسەرێکی کورد نووسیبی، وەك وانەی "ژانرەکانی ڕۆژنامەوانی" لە بەشی ڕاگەیاندنی کۆلێژی ئاداب، زانکۆی سەلاحەدین بۆ ماوەی دوو ساڵە دەخوێندرێ و هەمان کتێب بۆ ماوەی یەك ساڵیش لە بەشی ڕاگەیاندنی پەیمانگای تەکنیکی هەولێر دەخوێندرا.

لە نێوان چاپی یەکەم و چاپی دووەمی ئەم کتێبە، گۆڕانکاری زۆر بەسەر ڕاگەیاندنی کوردی هاتوون. ژمارەی ڕۆژنامە وگۆڤار لەزیادبووندان، ژمارەی کەناڵی تەلەفزیۆن و ئێزگەی ڕادیۆش بەهەمان شێوە. بینەر، بیسەر، خوێنەری ئێستای کورد، وەك چەند ساڵ بەر لەئێستا نییە و لەبەر هەمەڕەنگی و توانینی هەڵبژاردن لە نێوان دەزگا و بڵاوکراوەکان، مەرجیان لەسەر میدیا زۆر زیاتر بووە، بۆیە ئەگەر ڕۆژنامەیەك، بەناوەڕۆك باش نەبێت، نایکڕێ و ئەگەر بەرنامەیەکی تەلەفزیۆن باش و سەرنجڕاکێش نەبێ، سەیری ناکات و زوو دەیگۆڕی. دانانی مەرج لەلایەن جەماوەر لەسەر میدیا و ناوەڕۆکی ڕۆژنامە و گۆڤار لەگەڵ بەرنامەکانی تەلەفزیۆن و ڕادیۆ، نیشانەی پێشکەوتن و تێگەیشتنی کۆمەڵە و باشتر تێگەیشتنی ئەوان لە میدیایە.

ئەو ئازادییەی ئێستا لەکوردستان هەیە، دیارە ڕاستەوخۆ کاریکردۆتە سەر باشتر کردنی ڕاگەیاندنی کوردی. پیشەی ڕۆژنامەنووسی، ئەگەرچی لە کوردستان تا ئێستا وەك پێویست



ڕێزی لێناگیرێ و لەلایەن بەرپرس و دەسەڵاتدارانەوە هاوکاری کادرانی ڕاگەیاندن ناکرێ، لەگەڵ ئەوەش بەبەراورد لەگەڵ چەند ساڵێك بەر لە ئێستا زۆر باشترە. ئەو هاوکاری نەکردنە و پشت تێکردنە، لەوانەیە زیاتر لە ڕوانگەی حیزبی و لێکدانەوەی حیزبییەوە سەروچاوەی گرتبێ. زۆر جار، کەسی بەرپرس لەگەڵ ڕۆژنامەنووس هەردووکیان لە یەك حیزب ئەندامن. دەبینی، کەسی بەرپرس لەحیزب خۆی ئەندامی مەکتەبی سیاسی و ڕۆژنامەنووسیش کادرێکی هەرە خواری حیزب، بێشك جۆرێك لە ترس یان شەرم یان دیوارێکی ئەستور لەنێوانیان دروست دەبێ. هەر ئەو بیرکردنەوە حیزبییەش زۆرجار وادەکات، ڕۆژنامەنووس مافی تەواوی خۆی پێنەدرێ، بەتایبەتیش لە کاتێکدا لە کوردستان، ڕاگەیاندن بەگشتی حیزبییە.

ئەگەر وردتر باس لە ڕاگەیاندنی ئێستای کوردی بکەین دەبینین:

تەلەفزیۆنەکان ڕاستە بەرنامەکانیان باشتر بووین، شاشە تەنیا بە هەڵپەڕکێ و کلیپی خراپ وەك پێشتر پڕناکرێنەوە، بەڵام دیسان ناپسپۆرییەك لە جێبەجێکردنی کارەکان بەسەر بەرهەمەکان زاڵە و کەموکورتییەکان بە ئاشکرا دەبینەدرێن. زۆر جار ئەو پرسیارانەی بەرز دەکرێنەوە، ڕاستە زۆر پێویستن و لەشوێنی خۆیەتی، بەڵام دیسان پەلەکردنێکی زۆری پێوە دیارە، لە هەمووش خراپتر، خۆ ئامادەنەکردنی ڕۆژنامەنووس بۆ بەرنامەکەیەتی. ڕوویداوە، کەسی ڕۆژنامەنووس شەش کەسی بۆ بەرنامەی خۆی بانگ کردووە و لەسەر لاپەڕەی بەردەمی شەش ڕەستە یان پرسیار نەنووسراوە... لەم شێوە بەڕێوەبردنەی زۆر لە بەرنامەکان، جگە لە کەناڵەکانی تەلەفزیۆنی کوردی لە هیچ شوێنێکی دیکەی جیهان بەرچاو ناکەوێ... ئەوەش هەمووی تەواو ناپسپۆری لەو کار و پیشە نوێیە پیشان دەدات. ناپسپۆرییەکە ئەوەندە زەقە، زۆرجار لە هەندێك بەرنامە، ڕۆژنامەنووس خۆی ڕۆڵی حاکم یان پۆلیس دەبینێ، لەکاتێکدا ئەوە هیچ پەیوەندی بە پیشەی ئەوەوە نییە. ڕۆژنامەنووس لە تەلەفزیۆن هەوڵدەدات، نیشانیبدات، کە ئەویش مرۆڤێکی بەتوانایە و زانیاری باشی لەو بوار یان پرسیارە لایە، لەکاتێکدا ڕۆژنامەنووسی پسپۆر هیچ پێویست ناکات، لەگەڵ قارەمانی بەرنامەی خۆی، بکەوێتە پێشبڕکێی عەقل و هۆش و هزر تا بزاندرێ، کێ لە کێ ژیر یان بەتواناترە... هەر لەبەر ئەو هۆیانەش، لەکاتی جێبەجێکردنی کاری ڕۆژنامەنووسی، ئەخلاقی کار تەواو پشتگوێ دەخرێ و بەهیچ شێوەیەك بیری لێناکرێتەوە. لە زۆر بەرنامە بە ئاشکرا و بە ناهەق، میوانان هێرشیان لەلایەن بێژەران دەکرێتە سەر و ئەوانیش ڕێگایان پێنادرێ بەرگری لەخۆیان بکەن... لێرە باس لەهەندێك بەرنامە هەرناکەین، کە میوان هاتۆتە ستۆدیۆ و درۆیەك بۆ ئەو میوانە

یان وەزیرە هەڵبەستراوە و لەلایەن بینەرێکی خۆیانەوە بە پلان و لە ڕێگای تەلەفۆن، کە پێشتر ئاگادارکراوەتەوە و پێیگوتراوە ئەو درۆیە بکات و ئەویش فەرمانی ئەوانی لە بەرنامەی زندی بەیەك پەیوەندی تەلەفۆنی بەجێهێناوە و گوایە هاوڵاتییێکی ئاساییە. لە هەمان کات ڕێگا بە وەزیر نەدراوە بەرگری لە خۆی بکات و درۆکە سپی بکاتەوە. (ئەو ڕووداوە لەگەڵ د. زریان عوسمان ڕوویدا). لەم شێوە تەلەدانانەوە بۆ قارەمانی بەرنامە، لە هیچ شوێنێك ڕێگای پێنادرێ و ئەخلاقی هیچ پیشەیەکیش ڕێگای پێنادات، چونکە شکاندنی هەموو داب ونەریت و یاسایەکی مرۆییە. لەو جۆرە بەرنامانە لە هەندێك لە تەلەفزیۆنەکانی کوردستان تا ئێستاش هەن، ئەگەرچی لەوانەیە ژمارەیان لەگەڵ پێشتر زۆر کەمتر بووبێت.

وەك لەسەرەوە نووسیمان، بەرنامەکانی زۆربەی تەلەفزیۆنەکانی کوردی زۆر باشتر بووین، بەڵام هێشتا نە گەیشتونەتە ئاستی پێویست. ئەم نەگەیشتنە لە هەندێ شوێن لەوانەیە خەتای حیزب بێت، کە بودجەی پێویست بۆ کەناڵەکان دابین ناکا، لە هەندێ شوێنی دیکەش، خەتای بەڕێوەبەرانی تەلەفزیۆن بێ، کەلەبەر کاری زۆر و سەرقاڵی خۆیان و کارکردن لەگەڵ یەك لەشکر لە کادرانی کەمشارەزا، ئەوانی بێئومێد کردبێ و پێشکەوتنەکانی تەلەفزیۆنیان تەسلیمی قەدەر کردبێ.

لەڕاستیدا، هەندێك گۆڕانکاری بۆ باشتر کردنی هەندێك بەرنامەی تەلەفزیۆن یان رادیۆ، نە پەیوەندی بە بودجە نە پەیوەندی بە دەستێوەردانی حیزب هەیە، بەڵکو بە کردنەوەی چەند کۆرسێك بۆ تەواوی کارمەندان چارەسەر دەکرێ، کەچی ئەوان ئەو هەنگاوە نانێن. نەکردنەوەی ئەو خولانە، زۆر جار پەیوەندی بە ویستی بەڕێوەبەر نییە، بەڵکو ڕویداوە، کۆرس کراوەتەوە، ڕۆژنامەنووس یان کارمەندی تەلەفزیۆن بەشداری تێدا نەکردووە. جگە لەو هۆیانەی سەرەوە، زۆربەی هەرە زۆری کارمەندانی تەلەفزیۆن، یان لە شوێنێکی دیکەش کار دەکەن، یانیش لەسەر خوێندن بەردەوامن. ئەگەر کار نەکەن و نەشخوێنن، کەم لەوان بە ئیشقەوە یان هەستکردن بەبەرپرسێتی کاری خۆیان بەڕێك و پێکی ئەنجام دەدەن. لەوەش خراپتر ئاستی وشیاری زۆربەی هەرە زۆری کارمەندان زۆر نزمە، چونکە لە خۆپەروەردەکردن وەستاون و بەدەگمەن کتێب یان گۆڤار یان ڕۆژنامە دەخوێننەوە. ئەوان وەك ڕۆژنامەنووس کار دەکەن، لەو بڕوایەدان، زیاتر پێویستیان بەڕۆشنبیرکردنی خۆیان نییە، ئەمەش تەواوی کارەکەی بەرەو ناپسپۆری بردووە و وایکردووە نەتوانن لەشوێنی خۆی وەڵامی باشیان بۆ پرسیارەکانی خۆیان هەبێ.



وەك لەسەرەوە نووسیمان بەرنامەی کەنالانی تەلەفزیۆنی کوردی ئەمڕۆ زۆر باشترن لە بەرنامەکانی تەلەفزیۆن بەر لە ساڵێك، بەڵام تا ئێستاش زۆری ماوە، بگەینە ئاستی بەرنامەی کەنالەکانی وڵاتانی دراوسێ. ڕاگەیاندنی کوردی بەگشتی و تەلەفزیۆن بەتایبەتی، لە ئاستی گۆڕانکارییەکانی گەورە و سیاسییەکان نییە و نەیانتوانیوە پرسی کورد وەك خۆی "مەزن" باس بکا یان لە ناوەڕۆکی بەرنامەکانیان ڕەنگ بداتەوە. تا ئێستا بینەرانی کورد کۆنترۆلیان لەدەستە و بەردەوام خەریکی گۆڕینی کەنالەکانن. تا ئێستا لە هیچ گۆڤارێك ناوەڕۆکی بەرنامەکانی تەلەفزیۆن نەنووسراوە و لە ڕۆژنامەکانیش بەوردی باس لەبەرنامەکانی ڕۆژ ناکات، جگە لەوانەش بەرزکردنەوەی پرسیار لە کەنالەکان، لە ڕۆژنامە و گۆڤار بەدواداچوونی بۆ ناکرێ و بەهەمان شێوەش بابەتی ڕۆژنامەکان بەدەگمەن دەبنە بابەتی بەرنامەدروستکردنی TV ئەوەش هەمووی دەکاتە ناپسپۆری لە ڕاگەیاندنی کوردی. نا پسپۆریش لەبەر ئەوەیە، هێشتا بەشەکانی ڕاگەیاندن لە زانکۆ و پەیمانگاکان نەیانتوانیوە کادری پێویست بۆ دەزگاکای ڕاگەیاندن پەروەردە بکەن و دەزگاکانیش هیچ هاوکاری ئەو بەشانە وەك پێویست ناکەن. زۆربەی بەشەکانی ڕاگەیاندن، لەجیاتی یارمەتی زۆریان بدرێ و هۆڵ و ستۆدیۆ و ئێزگە بۆ خوێندکارانیان دابین بکەن، لەبەر بێهۆڵی و بێشوێنی دەناڵێنن، بۆیەش ئەو بەشانە، ناتوانن بە ئەرکی مێژوویی خۆیان هەڵبستن. هەر بۆیەش، تا ئێستا لەیەك نزیکبوونەوە لەنێوان بەشەکانی ڕاگەیاندن و دەزگاکانی ڕاگەیاندن نییە و هەرکەسە بۆخۆی کار دەکات، ئەو کارکردنەش دیارە ناپسپۆری و گیانی هاوکاری نەکردن لەناومان پیشان دەدات. وەك ئەکادێمیك شاکرۆی محۆیان گوتەنی، ئێمەی کورد کولتوری هاوکاریکردنی یەکترمان نییە. جارێ فێر نەبووین...

### ڕۆژنامە و گۆڤارەکان:

لە کوردستان، جگە لە ڕۆژنامەکانی "کوردستانی نوێ و خەبات" چەند ڕۆژنامەیەکی دیکەی ڕۆژانەش هەن. هەموویان بەیەکەوە، هەوڵدەدەن، خوێنەر بۆخۆیان زیاد بکەن. لەو چەند ساڵەی ڕابردوو ڕۆژنامەکان بە: نەخشەسازی، ناوەڕۆك باشتر و دەوڵەمەندترن، بەڵام جارێ زۆری ماوە، تا بگاتە ئاستی پێویست. نەگەیشتنی بۆ ئاستی پێویست، زیاتر لەبەر نەبوون یان بەشنەکردنی کادری بەتوانایە لە ڕاگەیاندن. بازاڕی ساغکردنەوەی ڕۆژنامە لە کوردستان بەلای کەم، دە ڕۆژنامەی ڕۆژانە هەڵدەگرێ، چونکە کوردستان لە پاش ڕاپەڕینی ١٩٩١ وە مەڵبەندی ڕوودا و گۆڕانکارییەکانە نەك تەنیا لە ناوچە، بەڵکو لە گشت جیهان، بۆیە هەڵدەگرێ ئەم هەموو ڕۆژنامانەی ڕۆژانەی هەبێ، کەچی لەبەر کەمی کادری پسپۆر، ناتواندرێ

ئەم بۆشاییە بەو ڕۆژنامانەی ئێستا هەن، بەباشی پڕبکرێتەوە. لەو بەشەش "ڕۆژنامە و گۆڤار" سەرنووسەران، بەدەست بێ کادری بەتوانا دەناڵێنن، بەڵام زۆریش کار ناکەن و خۆیان هیلاك ناکەن، بۆ ئەوەی ڕۆژنامەکەیان کەمێك باشتر بێت. لەڕاستیدا باشترکردنی ڕۆژنامەکان، لەوانەیە ئەوەندە گران نەبێ و زۆر لە باشتر کردنی بەرنامەی تەلەفزیۆن ئاسانتر بێ، بەڵام ڕیفۆرم لە ڕۆژنامە خۆی لەخۆیدا لە تەواوی جیهان کارێکی زۆر گرانە. بۆ باشتر تێگەیشتن و ئاسانی ڕیفۆرم لە ڕۆژنامە یان گۆڤار بەپێویستم زانی نموونەی یەك ڕۆژنامەی سوێدی بهێنمەوە، کە چۆن ئەوان ڕۆژنامەکەیان بەو ڕۆژە گەیاندووە، کە خوێنەری یەك ملیۆن و نیوە لە ڕۆژێکدا یان چۆن خۆی لەم هەموو قەیرانە ئابوورییانە ڕزگار کردووە. لە ڕۆژنامەی DNی سوێدی نزیکەی ٥٠٠ کەس کار دەکات، لەو ژمارەیەش نزیکەی ١٠٠ کەس کاریان تەنیا پێداچوونەوەی تەواوی تێکستەکانە. لەم ڕۆژنامەیە، هەموو نووسینێك بەلای کەم لەلایەن ٣ کەس دەخوێندرێتەوە. لەم خوێندنەوانە، ئیملا، هەڵەبژێری، دانانی سەردێر و کۆنترۆلکردنی فاکتەکان لەگەڵ داڕشتنەوەی سەرلەنوێی نووسینەکانی بۆ دەکرێ، بۆیە تەواوی ڕۆژنامەکە، کە نزیکەی ٧٠ لاپەڕەیە، هەرگێڕ و وەرگێڕ بکە، یەك هەڵەت بەرچاو ناکەوێ.

لە کوردستان، دەتوانین سوود لە هەمان ئەزموونی ئەوان وەربگرین. لەجیاتی سەد کەس، دەتوانین ٢٠ کەسی پسپۆر لە بواری ڕاگەیاندن لەگەڵ کوردیزان دابمەزرێنین، بۆ ئەوەی هەموو نووسینێك بەلای کەم لەلایەن دوو کەس بخوێندرێتەوە. بەمجۆرە، لە تەواوی ڕۆژنامەکە وشەیەك نادۆزیتەوە، کە بەلای خوێنەر نامۆ بێت و تێی نەگات. پێش ئەوەی ئەوگروپەش دەستبەکار بێت، دەبێ کۆرسیان بۆ بکرێتەوە، تا بزانن چۆن مامەڵە لەگەڵ نووسینەکان بکەن. ئەوان بەشێوەیەکی زانستی فێردەکرێن: چۆن سەردێر بنووسن، چۆن نووسین کورت بکەنەوە، چۆن بایەخ بە خاڵبەندی و نووسینی زمانی ئاسانی کوردی بدەن لەگەڵ هونەری داڕشتنەوەی نووسین فێر دەکرێن، بێئەوەی کار لەناوەڕۆکی نووسینەکە بکات. ئەو ڕەچێتەی لەسەرەوە نووسیمان، بۆ بەپسپۆر کردنی ڕاگەیاندنی کوردی، لەم قۆناغەی ئێستا باشترین و هەرزانترین وکورترین ڕێگایە.

زۆر لەو بابەت یان پرسیارانەی لە ڕۆژنامەکان بەرز دەکرێنەوە، زۆر پێویستن و لەشوێنی خۆیەتی، بەلام لەبەر ئەوەی کەسی نووسەر، باش خۆی بۆ ئامادە نەکردووە، پەیامی ئەو زۆر بەباشی ناڕوات یان ناگات. ڕۆژنامەنووسانی کورد تا ئێستاش زۆربەیان، بەدەگمەن بۆ نووسینی ڕاپۆرتێك، بۆ دەوڵەمەندکردنی ناوەڕۆك، یان بۆ ئەوەی نووسینەکەیان بەهێزتر و پوختر بێت،



پەنا وەبەر ئینتەرنێت، سەرچاوەی جیا، تەلەفۆن یان فاکس دەبات. ئەوەی ئەو لەمێشکی هەیە، وەك خۆی دایدەڕێژێ و لەزۆربەی کاتەکانیش وەك ئەزموونی ڕاگەیاندن نیشانی داوە پشت بەستن تەنیا بەو زانیاریەی لە مێشکی خۆی هەیە بەش ناکات. ڕۆژنامەنووسانی کوردی، لێڕانەهاتوون، یەك هەفتە یان زیاتر کار لەسەر یەك گوتار بکەن و بۆ نووسینی پەنا وەبەر ئەرشیڤ بەرن. ئەگەر ئەوان لەو جۆرە نووسینەیان کەم بێت، لەوانەیە خەتاکەی زیاتر بۆ دەستەی نووسەران بگەڕێتەوە، کە کادریان بۆ نووسینی لەمجۆرە ڕاپۆرتانە باش پەروەردە نەکردووە. ئێمە لە بازنەیەك دەسوڕێینەوە و هەریەکەو خەتای بە باشترین شێوە لەسەر خۆی لا دەبات و دەیخاتەئەستۆی هاوپیشە، حیزب، پەرلەمان، حکومەت یان یەکێکی دیکە. تا ئێمەش خەتای خۆمان لەسەر خۆمان لابەرین و بیخەینە ئەستۆی یەکێکی دیکە، دیارە بەهیچ شێوەیەك ناتواندرێ باس لە ڕاگەیاندنێکی پسپۆری لە کوردستان بکرێ.

زمانی نووسینی زۆربەی ڕۆژنامەکانمان تا ئێستا باش نییە و زیاتر زمان و نووسینی ئەدەب بەسەرییەوە زاڵە. تا ئێستا لەژێر زۆربەی وێنەکان، کۆمێنتار نییە، سەردێرەکان لە شێوەی پرسیارە و لید بۆ نووسینەکان نانووسرێ و داناندرێ. ئەگەر لە هەندێك ڕۆژنامە لید دابنێن یان بنووسن، دیسان بەو شێوەیە دەزانین لید نانووسرێ، چونکە لید نابێ کۆپلەیەك بێت و دووجار لە چەند دێرێك دووبارە ببێتەوە. ئەو کەموکورتیانەی سەرەوە لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکان هەن، ئەگەرچیش وەك لە پێشتر نووسیمان، ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی ئێستا، زۆر لەوانەی ساڵی پار باشترن.

### ئێزگەکانی رادیۆ:

لە کوردستان ئێزگەی زۆر هەن، بەڵام زۆربەی هەرە زۆریان، دیسان حیزبین. مەبەستمان لەحیزبی بوون، زیاتر دابینکردنی لایەنە ئابوورییەکەیە، ئەگەر حیزب یان ڕێکخراوێك بە پارە یارمەتییان نەدا، ئەو ئێزگانە ناتوانن خۆیان بژیێنن، چونکە جارێ لە کوردستان، ڕێکلام ڕۆلی خۆی ناگێڕێ وخەڵك باش لە گرنگی تێنەگەیشتوون. حیزبی بوونی ئێزگەکان، زیاتر لە دەنگوباس یان لەچەند بەرنامەیەك بەدیار دەکەوێت، لەکۆی بەرنامەکانی دیکەش، گوێگر هەست ناکات، ئەو ئێزگەیەی گوێی لێڕادەرگرێ سەربە چ پارت یان گروپێکی سیاسییە، چونکە زۆربەی کات بەرنامەکانیان بە گۆرانی پڕدەکەنەوە. بەڕێوەبەرانی ئێزگەکانی ڕادیۆش، وەك دەزگاکانی دیکەی ڕاگەیاندن لەبەر کەمی کادری باش دەناڵێنن، بەڵام کارکردن یان دۆزینەوەی کادر بە بەراورد لەگەڵ بەشەکانی دیکەی میدیا، بۆ رادیۆ زۆر ئاسان ترە، لێرە کەسی بێژەر بە

ئارەزووی خۆی دەتوانی ئەوەی دەیڵێ بەخوێندنەوە بیڵێ. هەر لەبەر ئەم هۆیەشە، زۆر لەو ڕۆژنامەنووسە گەنجانە، ئارەزوویان زیاتر لە کارکردن لە ڕادیۆیە تا لە کەناڵەکانی دیکە ڕاگەیاندن، بەتایبەتیش، کە زۆربەی بەرنامەکان زیندین و بە تەلەفۆنی بیسەران دەوڵەمەند یان بەڕێوە دەبردرێ.

لەو بەشەی ڕاگەیاندیش زۆر بەرنامەی جددی و باش هەن، وەك کۆمەڵایەتی، سیاسی، تەندروستی ... کە بەرنامەی زۆر باش و پێویستن، بەڵام لەبەر ئەوەی زۆر لەوکادرانە، لە تەواوکردنی کارەکانیان پەلەیانە، ناتوانن پەیامیان وەك پێویست بە بیسەرانیان بگەینن.

ڕاگەیاندنی کوردی بەگشتی تا ئێستا لە ئاستی پێویست نییە، بەڵام باشتربوونی پێوە دیارە. هەوڵێك هەیە ڕاگەیاندنی کوردی بەرەو پسپۆری ببات، بەڵام ئەو هەوڵە جاری زۆر لاوازە. زۆر لاوازە، چونکە بەبێ بوونی یاسایەکی پوختی ڕاگەیاندن، کە تەوای لایەنەکان: نووسراو، بیسترا و بیندراو و ئەلیکترۆنی ناتواندرێ هەنگاوی باش بۆ پسپۆرکردنی بندرێ. دەبێ لەچارچێوەی یاسا، یان یاسا، ناچارمان بکات، بەجۆرێکی دیکە ڕاگەیاندن بەڕێوە بەرین، دەنا هەوڵ و هەنگاوەکانمان زۆر سەرکەوتو نابن.

ئەگەر بە خۆمان نەتوانین ناوەڕۆکی بەرنامەکانی تەلەفزیۆن یان رادیۆ، ڕۆژنامە یان گۆڤار و سایتی ئینتەرنێت چا بکەین و لەخزمەت جەماوەر بەکار بهێنین، زۆر ئاساییە لەوقۆناغەی ئێستا بۆ باشتر کردنی ڕاگەیاندنمان پەنا بەر یاسا بەرین.

ڕۆژنامەنووسانی کورد ناتوانن بە نووسین و بڵاوکردنەوەی یەك گوتار، هیچ وەزیرێك لابدەن، یان حکومەت بگۆڕن، بەڵام ئەوەی تا ئێستا سەرکەوتووانە توانیویانە، دروستکردنی سەرئێشەی زۆرە بۆ حکومەت و دەستەڵاتداران. زۆر بەداخەوە، زۆربەی ئەو نووسینانەی لەوجۆرە سەرئێشانەشی دروست کردووە، ئەگەر لێی بپێچیتەوە ئاشکرا دەبێ، لەلایەن کەسێکەوە بۆ شکاندنی یەکێکی دیکە نووسراوە. بۆیە ئەگەر لە وڵاتانی دەرەوە ڕاگەیاندن یەکجار ئارەزوومەندانەبێ و یەك دەست، کار لە ناوەڕۆك و بەرزکردنەوەی پرسیارەکان بکات، لە کوردستان زۆر جیایە و چەند دەستێك و چەند حیزبێك ڕاگەیاندن بەڕێوە دەبەن، بەلای ئەوانیش پاراستنی بەرژەوەندی حیزب لەسەرووی هەموو شتێکە.

چاپکردنەوەی ئەم کتێبە لەلایەن دەزگای موکریان، جێگای ڕێزی زۆرە، جگە لەوەی زۆریش پێویستە، چونکە بە خوێندنەوە و تێگەیشتن لە ناوەڕۆکی ئەم کتێبە، بەو هیوایەین هەنگاوێك ڕاگەیاندنمان باشتر بکات، بەتایبەتیش بۆ ئەوانەی خەبات بۆ ڕاگەیاندنێکی چاکتری کوردی دەکەن.



لە چاپی دووەمی ئەم کتێبە، نووسینی پێشەکی و لابردنی چەند کۆپلەیەك لە چاپی یەکەمی هیچ دەستکاری دیکەی ناوەڕۆکی نەکراوە. بۆ ئەم چاپەش نەخش و وێنەکانی ناوەوەی لەو سێ سەرچاوەی خوارەوە بەزمانی سوێدی وەرگیراون:

1- Donald Jackson. Skrivkonstens Historia
2- Hans Sallander. Medeltidens boktryckerihistoria
3- Jokum Smith. Bokframställning

**د. مەغدید سەپان**
**هەولێر ٢٠ – ٥ – ٢٠٠٨**

## هەواڵ

هەواڵ لە ژانرە کۆنەکانی ڕۆژنامەنووسییە و شێوەی گەیاندنی ڕووداوێك بەئەستۆ دەگرێ کە لە ناوەوەی وڵات یان دەرەوەی ئەمڕۆ یا دوێنێ ڕووی دابێ.

گرنگترین مەبەست لە هەواڵ، گەیاندنی ڕووداوێکی فاکتە (شتێك کە لەڕاستیدا ڕوویدابێ یان بەم نزیکانە ڕووبدا) کە بەزمانێکی ئەدەبی پوخت و ئاسان، ڕۆژنامەنووس بۆ خوێنەران لە ڕۆژنامە یان گۆڤار دەینووسێ و بڵاوی دەکاتەوە. بۆ ڕۆژنامەی بەیانیان، هەواڵ ڕووداوێکە کە دوێنێ ڕووی دابێ یان ئاشکرا بووبێ، بۆ ئەوەی ئەمڕۆ خوێنەرانی خۆی لە ڕووداوەکە ئاگادار بکاتەوە.

هەواڵ بەگشتی ئامانجی گەیاندنی ڕووداوێکە بۆخوێنەران، بینەران، گوهداران کە بێ ویستی ڕۆژنامەنووس خۆبەخۆ ڕوویداوە.

یەکەمین ڕۆژنامەی ڕوسی بە ناوی ( ڤێدۆمۆست ١٧٠٢) کە لە سانکت – پێتربورگ دەردەچوو، هەواڵ بایەخی زۆری پێدرا.

لە یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی بەناوی ((کوردستان)) کەلەلایەن میقداد مەدحەت بەدرخان لە قاهیرە دەردەچوو بایەخی تایبەتی بەهەواڵ دراوە. لە ژمارەی یەکەمی کە لە ٢٢ نیسانی١٨٩٨ لە قاهیرە بڵاوکرایەوە، باس لە شەڕی بەینی میسر و سودان بۆخوێنەرانی ڕۆژنامەکەی دەکا. دەتوانین بڵێین لە مێژووی ڕۆژنامەگەری کوردی، هەواڵ، لە ژانرە هەرە کۆنەکانە.

ئەگەرچی کورد زیاد لە سەد ساڵ ئەزموونی نووسینی هەواڵی بەزمانی زگماکی هەیە، کەچی تا ئەمڕۆش کەم هەواڵ، بەڕاستی و دروستی (مەبەست لە داڕشتنی هەواڵە) لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکان بڵاودەکرێنەوە. لەکاتی خوێندنەوەی ڕۆژنامەکانی کوردی زۆرجار خوێنەر هەندێك هەواڵی بۆ دەبێتە مەتەڵ و نازانێ قسەکان کەی کراون و ڕووداوەکان لەکوێ ڕوویانداوە؟ یان



کراون! پێویست ناکا نموونە بهێنمەوە، چونکە لە هەموو ژمارەکان بەئاسانی ئەم کەم و کورتیانە بەرچاو دەکەون!

ڕۆژنامەنووس لە گەیاندنی هەواڵ و بڵاوکردنەوەی دەبێ زۆر وردبین بێ، چاکە باش لێی بکۆڵێتەوە و بەدوای ئەم پرسیارانەشدا بگەڕێ" ئایا ئەم ڕووداوە لەڕاستیدا ڕوویداوە؟ ئەگەر بەڵێ، لە کوێ ڕوویداوە؟ کێ یان چەند کەس تێیدا بەشدارن؟ یان ئایا سەرچاوەی گەیاندنی هەواڵەکە شایەنی بڕوا پێکردنە؟ چونکە هەندێك هەواڵ کە بەرۆژنامە دەگەن، لەوانەیە لە ڕاستی دووربن. بۆیە خراپ نییە ئەگەر ڕۆژنامەنووس تا بۆی بکرێ، لە ڕاستی ڕووداوەکە بکۆڵێتەوە.

هەواڵ لە ڕۆژنامەکانی کوردی دوو لقی لێ ڕوون و ئاشکران و پەیڕەو دەکرێن:

**یەك: کورتە هەواڵ**

بەگوێرەی تیۆری ڕۆژنامەنووسی، نووسینی کورتە هەواڵ دەبێ وەڵامی سێ پرسیار بداتەوە: چی ڕوویداوە؟ لە کوێ ڕوویداوە؟ کەی ڕوویداوە؟

کورتە هەواڵ لە نووسین لە چەند دێرێك تێپەڕ ناکا و ڕۆژنامەنووس ناتوانێ بیرو بۆچوونی خۆی تێدا باس بکا. بەبڕوای ڕۆژنامەنووسی سویدی سۆران لارسۆن کورتە هەواڵ چاکە لە ٣٠-٤٠ وشە تێپەڕنەکا، بەڵام بە بۆچوونی ئەو باشترە بە ٣٠ وشە کۆتایی پێبهێنرێ[1]. لە کورتە هەواڵ، ڕۆژنامەنووس لەسەری پێویستە ڕووداوەکە بەزمانێکی ئەدەبی پاك بنووسێتەوە.

**دوو: هەواڵی درێژ**

هەواڵی درێژ دەکرێ ١٠-١٥ خەت لە ئەستوونێکدا داگیر بکا. لێرەدا ڕۆژنامەنووس جگە لەوەی ڕاستی ڕووداوەکە دەنووسێ، دەتوانێ هۆی ڕووداوەکەش لەگەڵ ئەنجامی بۆ خوێنەران بنووسێ. ئەم ڕووداوانەش وەك لەسەرەوە گوتمان دەکرێ لەناوەوەی وڵات یان لەدەرەوەی وڵات ڕوویاندابێ.

هەواڵی درێژ بۆ ئەوەی لە کورتە هەواڵ جیابکرێتەوە، دەبێ وەڵامی ئەم پرسیارانەی خوارەوە درابنەوە. چ ڕوویداوە؟ کەی ڕوویداوە؟ کێ تێدا بەشدارە؟ چۆن ڕوویداوە؟ لەکوێ ڕوویداوە؟ لەبەرچی؟ دیارە لەکاتی وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانەی سەرەوە، ڕۆژنامەنووس دەتوانێ بەدرێژی وەڵامەکان بنووسێتەوە، بەڵام لەوکاتەدا، ئەو نووسینە وەك هەواڵی درێژ

1. Sören Larsson, att skriva i tidning. Borås, 1992.- p.13.

ناناسرێتەوە، بەڵکو زۆرتر لە وتاری هەواڵی دەکاتن، کە ئەویش ژانرێکی تایبەتی ڕۆژنامەنووسیە و لێرەدا پێویستی نازانم لەسەری بنووسم.

**چ ڕووداوێك دەکرێ بە هەواڵ**

لەبیری نەکەین، نووسین، ڕۆژنامە دەرکردن، بەرنامەی ڕادیۆ یان تەلەفزیۆن پەخش و پێشکەش کردن، هەموویان لەلایەن مرۆڤەوە ئامادە دەکرێن و هەر بۆ ئەوانیش بلاَودەکرێنەوە و پێشکەش دەکرێن. ئەوەش دەکاتە ئەوەی کە مرۆڤ خۆی سەرچاوەی هەواڵە.

لەگەڵ ئەوانەی سەرەوەشدا، مرۆڤ دابەش دەکرێن بەسەر چەند چین و گرووپێك. لەوانە هەن کار و کرداریان بۆ کۆمەڵ زۆر سەرنج ڕاکێشە و هەشیانە بەپێچەوانەوە. بۆیە سەیر نییە کە مرۆڤ پشتاوپشت فێرکراوە بزانێ سەرۆك و پاشاکان چی دەکەن و پلانیان بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی ژیانی جەماوەر چییە؟ ئەمە ئەگەر لە سەدەکانی ناوەڕاست، هەیتەکانی پاشا، بەزۆر جەماوەریان کۆکردبێتەوە بۆ ڕاگەیاندنی هەواڵەکانیان، ئەوا لەم سەردەمەدا ڕۆژنامەنووس خۆی بەدوای پاشا ڕادەکا و دەنگوباسی کۆشك و تەلاری بەخوێنەرانی خۆی دەگەیێنێ! هەر بۆیەش زۆربەی ئەو هەواڵانەی لاپەڕەی ڕۆژنامەکانیان پێ پڕدەکرێتەوە پێوەندییان بە ڕووداوی سیاسی، ئابووری، فەرهەنگی، کۆمەڵایەتی لەگەڵ وەرزش هەیە. ئەمانەی سەرەوە وەك نەریت لە هەموو ڕۆژنامەکانی جیهانی کە هەردوو ڕۆژنامەکانی کوردی، " کوردستانی نوێ" و "خەبات" دەگرێتەوە سەرچاوەی گەیاندنی هەواڵن.

ئەگەر ڕۆژنامە ڕۆژانە بێ، ئەوا زۆرتر لە ڕووداوەکانی سەرەوە کە باسمان کرد خوێنەران دەتوانن لە ڕۆژی داهاتوو بخوێننەوە. بەلاَم ئەگەر ڕۆژنامەکە هەفتانە یان مانگانە بێ، ئەوا لەناو هەواڵە گرنگەکان کە لە هەفتەی ڕابردوو یان مانگی ڕابردوو ڕوویانداوە، خوێنەران دەتوانن لە ڕۆژنامە یان لە گۆڤارەکان بیانخوێننەوە.

**هەواڵ بۆ ڕۆژنامەی ڕۆژانە**

ئەگەر ڕۆژنامەکە ڕۆژانە بێ و هی سەرتاسەری ولاَت بێ، ئەوا بێگومان شوێنی هەموو هەواڵێکی تێدا جێ نابێتەوە، بۆیە تەنیا ئەوانەی سەرنج ڕاکێشن و بەلای دەستەی نووسەرانەوە گرنگن، چاپ و بلاَودەکرێنەوە. هەواڵەکانی تر پشتگوێ دەخرێن.



ئەگەر ڕۆژنامەکە ڕۆژانە و ناوچەیی بێ، وەك ئاشکرایە بەلای ڕۆژنامەکەوە هەواڵی ناو شار و دەوروپشتی گرنگە، بۆیە ئەوەی خوێنەر لە ڕۆژنامەی ڕۆژانەی دەوڵەتی لە سەر شارەکەی خۆی دەستی نەکەوێ، دەتوانێ لە ڕۆژنامەی شاری خۆی دەستی بکەوێ و بیخوێنێتەوە.

ئەگەر هەواڵێك بۆ ڕۆژنامەیەك گرنگ بێ، مەرج نییە بۆ ڕۆژنامەیەکی تریش هەمان بایەخی پێبدرێ و لە لاپەڕەی یەکەم بلاَوبکرێتەوە. چونکە لە هیچ دەوڵەتێك هیچ یاسایەك نییە کە ڕووداوێك وەك هەواڵ هەڵبسەنگێنێ و لە ڕۆژنامەکان بلاَوبکرێتەوە، یانیش بلاَو نەکرێتەوە. خوێنەر زۆر جار هەواڵێکی بەساڵ لەبیر ناچێ و کەچی هەمان هەواڵ کە لە تەك ئەو هەواڵە بلاَوکراوەتەوە، ئێوارەی هەمان ڕۆژ لەبیری چۆتەوە. بۆنموونە هەواڵێك کە لە ڕۆژی ٢٤-٢-٢٠٠٠ لەڕۆژنامەی داگێنس نیهێتەری سویدی لەسەر پەتاتە بەم شێوەیە بلاَوکرایەوە: ئەوەی تا ئێستا ئاشکرایە یەکەمین پەتاتەی سەدەی نوێی سویدی خرکرایەوە و ڕۆژی چوارشەممە کیلۆی بە ١٣٢٥ کرۆن فرۆشرا. ئەوەش نرخێکی خەیاڵییە بۆ پەتاتە. (نزیکەی ٢٢٠ دۆلاری ئەمریکی). تور مانگنسۆن پەتاتەکانی لەناو قوتی لە خانووی شووشە پێش سەری ساڵ لە باشووری شاری لوند چاندبوو. سەرجەم توانی پێنج کیلۆ کۆبکاتەوە و بەنرخی ناوبراو لێی بفرۆشێت.

١٣٢٥ کرۆن بۆ نرخی یەك کیلۆ پەتاتە یەکجار زۆرە، چونکە لە سوید نرخی یەك کیلۆ پەتاتە ٣-٥ کرۆنە.

دیارە ڕووداوێکی سەیرو سەرنج ڕاکێشە! هەمان ڕۆژنامە لە لاپەڕە شەشی ڕۆژی سێ شەممە ڕێکەوتی ٩-٥-٢٠٠٠ هەواڵێکی تری لەسەر هەمان بابەت بلاَوکردەوە. ئەم جارەیان بەم شێوەیە دەست پێدەکا:

پەتاتەی یەکەمی ئەو ساڵ کە لە زەوی چاندرا دووشەم هەڵکەندرا کیلۆی بە ٥٣٦ کرۆن فرۆشرا. پەیامنێرەکە لەسەر نووسینی هەواڵەکەی بەردەوام دەبێ بەقسەی ئیان ئولسون لە هەفتەی داهاتوو خەڵك دەتوانێ هەمان پەتاتە کیلۆی بە ٢٠ کرۆن لە دوکانەکان بکڕێ. هەرکەسێك یەك جار ئەم هەواڵانەی ڕۆژنامەی ناوبراوی خوێندبێتەوە، باوەڕناکەم بەماوەیەکی کەم لە بیری بچێتەوە!

لەگەڵ ئەوانەی سەرەوەشدا، شێوەی نووسینی هەواڵ بەهەردوو جۆرەکەیەوە، لە هەموو ڕۆژنامەکان بەیەك شێوە و دەستوور دەنووسرێن وەك:

١- دەسپێکردن بەوەی کە زۆر سەرنج ڕاکێشە.

٢- کۆتایی بە نووسینی هەواڵەکە بەوە بهێنە کە بەلاتەوە ئەوەندە سەرنج ڕاکێش نییە.

٣- وەڵامی پرسیارەکان بدەرەوە.

٤- بە کورتی بینووسە.[١]

ئەگەر قووڵتر باس لە ژانری هەواڵ بکەین، دەبینین، لە ژیانی هەموو کەسێك، ڕۆژانە ڕووداوێك یان زیاتر سەرنج ڕاکێش ڕوودەدا.

**بۆ نموونە:** جگەرەکێشێك واز لە جگەرە کێشان دەهێنێ. دیارە واز هێنان لە جگەرە کێشان ئاسان نییە، بۆیە بەماوەیەکی کەم هەموو دۆست و برادەران بەواز لە جگەرە کێشانی ئەم کابرایە دەزانن. ئەمە هەواڵی زارەکییە، کە دەماو دەم بەخەڵك دەگەیەنرێ. بەلام هەمان ڕووداو ئەگەر لە سەرۆك کۆمارێك ڕووبدا، بەدوور نازانرێ هەمان کردار لە هەموو ڕۆژنامەکانی وڵات ڕەنگ بداتەوە و تەواوی دانیشتوان لە قارەمانێتی سەرۆك ئاگادار بکرێنەوە! لە کاتێکدا، خوێنەر بە سەرنجەوە واز لە جگەرە کێشانی سەرۆك کۆمار لە ڕۆژنامە بەرچاو دەکەوێ و دەیخوێنێتەوە، هەمان سەرنجیش بۆ کابرای ڕەش و ڕووت کە وازی لە جگەرە کێشان هێناوە، لە لایەن برادەران پێشوازی لێدەکرێ.

دەزگاکانی ڕاگەیاندن لە دەوڵەتانی نادیموکراتی، ڕۆژانە لە سەرکەوتنەکانی حیزب و حکومەت و سەرۆك، هاوولاتیان ئاگادار دەکەنەوە. ئەوان تەنیا ئەو هەوالانە کە خزمەت بە حیزب، دەوڵەت، سەرۆك دەکەن لە دەزگاکانی ڕاگەیاندنی خۆیان بلاودەکەنەوە. (هەواڵ لە دەوڵەتی سۆسیالیزم، خزمەتی سەرکەوتنەکانی خۆیان دەکا، هەواڵ لە سەر دەوڵەتانی سەرمایەدار، باس لە هەڵبژاردنی کرێکاران دەکا[٢].

لە ڕۆژنامەکانی حیزبیدا، هەواڵ بەگشتی و هەموو ناوەرۆکی ڕۆژنامەکەش بەتایبەتی، لە بەرژەوەندی حیزبدایە. (ڕۆژنامەکانی سویدیش حیزبین، بەلام مۆری حیزبایەتییان بەمانای لای خۆمان پێوە دیار نییە) لە خزمەت و پڕۆپاگەندە کردن بۆ حیزبییەکاندایە. بۆیە ئەوانەی لە ڕۆژنامەکانیش کاردەکەن، یان ئەندامی ئەو حیزبەن، یان دۆستی نزیکی حیزبەکەن، ئەمەش لەزۆر کاتدا دەکاتە خنکاندنی وشە. هەربۆیەش ئەو وتارانەی باس لە سیاسەت دەکەن، ئەگەر لە بەرژەوەندی و خزمەتی پارتی دەستەلاتدار نەبێ، بلاوناکرێتەوە.

١. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل.١٢.

2. Жанры советской газеты. М., 1972- С.24.



هەواڵ لە دەوڵەتانی پێشکەوتوو و دیموکرات، بەلایەن و بێ لایەنی نییە. ڕۆژنامەنووسان باس لە ڕووداوەکە دەکەن کە چۆن ڕوویداوە. خەڵك ناشپرسێ، ئایا دەبێ کابرا سەر بە چ پارت و ڕێکخراوێك بێ؟ بۆیە لەم دەوڵەتانە، هەواڵ بریتییە لە نووسینی چەند فاکتێك، دێڕێك، کە ڕۆژنامەنووس دەینووسێ و دەیەوێ بەهۆی ڕۆژنامەکەیەوە بەخوێنەرانی بگەیەنێ. وەك گوتیشمان، هەواڵەکانیش ڕۆژنامەنووسان بەڕادانیان نەداون، بەڵکو ڕووداوێکن کە لە ڕاستیدا بێ ویست و ئارەزووی ڕۆژنامەنووسان ڕوویانداوە یان ڕوودەدەن.

ڕووداو هەیە یەك ڕۆژ لە ڕۆژنامەکان لەسەری دەنووسرێ، هەیە چەند مانگێك بەردەوام لەسەری دەنووسرێ. ئەمەش بەپێی گەورەیی و زەقی ڕووداوەکەیە. گرتنی سەرۆکی پ. ك. ك. عەبدوڵا ئۆجەلان زیاد لە مانگێك بووە هەواڵی سەرەکی ڕاگەیاندنی زۆربەی دەوڵەتانی ئەورووپای ڕۆژئاوا.

ئەگەر بڵێین لافاوێك لە چین نابێ بەهەواڵ، بەلام یەکێك لەپێش کۆشکی سپی ئەمریکی مان بگرێ، دەبێ بەهەواڵ، ئەم بۆچوونە لە ڕۆژنامەگەری دروست نییە. لافاوەکەی چین بۆ دەوڵەتی چین و جەماوەری هەواڵێکی زۆر گرنگە و کارەساتێکی گەورەیە بۆیان، بۆیە بەدووریش نازانرێ لەلاپەڕەی یەکەمی ڕۆژنامەی خۆیان بلاو بکرێتەوە، هەمان شتیش لە مانگرتنەکەی پێش کۆشکی سپی، بەدوور نازانرێ، لەلایەن نەیارانی ئەمریکاوە بکرێ بەگرنگترین هەواڵی ڕۆژنامەکانیان.

لە بەهاری ١٩٨٨ کە ڕژێمی بەغدا هەڵەبجەی بەچەکی کیمیاوی بۆردوومان کرد، کارەساتی ناوبراو، بۆماوەی چەند هەفتەیەك وەك گرنگترین و زەقترین هەواڵ لەزۆربەی دەوڵەتانی دیموکرات و ڕۆژئاوا باسی لێدەکرا. ئێستاش لەتەك باسکردنی تاوانەکانی ڕژێم، سەدان جاریتر ئەم تراگێدیایە باسکراوەتەوە و لە کەناڵەکانی تەلەفزیۆن نیشان دراوە. کەچی هەمان هەواڵ لە یەکێتی سۆڤێت، وەك کورتە هەواڵێك لە زمانی شەڤەرناچەی وەزیری دەرەوەی ئەو کاتەی یەکێتی سۆڤێت بەکورتی دژی ئەم تراگێدیایە لە ڕۆژنامەی ئیزڤێستیا بەم شێوەیە نووسرابوو: "لە شەڕی ئێران — ئێراق چەکی کیمیاوی بەکارهاتووە و ئێمە دژین". کورد لەیەکەم ڕۆژەوە دەیزانی کە هەڵەبجە هیچ پێوەندی بە شەڕی ئێران — ئێراقەوە نەبووە. ئاشکراش بوو کە ڕژێمی ئێراق دژی دانیشتوانی بێتاوانی هەڵەبجە ئەم چەکە کوشندەی بەکارهێنابوو، کەچی لە چاپەمەنی زۆربەی دەوڵەتانی سۆسیالیستدا، وەك کورتە هەواڵێش بلاونەکرایەوە و بایەخی پێنەدرا. ئەوەی نووسراش زیاتر شێواندنی ڕووداوەکە بوو.

وەك لەسەرەوە نووسیمان هەواڵ بریتیە لە ڕووداوێك كە ڕوویدابێ، یان لە داهاتوو ڕووبدا.

ئەگەر لە سەدەی ڕابردوو هەواڵ بەچەند ڕۆژێك بگەیشتبا ڕۆژنامە، ئەمڕۆ بەهۆی تەلەفۆن، فاكس، ئینتەرنێت، ئی — مەیل، تەلەفزیۆن... هتد لەچەند چركەیەك زیاتر ناخایەنێ. بۆیە لە دەوڵەتانی پێشكەوتوو، ڕۆژنامە لە گەیشتنی هەواڵ لە دوای ڕادیۆ و تەلەفزیۆنە. بەهۆی پێشكەوتنی تەكنۆلۆژیا، مرۆڤ پێویستی بەردەوام بەزانیاری و هەواڵی نوێ هەیە. ئەوەی دوێنێ كە مرۆڤ پێویستی بەزانینی نەبوو، ئەمڕۆ دەبێ بیزانێ! ئەگەر سەدەی ڕابردوو، ڕۆژنامە و گۆڤار و كتێب، بەس بوون بۆ ئەوەی مرۆڤ بەزانست تێر بكەن، ئەمڕۆ بەشی ناكا و بڕی پێی ناشكێ. لەتەك ئەوانەی ناومان هێنان، مرۆڤی سەردەم پێویستی بە ڕادیۆ، تەلەفزیۆن و ئینتەرنێت و مۆبایلیش هەیە. ئەمانە تەواوكەری یەكترن و كەس ناتوانێ لێیان ڕابكا. ئایا ئەمە باشە یان خراپە؟ پرسیاری ترن.

ئەو پێویستیانە وایان كردووە، دەیان كەناڵی تەلەفزیۆن كاریان تەنها باسكردن و نیشاندانی ڕووداوەكانی ڕۆژانە بێ. ئەو كەناڵانەش وەك: CNN, BBC, EURA NEWS...هتد.

ئەگەر بگەڕێینەوە سەر هەواڵ، لەبەر ئەوەی لە دونیای ڕۆژئاوادا، خەڵك زۆرتر تامەزرۆی زانینن لەسەر خەڵكی بەناوبانگ، ئەمانەش دەكرێ كەسانی سیاسی، نووسەر و ئەدیب، ڕۆژنامەنووسی بەناوبانگ، یاریكەر، ئەكتەر... هتد بن.

ئەوانەی سەرەوە، بوونەتە سەرچاوەی زۆربەی هەواڵەكان. خەڵك ئارەزوویەتی هەموو شتێكیان لەسەر بزانێ وەك: چۆن و بە چ ڕێگایەك ئەو سەركەوتنانەیان بەدەست هێناوە؟ چەند كاتژمێر لە شەو و ڕۆژێكدا كاردەكەن؟ ئارەزوویان لە چ خواردنێكە؟ ئایا هیچ پلانی خۆشەویستی لە ئارادایە؟ چۆن بیر لە سروشت دەكەنەوە؟ لەگەڵ ئەم پرسیارانەی سەرەوە، ڕایان لەسەر زۆر شتی ڕۆژانەش وەردەگیرێ.

**هەواڵ لە ڕۆژنامە و ڕادیۆ و تەلەفزیۆن**

لە كوردستان ڕۆژنامەی "خەبات" و "كوردستانی نوێ" بوونەتە سەرچاوەی دەنگوباسەكانی ڕادیۆ و زۆر جار تەلەفزیۆنیش. هەندێك جار هەواڵەكانی دەنگوباسی تەلەفزیۆن بۆ ڕۆژی داهاتوو یان كەمێك درەنگتر، لە ڕۆژنامەكان لەسەری دەنووسن و وتەكان بۆ خوێنەر و جەماوەر شیدەكەنەوە و بە دوور و درێژی لاپەڕەكانی پێپڕدەكەنەوە.

هەواڵ لە گوندێك بۆ خەڵكی گوندەكە، زۆر گرنگترە لەوەی، سەرۆكی ئەمریكا لەگەڵ كێ ڕادەبوێرێ! لە شاریشدا بۆ دانیشتوانی شارەكە بەهەمان شێوە.



هەواڵ دابەشكردن لەسەر لاپەڕەی ڕۆژنامە زۆر گرنگە. دەبێ ئەو كەسە بزانێ، چ هەواڵێك بۆ جەماوەر پێویستە و لە چ لاپەڕەیەك بڵاوبكرێتەوە؟ لە ڕۆژنامەكانی كوردی مەبەست هەردوو ڕۆژنامەی ڕۆژانەی "كوردستانی نوێ" و "خەبات" سەردەمێك ڕووداوەكانی ناوخۆیان پشتگوێ خستبوو، بۆ خاتری هەواڵی برینداربوونی منداڵێكی فەلەستینی، كێشەی نێوان دوو بەرەبابی یەمەنی، یان گرفتی دەوڵەتانی باشووری كوردستان. (لێرە دا شوێنی لێكۆڵینەوەی ڕۆژنامەكانی خۆمان نییە، مەبەست تەنیا باسكردن و ڕوونكردنەوەی هەواڵە).

بە گشتی ڕووداوی ناشاز زۆر جار دەبن بەهەواڵی سەرنج ڕاكێش بۆ دەزگاكانی ڕاگەیاندن "مەس مێدیا". دەزانین پشیلە مشك دەخوا. ئەمە قەت ناتوانێ ببێ بەهەواڵ. بەڵام ئەگەر مشكێك پشیلەیەك بخوا! ئەوا بێ سێ و دوو بەیەك لە گەورەترین ڕووداوی هەموو سەردەمەكان لەقەڵەم دەدرێ.

هەندێك دەڵێن، گەر سەگ مرۆڤ بگەزێ، هەواڵ نییە، بەڵام گەر مرۆڤ سەگ بگەزێ، هەواڵە!!! ئەو بۆچوونە لەڕاستیدا زۆر دوورە. لە ولاّتی سوید هەر چەند جارێك سەگێك یەكێكی گەستبێ، وەك هەواڵی زۆر گرنگ و زەق بڵاوكراوەتەوە و لە كەناڵی تەلەفزیۆن ڕیپۆرتاژی لەسەر نیشان دراوە، ڕۆژی دواتریش لە ڕۆژنامەكان هەمان بابەت بایەخی زۆری پێدراوە. ئەو بایەخە زۆرەی بەو هەواڵە دەدرێت، لەوانەیە لەبەر ئەوە بێت كە سەگ لە سوید وەك ئەندامی خێزان سەیر دەكرێت. بۆیە لەوێ ئەگەر كەسێك سەد جار سەگێك بگەزێ، نابێ بەهەواڵ. چونكە سەگ ناچێتە لای پۆلیس و ڕووداوەكەی بۆ بگێڕێتەوە!!! بەڵام لەوانەیە لە كوردستان بەشێوەی تربێت، هەرچەندە لەم هەواڵانە تا ئێستا بڵاونەكراونەتەوە!!!

جگە لەوانەی كە باسمان كردن ، هەواڵ دەبێ ڕاست بێ و دوور بێ لە درۆ. ئەگەر ڕۆژنامەیەك هەواڵێكی بێ بەڵگە و ناڕاستی بڵاو كردەوە، بەهۆی دەستور و یاساوە، ڕۆژنامەكە دەكرێ بە دادگا بدرێ. ئەمە ڕووداوێكی نوێ نییە لەمێژووی ڕۆژنامەگەری جیهان. بۆیە زۆر جار لە نووسین خراپ نییە بزانرێ لە چ سەرچاوەیەك ئەو هەواڵە وەرگیراوە.

دوا نموونە لەسەر هەواڵ دەهێنمەوە. دەزانین سالأنە هەزاران فیلمی ڕووت لەزۆربەی دەوڵەتانی جیهان دەگێڕێ و لە سینەما و كەناڵەكانی تەلەفزیۆن نیشان دەدرێ. جەماوەر لەگەڵ ئەم كارە تەواو لێڕاهاتووە، لەوانەیە زۆر دژیشی بێ، دیسان ئامادەنییە بچێ سینەماكان بسووتێنێ! لە فیلمی هیندی نەك ئەكتەرەكان بەڕووتی پیشان نادرێن، بەڵكو ماچیش بە ئاشكرا كەم پیشانی بینەران دەدرێ. دییپ مێهتە كە ڕێژیسۆرێكی بەناوبانگی هیندییە،

تائەمرۆ چەندین خەلاّتی جودای لە ڤێستیڤاڵەکانی سینەمای جیهانی وەرگرتووە. دوا فلیمی بەناوی " ئاگر " لەم فلیمەیدا باس لەخۆشەویستی بەینی دوو ژن دەکا.

"دێنینەوە یاد کە هەموو فلیمێك لە هیندستان پێش بلاّوبوونەوەی بەسینەماکان، لە سانسوور پیشان دەدرێ". فلیمی ئاگر ڕێگای پێدرا لە سینەماکان پیشان بدرێ. ئەمەش بوو بەناڕەزاییەکی یەکجار گەورە، لەلایەن بەشێکی زۆری بینەرانەوە. زۆر لە سینەماکان شووشە و دەرگایان شکێنران و وێنەی ئەکتەرەکان سووتێنران و دڕاندران. جەماوەر داوای کرد کە جارێکی تریش سانسوور سەیری هەمان فلیم بکاتەوە، بەلاّم ئەم جارەش هیچی وایان نەدۆزییەوە، کە ببێتە هۆی قەدەغەکردنی یان نیشان نەدانی ئەم فلیمە لە سینەماکان. ئەم ڕووداوە وەك هەواڵێك جگە لە هیندستان لە زۆر دەوڵەتی جیاجیاش بلاّوکرایەوە. لە سوید لە ڕۆژی یەکشەم ڕێکەوتی ٤-٧-١٩٩٩ لەیەك لە باشترین بەرنامەی دەنگوباس بەناوی "هەشت ڕۆژ" ڕێپۆرتاژێکی دوور و درێژیان لەسەر فلیمی ناوبراو پیشاندا. دیپ مێهتە لەو بڕوایە دابوو ئەگەر لەجیاتی هەردوو ئەکتەرەکان کە هیندۆس بوون ، یەکیان هیندۆس ئەوەی تر ئیسلام بووایە، کارەساتەکە زۆر گەورەتر دەبوو. ئەم ژنە ڕێژیسۆرە پاش پیشاندانی ئەم فلیمەی چەندین چەکدار دەیپارێزن. ئەم ڕووداوە کرا بەهەواڵ، لەبەر ئەوەی ئەم ژنە ڕێژیسۆرە داب و نەریتی سینەمای هیندستانی تا ڕادەیەك شکاند.

بەکورتی بلاّوکردنەوەی هەواڵ لە ڕۆژنامە، لەسەر ویژدان و زانین و تێگەیشتنی سەرنووسەر دەمێنێتەوە. لەسەر سیاسەت و بیر و بۆچوونی ڕۆژنامەکە دەمێنێتەوە.

لەبەر ئەم خالاّنەی سەرەوە ناتوانرێ بگوترێ، کامە هەواڵ شایەنی بلاّوکردنەوە و لاپەڕەی یەکەمن، کامە هەواڵ نابێ بلاّوبکرێتەوە. ئەمە پرسیارێکی کراوەیە، تا ڕۆژنامە، ڕادیۆ لەگەڵ تەلەفزیۆن بمێنن، ئەم پرسیارە هەر بەکراوەیی دەمێنێتەوە.

لێنارت ویبول، پرۆفیسۆری زانکۆی یەتەبۆری بەشی ڕۆژنامەنووسی لە ڕاپۆرتێکی بەناوی: مەبەست چییە لە هەواڵی نێگەتیڤ؟ گەیشتۆتە ئەو بڕوایەی کە ڕۆژنامەکانی سویدی کەموکورتیان هەیە لە زانینی ئەوەی کە خوێنەر ئارەزووی لەخوێندنەوەی چ جۆرە هەواڵێك هەیە.[1].

دیارە ئەوەش هەر پرسیارێکی کراوەیە، چونکە هیچ ڕۆژنامەنووسێك نەیتوانیوە بەنووسینەکانی هەموو کەسێك وەك یەك ڕازی بکا، باوەڕناکەم کەس بیریشی لەم بۆچوونە

1. Metro، 1999-06-24.



کردبێتەوە!!! لەبەرئەوەی کارێکە لە دەسەلاّتی مرۆڤ دانییە. بەڵکو ڕۆژنامەنووس هەوڵ دەدا سەرنجی زۆرترین خوێنەر بۆ نووسینەکەی خۆی ڕابکێشێ و بەشێوەی ڕاست و دروست لە ڕووداوی دیارکراو ئاگاداریان بکاتەوە و زانیارییان لەسەر فاکتەکان پێبدا.

# گوتار

ئەرتیکولوس Articulus وشەیەکی لاتینییە و بەزمانی کوردی دەکاتە: بەشێك، بەشێك لە شتێك، بەشێك لە هەموو. ئەوەش ئەوە دەگەیەنێت کە لە ڕۆژنامەنووسی هەموو نووسینێکی بڵاوکراوە دەکاتە بەشێك لە ژمارەی ئەو ڕۆژەی ڕۆژنامەکە. هەربۆیەش جگە لە بڵاوکردنەوەی چەند هەواڵێکی کورت، زۆربەی مەتریالەکانی ناو ڕۆژنامە، زۆربەی جار بەگوتار ناو دەبرێن. گوتار ئەو نووسینانە بەخۆیەوە دەگرێت کە باس لە شتێکی ئەکتوێل و پێویست دەکات و کۆمەڵ لەو کاتەدا پێویستی بە زانینی هەیە.

گوتار، لە ژانرە گرنگەکانی ڕۆژنامە و گۆڤارە، ڕۆژنامەنووس یان نووسەری گوتار، بەتێری لەسەر بابەتێکی دیاریکراو دەنووسێ. لە گوتار نووسیندا ڕۆژنامەنووس بە دوور و درێژی کێشە و فاکتەکان دەخاتە ڕوو و بەباشی شیییان دەکاتەوە.

گوتار، لەشێوە و داڕشتندا، لە هەواڵ و ڕیپۆرتاژ دەچێ. مەبەست لە گوتار شیکردنەوەی پرسیارێکە کە نووسەر دەتوانێ بەهۆی ئەو فاکتانەی دەستی کەوتوون بەوردی، بۆ خوێنەران ڕوونی بکاتەوە. لە گوتار بەجیاوازی لەگەڵ ژانرەکانی تری ڕۆژنامە درێژی نووسینەکەیە لەگەل دەربڕینی ڕا لەسەر فاکتەرەکان[1] .

گوتار لە ژانرە بەربڵاوەکانی ڕۆژنامەنووسییە بۆ لێکۆڵینەوەو ناساندن، بەرزکردنەوە و گەیاندنی پرسیارێکی دیاریکراو بۆ کۆمەڵ، کە لەئەنجامدا زۆرجار دەبێتە مشتومڕی زۆر. جا چ لەسەر ئەو پرسیارەی لە گوتارەکە بەرز کراوەتەوە، چ لەسەر ناوەڕۆکی گوتارەکە.

1. В помощъ начинающим журналистам. М., 1965, С.148.



لە ژانری گوتار، ڕۆژنامەنووس لە نووسینێکدا کە لەبەینی ١٥٠ تا ٢٠٠ دێر (ئەگەر گوتارەکە بۆ ڕۆژنامەبێ) دەیەوێ باس لە گرفتێك بکا، کە بەڕای ئەو زانینی بۆ کۆمەڵ پێویستە.

ڕۆژنامەنووس کە گوتار دەنووسێ، مەبەستی ئەو بەرزکردنەوەی بابەتێکە، کە خوێنەران لە کورتە هەواڵ و هەواڵی درێژ دەستیان ناکەوێ. لەبەر ئەوەی بۆ نووسینی گوتار، جگە لە بەکارهێنانی فاکتەکان، ڕۆژنامەنووس هەوڵ دەدا بەردەوام لەسەر یەك بابەتی دیاریکراو بنووسێ، بۆیە سەیرنییە، ئەگەر ئەو ببێتە پسپۆری باش لەسەر بابەتی دیاریکراودا.

گوتار خۆی لەخۆیدا دەیان لقی لێدەبێتەوە وەك: گوتار لەسەر بابەتی کۆمەڵایەتی، ئابووری، سیاسی، مێژوویی، ئەدەب، ڕەخنە، وەرزش، مێدیسین، ئایین ....هتد

نووسین و هەڵسەنگاندنی هەموو ئەو بابەتانەی سەرەوە، دەکەوێتە سەر ویژدانی نووسەر، کە چۆن بیری بۆ خوێنەران دەربڕێت. ڕۆژنامەنووس لەکاتی نووسینی گوتار دەتوانێ، بە پیاهەڵدان، یان دژ، یان بێلایەن ڕای دەربڕێ. گوتار دەکرێ شێوەی پڕوپاگەندەش بە خۆیەوە ببینێ.

بەڕای من بۆ نووسینی گوتار نووسەر تا دەتوانێ و بۆی دەکرێ، هەوڵ بدا خۆی وەك بێلایەنێك لە نووسینەکەدا حوکم بدا ( لێرەدا من باس لەوە ناکەم کە لە زۆربەی ڕۆژنامەکانی جیهان ستوونێك هەیە کە ڕۆژنامەنووس جگە لەوەی فاکتەکان دەخاتە ڕوو، دەبێ بۆچوونی خۆشی لەسەر دەربڕێ. کە من دەڵێم، بێلایەن بێ، مەبەستم ئەو جۆرە ستوونانە نییە).

جگە لەو شێوانەی سەرەوە کە ناومان هێنان، گوتاری زانستی لەسەر هەموو ئەو بابەتانەی کە مرۆڤ دەکرێ بیری بۆ بچێ، دەنووسرێ.

لەزۆر کاتدا جیاوازی نێوان گوتاری زانستی لەگەڵ ئەو گوتارانەی کە لە ڕۆژنامەکانی خۆمان دەیانخوێنینەوە بەم شێوەیەی خوارەوەن:

١- خەڵکی ئەکادێم یان زۆر شارەزا دەیاننووسێ.

٢- ناوی ئەو سەرچاوانەی تێدا دەنووسرێ، کە نووسەر لە کاتی نووسینی گوتارەکەیدا بەکاری هێناون و سوودی لێوەرگرتوون.

٣- بە قەبارە زۆرترە. "گوتاری زانستی زۆر جار ٢٠- ٣٠ لاپەڕەی گۆڤار دەگرێ".

٤- گوتاری زانستی زۆرتر بۆ گۆڤار دەنووسرێ.

٥- زمانی نووسینی گوتاری زانستی، لەگەڵ زمانی ڕۆژنامە جیایە.

لەوانەیە هەندێك جیاوازی تریش هەبن. بەڵام بەڕای من ئەو پێنج خاڵەی سەرەوە، جیاوازییە گرنگەکانن کە لە نێوان گوتار بۆ ڕۆژنامە لەگەڵ گوتار بۆ گۆڤاردا هەن.

(نووسەری گوتار بەهۆی نووسینەکەوە هەوڵ دەدا، باوەڕ بەخوێنەران لەسەر دادپەروەری یان هەڵەی چ بیرێك بێ، بهێنێ. ئەو دەبێ نەك تەنیا چەند فاکتێکی لابەلا و جیا بخاتە ڕوو، بەڵکو زانیاری تەواوی لەسەر هەموو ئەو فاکتانە هەبێ، کە پێوەندییان بەڕووداوەکە هەیە. لەم کاتەدا فاکتەکان خزمەتی بیری نووسەرەکە دەکەن و نووسینەکەی بەهێزتر دەکا)[١].

من ناتوانم پشتگیری لە نووسەری سەرەوە بکەم، بەتایبەتی کە دەڵێ (نووسەری گوتار باوەڕ بەخوێنەران لەسەر دادپەروەری یان هەڵەی چ بیرێك بێ، دەهێنێ). ڕۆژنامەنووس لەسەری پێویست نییە باوەڕ بەخوێنەران بهێنێ، ڕۆژنامەنووس بەهیچ شێوەیەك نابێ ڕۆڵی شێخ ببینێ و خوێنەرانیش وەك دەروێشی خۆی لەقەڵەم بدا، بۆیە ئەو بۆچوونە خۆی لەخۆیدا بەڕای من بۆنی دیکتاتۆریەت و مامۆستایەتی لێدێ! وەك لە نووسینەکانی تر باسم کردووە، لە دەوڵەتانی دواکەوتوو و دیکتاتۆر، ڕۆژنامە و گۆڤار زۆر جار ڕۆڵی پەروەردەکردن و چەواشەکردنی جەماوەر دەبینن! لەدەوڵەتانی ئازاد و دێموکرات، ڕۆژنامەنووس بۆی نییە ڕەش و سپی لێك بدا. ئەو فاکتەکان دەداتە دەست و خوێنەر خۆی بڕیار لەسەر ناوەرۆك دەدا.

وەك گوتمان وتار زۆربەی لەلایەن خەڵکی پسپۆر و شارەزا لەسەر بابەتێکی دیاریکراوەوە دەنووسرێ. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو گوتارانەی ڕۆژنامەنووسان دەینووسن، زۆر جار لەگوتاری پسپۆران دەکا، تەنیا جیاوازی ئەوەیە کە ڕۆژنامەنووس، زانیاری تەواوی لەسەر بابەتی دیاریکراو نییە، بەڵکو لەلایەن کەسی ترەوە هێناویە و پەنجەی بۆ سەرچاوەکان ڕاکێشاوە[٢].

ئەم بۆچوونە زیاتر پێوەندی بە گوتاری زانستی هەیە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەم جۆرە گوتارانە لە بەشی تایبەتی ڕۆژنامەکان خەڵکی تایبەتی بۆ ڕۆژنامە یان گۆڤار دەیاننووسن.

### گوتار لە ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکان

ئەگەر بە وردی ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکان بخوێنینەوە، بۆمان دەردەکەوێ، کە ژانری گوتار زۆرتر لە هەموو شێوەکانی تری ڕۆژنامەنووسی بەکارهاتووە. ئەزموونی زۆری نووسەرانی

١. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل.١٧٢ .

2. Söran Larsson، att skriva i tidning. Borås، 1992.- p.123.



کورد لەسەر ئەم ژانرەو، شێوەی بەرز کردنەوەی پرسیار، دەتوانم بڵێم لە هەموو ژانرەکانی تر، نووسەران زۆرتر سەرکەوتنیان تێدا بەدەست هێناوە.

ڕۆژنامەنووس دەبێ لەکاتی نووسینی گوتار زۆر وشیار بێ، تا لەگەڵ شێوەکانی تری نووسین وەك: ڕیپۆرتاژ یان هەواڵ لێی تێکەڵاو نەبێ. چونکە لە ڕیپۆرتاژ، ڕۆژنامەنووس گەواهی ڕووداوەکانە، لە نووسینی گوتاریش زۆر جار ڕۆژنامەنووس هەمان ڕۆڵی هەیە، بەڵام جیاوازی بنەڕەتی لە شێوەی دەربڕینی بیر و داڕشتن هەیە. ئەگەر مرۆڤ پسپۆر نەبێ، بەدوور مەزانە زۆر جار لەنێوان ئەم دوو ژانرە لەکاتی نووسین یان خوێندنەوە لێی تێکەڵاو دەبێ. لە گۆڤاری ڕووناکی مامۆستا حوسێن حوزنی موکریانی لە ژمارە چواری **١٩٣٥** لە نووسینێکدا لەژێر ناونیشانی: **"تەشریف هێنانی وەزیری داخلیە بۆ هەولێر"**.

دەکرێ ئەم نووسینە وەك گوتاری هەواڵی بدرێتە قەڵەم، چونکە لە دەستپێکردنی نووسینەکە هەموو ئەو مەرجانەی تێدا کە دەبێ لە هەواڵدا هەبن وەك: وەڵامدانەوەی پرسیارەکان چ ڕوویداوە؟ لە کوێ ڕوویداوە؟ کەی ڕوویداوە؟ شایانی پێهەڵدانە کە زۆر وەستایانە نووسراوە، ئەگەر چی ئەمە چوارەمین ژمارەیە لە یەکەمین گۆڤاری شاری هەولێر. نووسینەکە لە ژێر ئیمزای (ڕ) نووسراوە، دیارە مامۆستا حوسێن حوزنی موکریانی خۆی نووسیویەتی: ڕۆژی شەممە ١٤ ی مانگی ئێستا ( کانونی یەکەم) کاتژمێر ١١ی زەوالی، سەعادەتی متسەرف لیوا سەرۆکی دائیرە و ئەشرافەکان، زاناو مشایەخی شار و سەرۆکی هێزەکانی لیوا، بۆ پێشوازی فەخامەتی وەزیر ڕەشید عالی بەگ گەیلانی بۆ پردێ کە کۆتایی سنووری پارێزگاکەمانە، بەڕێ کەوتن[١].

نووسەر بەدرێژی باس لە سەردانەکەی دەکا، باس لەگەرمی پێشوازیەکەی دەکا، باس لە گرنگی پێویستی هاتنەکەی بۆ شاری هەولێر دەکا. گوتار ژانرێکی تاڕادەیەك هەواڵیە، دیارە لەسەر ئەم نووسینە دەردەکەوێ کە ئەمە گوتارە، لەبەر ئەوەی لەهەواڵ درێژتر نووسراوە. ئایا دەکرێ بەڕیپۆرتاژیش لە قەڵەم بدرێ؟ وەڵام نەخێر، ناتوانین نووسینی ناوبراو بەڕیپۆرتاژ لە قەڵەم بدەین، چونکە لە ڕیپۆرتاژدا، جگە لەوەی ڕۆژنامەنووس شایەدی ڕووداوەکانە، زۆر بەوردیش لەسەر چاوپێکەوتن و بینینەکانی وەزیر لەم نووسینەدا بەرچاو ناکەوێ. خوێنەر، کە ئەم گوتارە دەخوێنێتەوە، ناتوانێ بەتەواوی بچێتە ناو ڕووداوەکان.

١. گۆڤاری ڕووناکی، ژمارە چوار، ل١٥.

لەو گوتارەدا نووسەر کۆتایی بەسەردانەکی وەزیر بۆ هەولێر بەم شێوەیەی خوارەوە دەهێنێ: لەبەر ئەوە کەموتەسەریفی لیوا پێویستیەکانی گەل لەهەمو کەس چاکتر دەزانی و لەهەمو شوێنێکا مەسئولە و چاکەو خراپەی وەتەن و میللەت لەو دەناسرێ و هەموو مەسائیلێکی لیوامان لە عەهد ئەو دایە، ئومێدمان وایە بە ویژدانێکی خاوێن و نیەتێکی پاکەوە فریزەمەتی بەجێ هێنابێ و فەخامەتی وەزیری لەهەموو احتیاجاتێکمان ئاگادار کردبێ و پێی گوتبێ(1).

ئەگەر بە وردی نووسینی ناوبراو بخوێنینەوە، زۆر شتی نوێمان بۆ ڕوون دەبێتەوە وەك:

١- خەڵکی هەولێر لەو کاتە خراپ دەژیان.

٢- پارێزگاری لیوا گەورەترین دەسەڵاتی هەیە و لە هەموو شوێنێك بەرپرسە.

٣- جەماوەر لێی ڕازی نییە.

(لەوانەیە نووسەر خۆی لێی ڕازی نەبێ، چونکە ئەو هیواداره جەنابی پارێزگار گرفتەکانی شار بەجەنابی وەزیر بڵێ! لەوانەشە هیچی پێ نەگوتبێ، بە تایبەتی ئەگەر جەنابی پارێزگار ویژدانی نەبێ!).

ئەم نووسینە دوورە لە پێهەڵگوتن. بەڵکو زۆرتر ژیانی دانیشتوانی هەولێری ئەو کاتەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە، کە نووسەر خۆشی یەکێکە لەوان.

مامۆستا حوسێن حوزنی موکریانی، بەڕای زۆر لە زانایان، تا ئەمڕۆ بەیەکەمین کەس دادەنرێ، کە یەکەمین چاپخانەی کوردی دامەزراندووە، دیارە هەر ئەویش لە شاری هەولێر و دەوروبەری، یەکەمین گۆڤاریشی بەزمانی کوردی دەرکردووە. ئەو زانایە گەورەیە وەك بەدرخان، لە ژمارە یەکی گۆڤاری ڕووناکی، لە وتاری یەکەمدا، بایەخی زۆری بە خوێندن و دەرکردنی گۆڤارو ڕۆژنامە داوە.

لە یەکەمین گوتاردا بە ناوی: (مجەلەی ڕووناکی و مەتبەعەی زاری کرمانجی) دەنووسێ: هەموو زاناو تێگەیشتوانی میللەتی لەوە گەیشتوون و زانیویانە کە مایەی سەرکەوتن و بەرزبوونەوە و گەیشتنە ئارەزووی بڵندی هەر میللەتێك بە مەتبەعە و مەتبوعاتە، جا لە پاشان مەکتەب و خوێندنە.

"چونکە میللەتێك مەتبەعەو مەتبوعاتی نەبێ دەردی دەرمان ناکرێ و مەکتەب و خوێندەواریش ئەمڕۆکە بە مەتبوعات و مەتبەعەوە پێش دەکەوێت و دەتوانێ خۆبنوێنێ.

١. هەمان سەرچاوەی پێشوو.ل١٦.



میللەتە سەرکەوتوو بەختەوەرەکانی جیهان، هەر ئارەزووێکی دڵیان هەبێ بە هۆی مەتبوعاتەوە نیشان بە هاو زبان و هاو ڕەگەزەکانیان دەدەن و هەرچیەکی بیانەوێ دەکەنە کتێب و نامیلکە لە چاپی دەدەن و دەیخەنە بەرچاو، سوودی، ئابووری کۆبوون، یەکدی ناسین و خۆنواندن، ڕابردویی، چویی، دەمی هاتویی، بەسەر داهاتن، و یان بەرزبوون، سەرکەوتن، بۆ پێشەوە بردنی عیلم، بڵندکردنی فەن و عیلم، بڵند کردنی فەن و سنعەت، زانین، تێگەیشتن، کڕین و فرۆتن، تجارەت، کێڵگەو جوت بەندی و کارو پیشەی سەرخستن بە مەتبوعات پێدەگەیەندرێ و هەڵدەستێ و بەوە بەراورد دەکرێ ڕۆژنامە: زبان حاڵ و پشتیوان و یارمەتی دەری میللەت و دەستگری علم و فەن و سنعەت و تجارەتە. لەبەرچاومانەو دەیبینین کە ڕۆژنامە و کۆوار (مجلە) ەکانی میللەتە بەرز و ناودارەکان بەگەرمەوە بۆ بڵاوکردنەوە و نەشریاتی عیلم و فەن و وشیاری لەخەوی تەمبەڵی و ئاگادار بوونەوە لەکەسالەت جەهالەت، ڕزگار بون لەنەبونی و دەست تەنگی و فەقیری چون بۆ دەوڵەمەندی، تەقەلاٚ دەدەن و تێدەکۆشن.

ئێمەش بۆ گەیشتنە ئەو ئارەزوە کەخزمەتی عیلم و فەن و ئیقتیساد و کۆبونەوە و یەکدی ناسین بکەین. وە وەکو لیواکانی دیکەی حکومەتی عراق لەلواکەماندا مەتبەعەیەك و ڕۆژنامەیەك دابمەزرێنین و بەهۆ و پشتیوانی معارف پەروەری و خێر و خواهی و عمران و ئاوەدان پەرستی و علم و فەن بەرز و ویستویی سعادەت ئەحمەد سعادەت بەگە متسرف غیوری خۆشەویستمان بەیارمەتی نیشتیمان خواهەو ناودارەکانی کوردەوە موەفەق بوین بە وەرگرتنی ئیمتیازی نشر مجلەی ڕوناکی و دامەزراندنی متبەعەی زاری کرمانجی لە مەرکەزی لیوای هەولێر (اربیل) ئومێد دەکەین کە ئەو متبەعەو موجلەیە زۆرچاك خزمەتی یەکیەتی عراق و سەرخستنی ئەدەبیات و اجتماعاتی میللەت و ئیقتیساد و بەرزبون و پێویستی لیوا خۆشەویستەکەمان بکاو نیشتمانەکەمان سودمەند و بەهرەوەر بێ. هەموو ئەولادی نیشتمان بەهۆی متبوعاتەوە سەرکەون و خزمەتی خاکە پیرۆزەکەیان بکەن".ل٢ ڕوناکی. ژمارە یەك. ٢٤ تشرینی یەکەم ١٩٣٥ . ناوەرۆکی گوتاری ناوبراو ئاشکرایە بۆیە بە پێویستی نازانم لێی بکۆڵمەوە. بەلاٚم ئەوەی لەم گوتارە زۆر بایەخی پێدراوە ئەمانەی خوارەوەن:

- گرنگی دەرکردنی گۆڤار و ڕۆژنامە لە کوردستان بەگشتی و لە هەولێر بەتایبەتی.
- خوێندن و خوێندنەوەی کتێب و گۆڤار و ڕۆژنامە.
- بایەخدان بەهەموو لایەنەکانی ژیانی کۆمەڵ.

- ڕستەی کورت و پەیڕەوکردنی یاساکانی خاڵبەندی.
- دانانی سەرگوتارێك کە ڕەنگدانەوەی ناوەرۆکەکەیەتی.

جگە لەوانەی سەرەوە، گرنگییەکی تری ئەم گوتارە بەکارهێنانی زمانێکی ئاسانە و دەربڕینی مەبەستەکانی نووسەرە کە هەموو کەسێك بەئاسانی تێیدەگا.

لە دەرکردنی ژمارە یەکی هەر گۆڤار و ڕۆژنامەیەك، پێویستە بۆ خوێنەران ڕوون بکرێتەوە، مەبەست لەدەرکردنی ئەو ڕۆژنامە یان گۆڤارە چییە؟ چ نووسینێك تێیدا جێی دەبێتەوە؟ شێوەی دەرچوونی چۆنە؟ ڕۆژانەیە، هەفتانەیە، مانگانەیە، یان وەرزییە؟ ئەوانە و زۆر شتی تریش لەسەر سەرنووسەر پێویستە خوێنەرانی لێ ئاگادار بکاتەوە.

ڕۆژنامەنووس لە نووسینی وتاردا، پێش هەموو شتێك دەبێ وەڵامی ئەم پرسیارەی لای خۆی هەبێ: مەبەست لە نووسینی ئەو گوتارە چییە؟ ئەگەر توانی لەخۆی بگا، بۆچی ئەو گوتارە دەنووسێ، بە دوور نازاندرێ گوتارێکی باش دەربچێ! لە کاتێکدا ئەگەر لە داڕشتنی بیرەکەی، زۆر بڕوای بەخۆی نەبێ و دوودڵ بێ، خراپ نییە بەخەڵکی شارەزای پیشان بدا. دەشکرێ نووسەری گوتار لەگەڵ ڕای پسپۆڕێك یەك نەگرێتەوە.

ڕۆژنامەنووس چاکە ئەو بابەتەی لەسەری نووسیوە، زۆر باش بزانێ و ڕای لابەلا کارنەکەنە سەر شێوەی داڕشتنەکە، جا ئەو نووسینە ئەگەر گوتار بێ یان ڕیپۆرتاژ...هتد پێش هەموو شتێك ڕۆژنامەنووس دەبێ خۆی لە نووسینەکەی خۆی ڕازی بێ و لەبیریش نەکا بۆ جەماوەر دەنووسێ.

## چاوپێکەوتن - ئینتەرڤیو

ئینتەرڤیو لە ژانرە هەرە گرنگەکانی ڕۆژنامەنووسییە. ڕۆژنامەنووس لە شێوەی پرسیار و وەلاَم لەگەڵ کەسی بەرامبەری لەسەر بابەتێکی دیاریکراو ئەکتوئێل دەکا. ئینتەرڤیو دەکرێ بۆ ڕۆژنامە، گۆڤار، ڕادیۆ یان بەرنامەی تەلەفزیۆن وەربگیرێ. سەرنووسەر، دەستەی نووسەران یان ڕۆژنامەنووس، خۆی کەسی دیاریکراو (قارەمانی گفتوگۆکە) هەڵدەبژێرێ بەمەبەستی گەیاندنی ئەو زانیارییە کە بەڕای ئەو بۆ خوێنەران، گوێگران، بینەران پێویستە.

ئینتەرڤیو وەك ژانرێکی سەربەخۆی ڕۆژنامەنووسی، لە سەدەی هەژدە لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی بەریتانیا سەری هەڵدا. ئەو ژانرە لەو کاتەدا زیاتر لە دادگاکان و پۆلیسخانەکان سوودی لێوەردەگیرا. حاکم و پۆلیس پرسیاریان لە کابرای تاوانبارکراو دەکرد و وەلاَمی پێویستیان دەست دەکەوت. پرسیار و وەلاَمی حاکم و تاوانبار بۆ خوێنەران وەك خۆی بلاَو دەکرایەوە. لەو کاتە هێشتا ڕۆژنامەنووسان پرسیاری خۆیان لە کابرای تاوانبار نەدەکرد بەڵکو ڕۆژنامەنووس بەوە ڕازی بوو کە پرسیاری حاکم لەگەڵ وەلاَمی تاوانبار بکاتە سەر کاغەز[1].

ئەم ژانرە زەقتر لە ڕۆژنامەکانی نیویۆرك لە ناوەڕاستی ١٨٣٠ بایەخی پێدرا، بەلاَم وەك ژانرێکی ڕۆژنامەنووسی لە سەردەمی شەڕی نێوخۆی ئەمریکا لە ١٨٦١- ١٨٦٥ شوێن پێی خۆی گرت. لە کیشوەری ئەوروپا لە دەوڵەتی فەرەنسا بۆ یەکەم جار لە ١٨٧٠ — ١٨٧١ بایەخی تەواوی پێدرا. ئەم مێژووە بۆ زۆربەی دەوڵەتانی پێشکەوتووی ئەوروپا دەتوانین بەسەرهەڵدانی ئەو ژانرەی ڕۆژنامەنووسی لە قەڵەم بدەین. ئەگەر سەیری گۆڤار و ڕۆژنامە کوردییەکان بکەین، بۆمان دەردەکەوێ کە لە مێژووی ڕۆژنامەگەری کوردی ئەم شێوە ژانرە

1. Björn Nöljer, Så snickar du en tidningsartikel. Borås, 1994.- p.116.



زۆر درەنگ لەسەر لاپەڕەی گۆڤار و ڕۆژنامەکان بە دیارکەوت. (ئەو گۆڤار و ڕۆژنامانەی کوردی، کوردستان، ڕۆژا کورد، ڕۆژی کوردستان، بانگی کوردستان، رووناکی، گەلاوێژ، ژمارەکانی ساڵی ١٩٤٣، کوردستان، هەولێر، هەتاو، کە من دەستم کەوتوون و لێکۆڵینەوەم لە سەریان کردووە) ئەم ژانرانەیان تەواو پشتگوێ خستبوو.

ئێنتەرڤیو وەرگرتن بۆ ڕۆژنامەنووس، لە نووسینی گوتار و ڕیپۆرتاژ و ژانرەکانی تری ڕۆژنامەنووسی، بەڕای من ئاسانترە. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەوانەی خەریکی دەرکردنی ئەو ڕۆژنامە و گۆڤارانە بوون کە لە سەرەوە ناوم بردوون، جگە لە زانینی زمانی زگماك، عەرەبی، فارسی یان تورکی لانی کەم شارەزاییان لە زمانێکی ئەوروپیش هەبووە کەم تا زۆر لەم شێوە ژانرەیان بەبەرچاو کەوتووە و لەگەڵ ئەوەشدا، لەسەر لاپەڕەکانی ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکان، بە تەواوی پشتگوێ خراوە. یەك لە تایبەتمەندێتی ئینتەرڤیو ئەوەیە کە بەگشتی ڕۆژنامەنووس پرسیار دەکا و کەسی بەرامبەریش بە گوێرەی شارەزایی و ویستی خۆی وەلاَم دەداتەوە.

تۆ وەك ڕۆژنامەنووس بەرامبەر خوێنەران و کابرای ئینتەرڤیوی لەگەڵ دەکەی، بەرپرسیاری لە نووسین و ئەو پەیوەندییەی بەینی خوێنەران و ڕۆژنامە، کە ئەوەندە پرسیار بکەی تا ئەو وەلاَمانەت دەست دەکەوێ کە بەلاتەوە بۆ خوێنەران گرنگن[1].

ڕۆژنامەنووس بۆ ئەوەی لەکاتی ئینتەرڤیو لەگەڵ کەسی دیاریکراو کە بەلای ئەو زانیاری گرنگی پێیە، بۆ ئەوەی بەرهەمی چاك بداتە خوێنەران، بینەران یان گوێگران، چاکە تێبینی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکا:

**یەك: خۆ ئامادەکردن بۆ ئینتەرڤیو**

ڕۆژنامەنووس لەو بابەتەی دەیەوێ لەسەری بنووسێ، دەبێ شارەزایی زۆری هەبێ. ئەگەر کەسەکەش نەناسێ، یان لە بابەتی ناوبراو شارەزاییشی کەم هەبێ، پرس و ڕا بەخەڵکی شارەزاو پسپۆر بکا. بۆ ئەوەی کاتی زۆری لەدەست نەچێ، دەتوانی ئەرشیڤی ڕۆژنامە، ئەرشیڤی خۆی، کتێبخانە، تەلەفۆن، فاکس، ئینتەرنێت، ئێمەیل...هتد بەکار بهێنێ. ئەگەر ڕۆژنامەنووس بەو شێوەیەی سەرەوە کە نووسیمان، کارەکانی خۆی بکا، تاڕادەیەك شارەزای کاراکتێری کابرای

١. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل.١٢٠.

ئینتەرڤیوی لێوەردەگرێ دەبێ و پێش ئەوەی ئەو وەلاّمی پرسیارەکانی بداتەوە، بیری بۆ وەلاّمەکانی دەچێ، خۆی هەست دەکا چ وەلاّمی لە پرسیارەکانی دەست دەکەوێ.

ئەگەر ڕۆژنامەنووس دوودڵ بێ لەو وەلاّمانەی کە چاوەڕێیان دەکا، دەتوانێ بەهۆی ئەو بەڵگانەی بۆ هەمان مەبەست ئامادەی کردوون لەگەڵ خۆی بیبا، لەکاتێکدا ئەگەر کابرا لە وەلاّمی پرسیار ڕایکرد، بەهۆی دیکۆمێنتەکانەوە ناچاری بکا تا بۆی بکرێ ڕاستی پێبدرکێنێ. (ئەم جۆرە ئینتەرڤیوانە زیاتر لەگەڵ خەڵکی سیاسی، دیپلۆمات و دەستەلاّتدارەکان دەکرێ و زۆرتریش لە دەوڵەتانی ڕۆژاوا باوە) ئەم شێوەیە زیاتر بەرچاوە لە تەلەفزیۆن تا ڕۆژنامە. دەتوانین بڵێین زۆرتریش بۆ ولاّتی ئازاد دەگونجێ. مەبەست ولاّتانی پێشکەوتوو و دیمۆکراتە، ئەو دەوڵەتانەی کە ڕۆژنامەگەری تێیاندا چوارەمین دەستەلاّتە.

**دوو: مەبەست لە ئینتەرڤیو چییە؟**

ڕۆژنامەنووس لەگەڵ ئەو کەسەی دەیەوێ ئینتەرڤیوی لێ وەربگرێ، دەبێ پێشتر ئاگاداری بکاتەوە، کە ئەو لە چ ڕۆژنامەیەك، گۆڤارێك کار دەکا. لە هەمان کاتیش کابرا ئاگادار بکاتەوە لەسەر چ بابەتێك دەیەوێ قسەی لەگەڵ بکا. ئەم زانیارییانە بۆ قارەمانی ئینتەرڤیو زۆر گرنگن، چونکە زۆر جار ئەویش پێویستی بەخۆ ئامادەکردن هەیە و جگە لەوانەی سەرەوە، ڕۆژنامەنووس دەبێ چاك بزانێ بۆ ئەو کەسەی هەڵبژاردووە؟ ئایا ئەو پرسیارەی دەیەوێ لەڕۆژنامە، گۆڤار، بەرنامەی ڕادیۆ یان تەلەفزیۆن، بەرزی بکاتەوە، گرنگ و سەرنج ڕاکێشە بۆ خوێنەران یان نا؟ ئایا خزمەت بەخوێنەر، بینەر، گوێگر، دەکا یان نا؟ ئایا جەماوەر ڕازین بەو وەلاّمانە؟ ئایا جەماوەر بڕیان بەوەلاّمەکان دەشکێ؟ لەگەڵ دەیان پرسیاری تر کە ڕۆژنامەنووس دەبێ پێش بینینی کابرا لە مێشکی خۆی دووبارەیان بکاتەوە. بەڕای ڕۆژنامەنووسی سویدی بیۆرن نێلەر ئەگەر ڕۆژنامەنووس بتوانێ، شوێن بۆ وەرگرتنی ئینتەرڤیو هەڵبژێری، زۆر چاکە ئەو دەرفەتە لەدەست خۆی نەدا، چونکە شوێن ڕەنگدانەوەی لەسەر نێوەرۆکی نووسینەکە دەبێ بۆ نموونە ئەگەر ئینتەرڤیو لەگەڵ کابرایەکی سیاسی بکەی کە ئارەزووی لە گوڵ و باخچەبێ، باشە باخچەیەك هەڵبژێری.

تۆ ڕۆژنامەنووسی و لەگەڵ کابرای پێکهاتوون کە لە چ کاتێك ببیینی. ئێوە لەکاتی دیارکراو یەکتر دەبینن. تۆ پێویست ناکا خۆت بشێوێنی، پەلە بکەی، چونکە دوورنییە کابرای بەرامبەرت کەمێك بشڵەژێ! بۆ ئەوەی کارەکە بەڕێك وپێکی بڕوا، چاکە بەڕووی خۆش لە چەند چرکە و خولەکی یەکەم باسی شتی گشتی لەگەڵ بکەی. ئەو باسانە هیچ مەرج نییە



پێوەندییان بە بابەتی ئینتەرڤیو هەبێ. ئەگەر کابرا بابەتێك بکاتەوە، چاکە زۆر بە چاکی گوێ لە بیرو بۆچوونەکانی ڕابگری. بەم شێوەیە ئەو دیوارەی نێوان خۆت و کابرا دەڕمێ، ئەو بڕوای تەواوت پێدەکات دووریش نییە ئەو شتەی کە نەیدەویست لێی بدوێ، لەو کاتەدا زۆر بە ئاسانی پرێسکەی دڵی بکاتەوە.

لە کاتی ئینتەرڤیودا هەندێ جار ڕۆژنامەنووس پێویستی تەنیا بە وەلاّمی کورت هەیە. بە بەڵێ یان نەخێر. ئەمەش بەڕای بیۆرن نێلەر دوو جۆر پرسیار هەن **یەك:** پرسیاری داخراو. **دوو:** پرسیاری کراوە. نموونە:

- ئایا تۆ خانووت هەیە؟ بەڵێ یان نەخێر وەلاّمەکەی دەبێتن. ئەمە پرسیاری داخراوە.
- بۆچی ئەو خانووەت کڕیوە؟ ئەمە پرسیاری کراوەیە. مەبەست لە پرسیاری کراوە ئەوەیە کە مرۆڤ زۆر بە درێژی دەتوانێ باس لە هۆی، گرنگی لە گەڵ پێویستی کڕینی خانووەکە بۆ خۆی و خێزانەکەی بکا. ڕۆژنامەنووس چاکە پلانی ئینتەرڤیوکە لەگەڵ پرسیارە گرنگەکان لەسەر کاغەزێك بنووسێتەوە. بەلاّم تا بۆی بلوێ لەکاتی ئینتەرڤیو وەرگرتن، واچاکە سەیریان نەکا، یان زۆر کەم سەیریان بکا، چونکە بەسەیرکردن، دوور نییە، لە پێش قارەمانی نووسینەکە سووك بێ و ئەو بە ڕۆژنامەنووسێکی چاك و سەرکەوتووی لە قەڵەم نەدا. ئەوەش دەبێتە هۆی ئەوەی کابرا بیەوێ زوو خۆی لەدەست ڕۆژنامەنووس ڕزگار بکا. زۆریش گرنگە ڕۆژنامەنووس کابرای بەرامبەری بەپرسیارکردن بۆردوومان نەکا. یانی کابرا وەلاّمی پرسیاری یەکەمی نەداوەتەوە، پرسیاری دووەمی لێبکا. لەو کاتەدا، بەدوور نازانرێ ئەنجامەکەی ببێتە هۆی ئەوەی کە ڕۆژنامەنووس هیچ ئەو وەلاّمانەی دەست نەکەوێ کە خۆی چاوەڕێیەتی و بۆ نووسینەکەی پێویستیەتی. دەزانین لەو کاتە هەموو ماندوبوونەکەی لەسەر ئەم نووسینە بەخۆڕا دەڕوا.

بۆ ئەوەی ڕۆژنامەنووس لەکاتی دەستپێکردنی پرسیار نەوەستێ و دەمی تێك نەئاڵێ، هەندێ پرسیاری گشتی هەن دەتوانێ لەکابرای بکا وەك: بۆچی تۆ ئەوەندە دڵنیای کەوا دەبێ؟ جەماوەر چۆن ئەو بۆچوونەی تۆ هەڵدەسەنگێنن؟ لەبەرچی؟ هەندێ لەو جۆرە پرسیارانە کە پێوەندییان بە بابەتی دیاریکراوەوە هەبێ. دەشکرێ هەمان ئەو پرسیارانەی کە لای خۆی نووسیویەتیەوە و پێشتر لە بەری کردوون، ئاڕاستەی قارەمانەکەی بکا.

باشە ڕۆژنامەنووس لە یادی بێ کە وەك کورد گوتوویەتی قسە، قسە دێنێ! کەواتە لە کاتی پرسیار و وەلاّم بێگومان پرسیاری نوێ دێنە کایەوە، ئەو هەلە لەدەست خۆی نەدا و دەتوانێ ئەو پرسیارە نوێیانەشی ئاڕاستە بکا.

بۆ ڕۆژنامەنووس زۆر گرنگە، بە وردی گوێ لە قسەکانی کابرا ڕابگرێ. ئەو گوێگرتنە بۆ ڕۆژنامەنووس گوێگرتنی وەك مرۆڤێکی ئاسایی نییە. بەڵکو نیشاندانە بە گرنگی قسە و بیرو ڕای کابرا، بە تایبەتی کە ئێمە دەزانین، ڕۆژنامەنووس لە زۆربەی کاتەکاندا پێوەندی بە قارەمانی نووسینەکانی دەکا، نەك بەپێچەوانەوە! بۆیە، دەتوانم بڵێم: گوێگرتن بۆ ڕۆژنامەنووس وەك ئاوێنەیەك وایە، لەو ئاوێنەیە ڕەوشتی ڕۆژنامەنووس پیشان دەدا. لە هەمان کاتیشدا باشە سەیری کابرا بکا کە چۆن وەڵامەکان دەداتەوە بۆ نموونە: ئایا دەشڵەژێ یان بە پێکەنینەوە وەڵام دەداتەوە. لە هەردوو شێوەدا مرۆڤ تێدەگا کە ڕاستی وەڵامەکان چۆنە. (لە زۆر کاتدا خراپ نییە قارەمانی چاوپێکەوتنەکە ئاگادار بکاتەوە کە هەموو گفتوگۆکە چەند کاتی دەوێ) .

ئەگەر ڕۆژنامەنووس توانی کارەکانی خۆی بە ڕێك و پێکی ئەنجام بدا، لەکاتی پرسیار و وەڵامەکان نەشێوابێ، ڕووی دەبێ لە داهاتووش، داوا لە هەمان کابرا بکا بۆ ئینتەرڤیوی نوێ.

ئەگەر کابرا سیاسییەکی گەورەبێ کە ڕۆژانە چەندین جار لەگەڵ ڕۆژنامەنووسان یەکتر دەبینن و شارەزایی پەیدا کردووە لە قسەکردن لە گەڵیان، لەو کاتە ڕۆژنامەنووس پێویست ناکا، بە قسەی زیادە دەست بە ئینتەرڤیوەکەی بکا. ئەو دەتوانێ یەکسەر بکەوێتە ناو بابەتەکەو ئەو پرسیارەی لێ بکا کە مەبەستیەتی.

بەڕای من چاکە ڕۆژنامەنووس سوود لە تەکنەلۆژیا وەربگرێ بۆ بەدەست گەیشتنی ئەو زانیارییانەی کە پێویستە بۆ نووسینەکەی، ئەمانەش وەك ئینتەرنێت، تەلەفۆن، فاکس، ریکۆردەر ( تەسجیل)، کامیرا...هتد. بەڵام ریکۆردەر بەکارهێنان، لەگەڵ ئەوەی زۆر کارت بۆ ئاسان دەکا، بە دوور مەزانە تووشی گرفتی گەورەشت بکات وەك: ئەگەر ئینتەرڤیوەکە دوور و درێژ بێ، کاتی زۆری دەوێ، تا هەمووی بخەیتە سەر کاغەز، ڕووش دەدا کە ریکۆردەرەکە قسەکانی خراپ تۆمار کردووە، بۆ نموونە: لەوانەیە دەنگی کەم بێ. ئەگەر زۆر لە نزیك کابراش دابنێی، بۆ ئەوەی قسەکان بە جوانی تۆمار بکا، دیسان بەدوور نازانرێ، کابرا پێی هیلاك ببێ و ئەو قسانەی دەیویست بیکا، نەیکا. چونکە لە ڕاستیدا قسەکردن لەگەڵ تەکنیك و ئاسن، گرانە و ئاسان نییە. (مەبەست لەوەیە قسەکردن بەرامبەر کامیرا، ریکۆردەر...هتد). لە لایەکی تریش لەوانەیە کابرا زیاتر سەیری ریکۆردەرەکە بکا، لە جیاتی تۆ، ئەوەش دەبێتە دروست نەبوونی کۆنتاك (پێوەندی) نێوان تۆو قارەمانەکە! من لێرە باسی ئەوە ناکەم کە بە دوور نازانرێ ریکۆردەرەکە هیچ تۆمار نەکا! لەو کاتە ڕۆژنامەنووس باوەڕ ناکەم ڕووی هەبێ



تکا لەکابرا بکا، بۆ ئەوەی سەر لەنوێ وەڵامەکان دووبارە بکاتەوە... ئەوەی لە مێشکی ڕۆژنامەنووسیش تۆمار کراوە، ئەگەر خۆی مێشکی لێ ڕانەهێنابێ، بە پاراستنی قسەی گرنگ، باوەڕ ناکەم قسەکانی کابرای بەتەواوی بۆ بخرێتە سەر کاغەز. لە ئەنجامدا نووسینێکی شەل و سەقەتی لێدەردەچێ!

ڕۆژنامەنووسی سویدی سۆران لارسۆن دەڵێ: تۆ دەتوانی چەند ئامۆژگارییەك لە ڕۆژنامەنووسان وەربگری. هەندێکیان دەڵێن، مرۆڤ پێویست ناکا بڕوا بەبیری خۆی بکا (مەبەست ئەوەیە چەند مرۆڤ ئەو قسانەی کابرا لە کاتی ئینتەرڤیو لەگەڵی دەکا لە مێشکی دەمێنێتەوە)، هەندێکی تر لەو بڕوایە دان کە مرۆڤ دەتوانێ بڕوا بەمێشکی خۆی بکا. ئەو بەردەوام دەبێ و دەڵێ: من لەو بڕوایەدام تۆ دەبێ مێشکت ڕابهێنی بۆ ئەو کارانە[١].

بەڕای من ڕۆژنامەنووس دەتوانێ ریکۆردەر بەکاربهێنێ، بەڵام وەك لارسۆن گوتی زۆر چاکە مێشکت ڕابهێنی بۆ ئەوەی ئەو زانیارییانەی دەستت دەکەون لە مێشکت بپارێزیت، لە کاتی بەکارهێنانی ریکۆردەریش دەبێ ڕۆژنامەنووس لە دەفتەرەکەی خۆی ئەو شتانەی پێی گرنگە بیاننووسێتەوە. ئەوانەش زیاتر وەك: ژمارە، ناو..هتد.

### ستێنۆگرافی

ڕۆژنامەنووس زۆر گرنگە هونەری ستێنۆگرافی بزانێ. (مەبەست لە ستێنۆگرافی ئەوەیە کە ئەو قسانەی دەکرێن، کابرا بێ ئەوەی هیچ پاز بدا، دەتوانێ وەك ڕەمز بینووسێتەوە) لەو کاتە ڕۆژنامەنووس بە سەر هیچ شتێك باز نادا و ئەوەی لە کاتی ئینتەرڤیو بۆی گرنگ بێ زۆر بە ئاسانی دەیخاتە سەر کاغەز. ئەگەر ڕۆژنامەنووس ئەم هونەرە نەزانێ، با پێی شەرمەزار نەبێ، چونکە ئەمڕۆ زۆر کەم لە ڕۆژنامەنووسان هونەری ئەم جۆرە نووسینە دەزانن. ئەو ڕۆژنامەنووسانەی لە زانکۆکان دەرسیان خوێندووە، تاڕادەیەك شارەزان، بەڵام کەمیان بەتەواوی فێربوون. من لێرە زۆرتر مەبەستم لەو خوێندکارانەیە کە لە فاکولتێتی ڕۆژنامەنووسی سانکت- پێتربورگ خوێندوویانە.

وەك گوتمان ئەگەر ڕۆژنامەنووس نەشزانێ وەك ستێنۆگرافیستەك قسەکان بنووسێتەوە نموونە: لەجیاتی نووسینی پێشمەرگە، دەکرێ بنووسێ پ. م. لە جیاتی نووسینی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان، بنووسرێ ی.ن.ك. یان بۆ پارتی دیموکراتی کوردستان بنووسێ پ.د.ك.

1. Sören Larsson, att skriva i tidning. Borås,1992.- p. 58.

یان بۆ نووسینی کوردستان ك.ن. ڕۆژنامەنووسی کورد دەتوانی ناوی هەموو پارتە سیاسییە کوردییەکان وەك لەسەرەوە نووسیمان بە کورت کراوەیی بنووسیێ.

(ناوی زۆربەی پارتە سیاسییەکانی کوردی لە بلاوکراوەکانی حیزبیدا بە کورتکراوەیی دەنووسریێ. من لیرەدا تەنیا وەك نموونە هیناومەتەوە تاکو ڕۆژنامەنووس وشەی تر، بە هەمان شیوە کورتیان بکاتەوە) بۆ نووسینی وشەی دریژ بەهەمان شیوە، دەتوانی کورتیان بکاتەوە، لە زۆر کاتیشدا ڕۆژنامەنووس دەتوانیێ بۆ نووسینی وشەی دریژ ڕەمز "سیمبۆل"بەکار بهینیێ، ئاساییە ئەو ڕەمزانە لە خۆی زیاتر کەس تیی نەگا...هتد) بۆیە چاکە لەکاتی ئینتەرڤیو وەرگرتن تا بکریێ، خەریکی نووسینەوەی وەلامەکان بیێ. لیرەشدا دەبیێ زۆر بەخیرایی وەلامەکان بنووسیتەوە، بۆ ئەوەی قارەمانەکەی بیزار نەبیێ و وەلامەکانی لیێ تیکەلاو نەبیێ و خەو داینەگریێ. (ئەو کەسانەی بەردەوام لەگەڵ ڕۆژنامەنووسان یەکتر دەبینن، بەردەوام قسەکانیان لە سەرەخۆ و ڕەوانە، ئەمەش هەم بۆ ئەوەی ڕۆژنامەنووسان پیڕابگەن قسەکان بنووسنەوە، هەمیش بۆ ئەوەی ئەو کەسانەی قسەکانیان وەردەگیڕنە سەر زمانی تر، پیڕابگەن هەمووی بەڕیك و پیکی، بیێ کەم و زیاد، وەربگیڕن بۆ زمانی دیاریکراو) ئەگەر وەك ئەوەی لە سەرەوە باسمان کرد، ڕۆژنامەنووس هەموویان بکا، دەتوانین ئەم جۆرە ئینتەرڤیوانە وەك ئینتەرڤیوی زیندوو ناو ببەین. (یانی خوینەر ئەگەر لەسەر لاپەڕەی ڕۆژنامەو گۆڤاریش بیان خوینیتەوە، هەست بە پرۆسیسی ئینتەرڤیوەکە دەکاتن و لەخویندنەوەی هیلاك نابیێ). شیوەیەکی تری ئینتەرڤیو ئەوەیە کە ڕۆژنامەنووس دەتوانیێ پرسیارەکان بنووسیتەوە و بۆ کابرا ڕەوانە بکا، کابراش لە ماڵەوە بەکاوەخۆ وەلامەکان دەنووسیتەوە و بۆ کابرای ڕۆژنامەنووس یان ڕۆژنامەکە ڕەوانەی دەکا.(ئەم جۆرەیان تا ئیستا لە ڕۆژنامەگەری کوردی بەردەوامە).

ئەو جۆرەیان دەکریێ بە هۆی تەلەفۆن، پۆست، فاکس یان ئیێ - مەیل جیبەجیێ بکریێ. بەڕای من ئەو جۆرە ئینتەرڤیوانە زۆر سەرکەوتوونین و زوو خوینەر هیلاك دەکەن! چونکە لە کاتی وەلامدانەوەی پرسیارەکان، ئەو شتەی بۆ قارەمانەکە ڕوون و ئاشکرایە، لەوانەیە بۆ خوینەر شتی نویێ بن! دیارە ڕۆژنامەنووسیش لە تەك کابرا نییە، بۆ ئەوەی لەسەر وەلامی نویێ پرسیاری نویی لیبکا. لەبەر ئەم هۆیانەی سەرەوەی، خوینەر چیژ لە وەلامەکان ناکا و هەست دەکا، ئینتەرڤیوەکە شەل و سەقەتە، بۆیە وەك گوتمان مرۆڤ لە خویندنەوەی زوو هیلاك دەبیێ.



**گوێگرتن**

ڕۆژنامەنووس وەك لەسەرەوە نووسیمان، لە کاتی ئینتەرڤیو وەرگرتندا دەبیێ گویگریکی زۆر چاك بیێ. ئەگەر لە کاتیکدا قسەکانی کابراشی زۆر بەدڵ نەبیێ هەڵنەچیێ و بەڵکو بەسەرنجەوە گویێ لە هەموو قسەکان ڕابگری. بەمەش جگە لەوەی ڕیزلینانە بۆ کەسی بەرامبەر، ڕیزگرتنە بۆ خۆشی. ڕۆژنامەنووس بۆ ئەوەی کات بەخۆڕا لەدەست نەدا، چاکە لەپیش دەست پیکردنی ئینتەرڤیو، لەسەر شیوەی پرسیار و وەلامەکە، لەگەڵ کابرا پیك بین بۆ نموونە:

تکایە قسەکان زۆر بەپەلە مەکە! ئەگەر لە کاتیکدا سنووری بابەتی دیاریکراو شکینرا، من ڕات دەگرم. ئەگەر کابرا زۆر لەسەر پرسیاریك ڕۆیشت، دەتوانیێ دیسانن بەکابرا بڵیێ، کاکڵی قسەکانم بدەیە؟ یان مەبەستت لەم قسانە چییە؟ زۆر جار ڕوو دەدا کە هەندیك قسە بۆ هەر دووکیان زۆر ڕوون و ئاشکران، بەلام کەسیان نابیێ لە بیری بکەن کە جەماوەر گرنگە و لەوانەیە بۆ وان ڕوون و ئاشکرا نەبیێ. پیش هەمووشیان دەبیێ قارەمانی ئینتەرڤیو ئاگادار بکریتەوە کە لەسەر چ بابەتیك ڕۆژنامەنووس دەیەویێ گفتوگۆی لەگەڵ بکا. چونکە نەك هەر ڕۆژنامەنووس پیویستی بەخۆ ئامادەکردن هەیە، بەڵکو بۆ ئەوەی کارەکە بەسەرکەوتوویی ئەنجام بدریێ، کابرای ئینتەرڤیوشی لیێ وەردەگیریێ وەك لەسەرەوە باسمان کرد زۆر جار پیویستی بەخۆ ئامادەکردن هەیە.

لیرەدا ڕۆژنامەنووس دەبیێ وشیار بیێ و نەکەویتە ناو بازنەیەك. مەبەست ئەوەیە لەدەوری چەند پرسیاریك بخولیتەوە، لەئەنجامدا ئەو وەلامانەی دەست ناکەویێ کە بۆ نووسینەکەی پیویستیەتی. ئیستا تۆ ئینتەرڤیوەکەت تەواو بووە، پیویست ناکا، بە پەلەپەل خۆت کۆبکەیتەوە و بڕۆی. زۆر جار پاش تەواو بوونی ئینتەرڤیوەکە زۆر وەلامت دەست دەکەویێ، کە لەکاتی قسەکردن، خەونیشی پیوە نابینی. لەو کاتەدا بابەتی ئاکاری ڕۆژنامەنووسی دیتە گۆڕیێ، ئایا ئەو قسانەی دوای داخستنی ریکۆردەر، یان تەواو بوونی ئینتەرڤیو، ڕۆژنامەنووس بۆی هەیە بلاویان بکاتەوە یان نا؟ لەسەر بۆچوونی سەرەوە ڕای جیا هەن. بە ڕای هەندیك ڕۆژنامەنووس وەك سۆران لارسۆن ئەگەر ئەو قسانە خزمەتی جەماوەر بکەن، پیویست ناکا بیر لە داهاتووی کابرا بکەیتەوە، چاکە بلاوی بکەیتەوە، چونکە ئەو چاك دەزانیێ تۆ ڕۆژنامەنووسی و ئینتەرڤیوی لیێ وەردەگری، بۆ بەدەست کەوتنی زانیاری لەسەر بابەتی دیارکراو. بەلام ئەگەر کابرا پیت بڵیێ، قسەیەکت بۆ دەکەم، بەمەرجیك تۆ لە نووسینەکەت بلاوی نەکەیتەوە، چاکە

سوپاسی بکەی و بە نەخێر وەڵامی بدەیتەوە. تۆ پێویست ناکا ڕێگای پێبدەی نهێنییەکەت بۆ بدرکێنێ کە نەتوانی بلاوی بکەیتەوە[1].

لە ڕۆژنامەگەری کوردی تائێستاش لە پێشەکی ئینتەرڤیو چەند ڕستەیەکی نابەجێ دەنووسرێ. یان پرسیاری ناپێویستی لێدەکرێ نموونە: زۆر سوپاستان دەکەین کە ئەم کاتەتان بۆ ئێمە تەرخان کرد! تکایە خۆت بەبینەران، خوێنەران بناسێنە؟ بە خوێندنەوەی ئەم دوو ڕستەی سەرەوە، لەگەڵ چەندین پرسیار لەم جۆرانە، ڕۆژنامەنووسی پسپۆر بۆی دەردەکەوێ کە هاوپیشەکەی شارەزای لە هونەر و پیشەی ڕۆژنامەگەری نییە.

بەڕای من ئەگەر کابرای ئینتەرڤیوشی لێ وەردەگری، لەناو جەماوەر ناسراو نەبێ، دیسان، نابێ ئەم جۆرە پرسیارانەی ئاراستە بکرێ! لەناو ڕۆژنامەنووسانی پسپۆر، ئەم شێوە پرسیارکردنە، جگە لەوەی ناشارەزایی لە هونەری ڕۆژنامەنووسی پیشان دەدا، دەتوانێ بگوترێ سووکردنی پیشەی پیرۆزی ڕۆژنامەنووسە.

ئینتەرڤیو دەکرێ لەکاتی بەچاپ گەیاندنی تەنیا وەڵامەکان بنووسرێنەوە و چاپ بکرێن، یانیش پرسیار و وەڵامەکان بنووسرێنەوە و چاپ بکرێن.

تائێستا لە ڕۆژنامەگەری کوردی هەر یەکەمیان باو بووە. شێوەی دووهەمیان تەنیا لە گۆڤاری دیدار کە لە وڵاتی سوید دەردەچوو لە ژمارەکانی دوایی بەرچاوم کەوتوون.

لەوەرگرتنی ئینتەرڤیو لەگەڵ هەرکەسێك بێ، ڕۆژنامەنووس دەبێ پێش هەمووشتێك دەستپاك بێ و وەڵامەکان نەشێوێنێ. ڕۆژنامەنووس ئەگەرچی مافی هەیە بەگوێرەی بیر و پێویستی خۆی وەڵامەکان گوڵبژێر بکا، بەڵام نەك درۆخستنە پاڵی و سووك کردنی قارەمانەکەی! چونکە ئەوەی ئەو دەینووسێ، بۆخۆی نییە و هەزاران کەسی تر دەیخوێننەوە، دەیبینێ یان دەیبیسێ.

لەکاتی ڕاستگۆیی، ڕۆژنامەنووس چاکتر بڕوای خوێنەر بۆخۆی ڕادەکێشێ. بۆئەوەی ئینتەرڤیوەکەی نەك هەربۆخۆی لێی ڕازی بێ، بەڵکو قارەمانەکەشی ڕازی بێ، چاکە پێش بەچاپگەیاندنی (ئەگەر بکرێ) نیشانی قارەمانەکەی خۆشی بدا، نەوەك لەکاتی قسەکردندا بابەتێکی گرنگی لەبیر چوو بێ. بەڕای من ئەو نیشاندانە زۆر گرنگە و ڕۆژنامەنووس لەلایەن خوێنەران و خەڵکی شارەزا خۆشەویستر دەکا.

١. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل.٦٦-٦٧.



لەوانەیە لەکاتی ئینتەرڤیو زۆرتر پرسیار بکرێن، بۆیە مەرج نییە هەموو پرسیارەکان بخرێنە سەر کاغەز و بۆ بلاوکردنەوە بشێن. ڕۆژنامەنووس بۆی هەیە پرسیارەکان پێش و پاش بکا، لەهەمووش گرنگتر دەتوانێ بەزمانێکی پوختی ئەدەبی دابڕێژرێتەوە. لەوجۆرە دەستکارییانە ڕۆژنامەنووس دەتوانێ پسپۆری خۆی لەو شێوازە نووسینە نیشان بدا.

زۆر گرنگە لەکاتی وەرگرتنی ئینتەرڤیودا خۆی وەك کوێخوا و زۆر پسپۆر لەئاست کەسی بەرامبەری نیشان نەدا و هەوڵ بدا ئەو هەستەی لا دروست نەکا کە کەسی بەرامبەری هیچ نازانێ و خۆی لەسەر بابەتی دیارکراو شارەزا ترە. یانیش بەپێچەوانە خۆی بەلاواز و گێل نیشان بدا. لەهەردوو شێوەی سەرەوە کە باسمان کرد، کابرای بەرامبەری بێزار دەبێ و لەوانەیە ئەوەی دەیویست بیدرکێنێ، باسی نەکا، بەمەش خوێنەر و قارەمانەکە تام لەخوێندنەوەی ناکەن و لەئەنجامدا بەزیان بۆ ڕۆژنامەنووس و دەزگاکە تەواو دەبێ.

لایەنێکی گرنگی تری ئینتەرڤیو، دانانی ناونیشانە بۆ نووسینەکە. چاکە سەردێر، ڕەنگدانەوەی ناوەرۆکی گفتوگۆکە بێ. ڕۆژنامەنووس هەن لە سەرەتادا ناونیشان بۆ نووسینەکانیان دادەنێن، ئینجا دەست بە نووسینەکە دەکەن. هەندێکیشیان هەموو نووسینەکە دەنووسن، ئینجا سەردێر بۆ نووسینەکە هەڵدەبژێرن. دەتوانین بڵێین هەردوو شێوەی کە باسمان کرد تەواو و ڕاستن. بەڵام لێرەدا گرنگە بڵێین کە ناونیشان دەبێ کورت و مانا بەخش بێ. من بۆخۆم ڕستەیەکی کورت لە نووسینەکە هەڵدەبژێرم، لە زۆربەی جارەکانیشدا گوتنی کابرای بەرامبەرم دەکەمە سەردێر. بەلای من زۆر گرنگە بایەخ بەقارەمانی ئینتەرڤیوەکە بدرێ. چونکە ئەگەر ئەو لەسەر دیتنەکە ڕازی نەبێ، ڕۆژنامەنووس ناتوانێ ئەو نووسینەی ئەو ڕۆژە لەو ژمارەیەدا بلاو بکاتەوە.

لە ڕۆژنامەگەری یەکێتی سۆڤێتی کۆن، ئینتەرڤیو تەنیا لەگەڵ خەڵکی کۆمۆنیست و دڵسۆز بۆ ڕژێم دەکرا. (ئینتەرڤیو لە چاپەمەنی سۆڤێتی لەگەڵ ئەو کەسانە دەکرێ کە پسپۆر و شارەزان، کە زانیاری پێویستیان پێیە و لەناو جەماوەردا خۆشەویستن[1].

لەبەرئەوەی ڕاگەیاندن لە سەردەمی سۆڤێتی کۆن سەر بەدەوڵەت بوو، بۆیە هەموو نووسینەکان، کتێب و پرۆگرامی زانکۆکانیش، جگە لەوەی بەردەوام ڕەنگدانەوەی سیاسەتی دەوڵەتیان پەیڕەو کردووە، لە خزمەتی ئەوانیش بوون. لەو سیستێمەدا ڕاگەیاندن زۆرتر ڕۆڵی

1. Жанры советской газеты. М., 1972- С.68.

پەروەردەکردنی بەخۆوە دەبینی. (لە ولاّتی ئێمە بۆ ماوەیەکی زۆر داواکارییان لە تەلەفزیۆن تەنیا ڕەنگدانەوەی سەرکەوتنەکان بوو)[١].

لێرەدا بەڕای من نەك هەر بیر و بۆچوونی خەڵکی سیاسی و دەستەڵاتدار گرنگ و سەرنج ڕاکێشە بۆ خوێنەران، بەڵکو زۆر جار کە خەڵکی ساکار بوونەتە قارەمانی نووسینەکان، لە لایەن خوێنەرانەوە، بۆچوونی ئەوان کەمتر سەرنج ڕاکێش نەبوون. بەتایبەتی کە بۆچوونی ئەوان ڕەنگدانەوەی بۆچوونی جەماوەرن.

لەگەڵ ئەوانەی سەرەوەشدا، بەڕای نووسەرانی کتێبی ڕۆژنامەنووسی تەلەفزیۆن، چاوپێکەوتن وەك نەریت، لە سێ بەش پێك دێت:

١- سیاسییەکان، کارگێڕانی حکومەت، پسپۆر و خەڵکانی شارەزا.
٢- خەڵکی بەناوبانگ، ئەوەش بۆئەوەی جەماوەر زۆرتر لەسەر ژیانیان شارەزا و ئاگادار بن.
٣- خەڵکی ساکار کە ئێمە لە ماڵ، سەر شەقام، لەسەر کار دەیان بینین. بۆ ئەوەی ڕای جەماوەرمان لەسەر ڕووداوی دیارکراو بۆ ڕوون بێتەوە[٢].

## شێوەی ئاراستەکردنی پرسیار

ڕۆژنامەنووس وەك لەسەرەوە نووسیمان، لەکاتی پرسیارکردن، پێش هەموو شتێك دەبێ زۆر بڕوای بەخۆی هەبێ و خۆی لاواز نیشان نەدا. پرسیار کردن چاکە بەدەنگێکی سروشتی بێ نەك بەهات و هاوار. ئەمەش بۆ ئەوەی لەکاتی ئینتەرڤیو وەرگرتندا قارەمانەکەی لەبیر بکا کە ئەو قسە بۆ ڕۆژنامەنووس دەکا. ئەگەر بەم شێوەیە بێ، ئینترڤیوەکە بەشێوەیەکی سروشتی دەڕواو بەدوور نازانرێ کە ڕۆژنامەنووس زانیاری زۆرتری دەست بکەوێ.

ئەگەر پرسیاری توند بێتە پێشەوە کە بزانێ ئەوەی کە بەرامبەری پێیان تووڕە دەبێ، چاکە پرسیارەکان لە شێوەی کەسی سێیەمەوە بن بۆ نموونە: برادەرێکم دەیگوت، تۆ دەستەڵاتت بۆ کاری تایبەتی خۆت و خزم و کەس و کارت بەکار دەهێنی، نەك بۆ خزمەت کردنی جەماوەر! نازانم ئەو برادەرەم ڕاست دەکا یان نا؟ ئەگەر ئەو لێرە بوایە، تۆ چۆن وەلاّمت دەدایەوە؟ لەکاتی وەلاّمدانەوەی دەتوانی لەسەر هەمان بابەت بەردەوام بێ و پرسیاری تری لێبکرێ وەك: پێش ئەوەی بێمە ئێرە، چوومە زانکۆ و لەگەڵ خوێندکاران و مامۆستایان قسەم کرد،

1. А. Я. Юровский, Телевизионная журналистика. М., 1998- С.40.
٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل.١٦٧.



کەسیان لەکارەکانی ئێوە ڕازی نەبوون! زۆریان پێکەنینیان بەوە دەهات کە ئێوە چۆن ئەو پۆستەتان پێدراوە؟ دەبێ ئەوان لەبەرچی ئەوەندە لە بەڕێزتان نارازی بن؟ خەڵك ئەم هەموو قسانە لەکوێ دەهێنێ؟

ئەم شێوە پرسیارانە لەبەر ئەوەی لە شێوەی کەسی سێیەمەوە دەکرێن، قارەمانی ئینتەرڤیوەکە باوەڕناکەم تووڕە بێ و بەدووریش نازانرێ زۆر بەهێواشی وەلاّمی پرسیارەکان بداتەوە. وەك دەزانین دەکرێ ڕۆژنامەنووس هەمان بیر و بۆچوونی ڕەخنەگرانی هەبێ. بەم شێوەی پرسیارکردنە ڕۆژنامەنووس زانیاری زۆرتری دەست دەکەوێ و ئینتەرڤیوەکەش بەشێوەی هێمنانە بەڕێوە دەچێ و کەسیش لەکەس تووڕە نابێ.

ئەم شێوانەی کە باسم کردن زۆرتر بۆ گۆڤار و ڕۆژنامە بوون. ئینتەرڤیو بۆ تەلەفزیۆن، جگە لەوەی دەبێ پرسیارەکان کورت و ڕەوان بن، نابێ چۆنێتی دانیشتن و جل و بەرگیش پشتگوێ بخرێ. لەبەر ئەوەی خەڵکێکی زۆر بەرنامەکە دەبینن و بەدووریش نازانرێ، بینەری وا هەبن هەر لەبەر ئەوەی کابرای ڕۆژنامەنووس ئەو جلەی لەبەر نییە کە زۆربەی خەڵك لەبەریەتی، کەناڵەکە بگۆڕێ، یان لەبەر ڕەنگی جلەکان، سەیری بەرنامەکە نەکەن. جگە لەوەی لە تەلەفزیۆن دەبێ زۆر بیر لە دیکۆری ستۆدیۆش بکرێتەوە. (ئەگەر لە داهاتوو تەلەفزیۆن دروست کرا، جگە لە گەیاندنی ڕەنگ و دەنگ، بۆنیش بگەیەنێ، لەو کاتە دەبێ بیر لەو بۆنەش بکرێتەوە، کە لەلایەن زۆربەی جەماوەر بەبۆنێکی خۆش لەقەڵەم دەدرێ، یان چارەسەرێك بۆ ئەم گرفتەش بدۆزنەوە!!!).

چاکە ئەوانەی لە ڕادیۆ و تەلەفزیۆنیش کار دەکەن، جگە لەوەی دەبێ ڕۆژنامەنووسی چاك بن، دەبێ بیر لەدەنگیش بکرێتەوە بۆ نموونە ئەگەر ژنێك دەنگی پیاوانەی هەبێ، یان پیاوێك دەنگی ژنانە بێ، چاکترە ئەو جۆرە کەسانە لە ڕادیۆ و تەلەفزیۆن بەرنامە بەڕێوە نەبەن. ئەم جۆرە کەسانە، زیاتر دەبێ لەپشت شاشە و میکرۆفۆنەکانەوە کار بکەن. یانیش لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکان کار بکەن. چونکە دەنگیان لەوانەیە هەندێك لە بینەران و بیسەران بێزار بکا، ئەمەش زیاتر ڕێزلێنانە لە جەماوەر لەلایەك و لە لایەکی تریش کۆکردنەوەی زۆرترین گوێگر و بینەرە بۆ کەناڵ و وێستگاکان. (لەم بۆچوونەم مەبەستم نییە کەس بریندار بکەم، بەڵکو من بیر دەکەمەوە چۆن دەزگاکانی ڕاگەیاندن دەتوانن زۆرترین خەڵك لەدەوری خۆیان کۆبکەنەوە. چاك دەزانم مرۆڤ زۆر شت ناتوانێ هەڵبژێرێ وەك: دەنگ، جوانی، دایك و باوك، شوێنی لەدایك بوون... هتد).

لەو چەند شێوەیەی ئینتەرڤیو کە لەسەرەوە باسمان کرد، بۆ ئەوەی خوێنەران چاکتر لە مەبەستم بگەن، یەك لەشێوە نوێکانی دەنووسمەوە. ئەم شێوەیەی خوارەوە لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی ڕۆژئاوا بەتایبەتی دەوڵەتی سوید زۆر باوە.

پێش ئەوەی دەقی ئینتەرڤیوەکە وەك خۆی لەم کتێبە چاپ بکەین، بەپێویستم زانی کەمێك بۆ خوێنەران ئینتەرڤیوەکە ڕوون بکەمەوە.

ناونیشانی ئینتەرڤیوەکە، ڕستەیەکە لە قسەکانی قارەمانی ئینتەرڤیوەکە. دیارە ئاشکرام کردووە بەوەی کە ناوی شاکرۆم نووسیوە و دواتر دوو خاڵم داناوە.

من بەپێویستم زانی کەمێك لەسەر ژیانی شاکرۆ بنووسم بەمەش دوو مەبەستم هەبوو:

**یەك:** بۆ ئەوەی خوێنەر بزانێ ئەو کەسانەی خەریکی لێکۆڵینەوەن لەسەر کێشەی کورد زۆر لە پیشەکەیان شارەزا و پسپۆرن. لەگەڵ ناساندنی ئەو بەرهەمانەی کە خوێنەر دەتوانێ پاش خوێندنەوەی ئینتەرڤیوەکە بەدوایان بگەڕێ، لە کاتێکدا ئەگەر ویستی شارەزای زۆرتر لەسەر هەمان کەس و کێشە پەیدا بکا.

**دوو:** قارەمانی ئینتەرڤیوەکە هەست دەکا ئەوەی ئەم هەموو ساڵانە ئەو خەریکی بووە، بەخۆڕا نەبووە و کەسانێك هەن بایەخیان پێدەدا. جگە لەوانەش سەنگێك بە چاوپێکەتنەکە دەدا، کە خوێنەر ناچار دەکا قسەکان بەجددی وەربگرێ و بایەخیان پێبدا. ئەمانەی سەرەوە بۆ ڕۆژنامەنووس کەم گرنگ نین.

لەو شوێنانەی ئەم هێڵە هەیە(-) قسەکانی شاکرۆن. ئەم شێوە نوسینە لەبەر ئەوەی لە ڕۆژنامەگەری کوردی شێوەیەکی نوێیە، ناهەقی خوێنەر ناگیرێ، کە نەزانێ لەکوێ قسە و کۆمێنتاری منە و لەکوێش قسەو کۆمێنتاری مامۆستا شاکرۆن. لەم شێوە نووسینە ئەگەر مرۆڤ بەوردی بیخوێنێتەوە، هەست دەکا ڕۆژنامەنووس لە شێوەی پەخشان نووسیویەتی. لەبەر ئەوەی بابەتەکان زۆر تەواوکەری یەکترین، خوێنەر لە خوێندنەوەیان هیلاك نابێ، ئەگەر لەکاتێکدا بابەت گۆڕابێ، ئەوا لە سەردێری نوێ دەست پێدەکا و ناونیشانی نوێی بۆ دانراوە.

**ئەم چاوپێکەوتنە لە ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ- زمانی ڕوسی- ژمارە سێ، لاپەڕە چوار، مارت ١٩٩٨، سانکت-پێتربورگ، روسیا بلاوکراوەتەوە.**

**شاکرۆی مخۆیان: مەسەلەی یەکبوون هەموومان بەپەرۆشەوەین**

شاکرۆ خدۆیی مخۆیان لە گوندێکی کوردنشین بەناوی (ئەڵەگیاز) لە ئەرمێنیا لەدایك بووە. خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی لە گوندی خۆیان تەواو کردووە. لەساڵی ١٩٤٨ لە کۆلێژی



پەروەردە بەشی مێژوو وەرگیرا و لە ١٩٥٢ خوێندنی تەواو کرد. دوو ساڵ وەك مامۆستای مێژوو دەرسی گوتۆتەوە، لەساڵی ١٩٥٥ لەکاتێکدا کە لە یەریڤان سەرلەنوێ دەستیان بە دەرکردنی ڕۆژنامەی "ڕیاتازە" کردەوە، داوایان لێی کرد کە ببێتە سەرنووسەری ڕۆژنامەی ناوبراو. ئەو لە ڕۆژنامەی ڕیاتازە بۆ ماوەی پێنج ساڵ کاری کرد. بەڵام شاکرۆی مخۆیان هەوڵی دا بۆ بەجێهێنانی خەونی دێرینی کە پێك هاتبوو لە لێکۆڵینەوەی مێژوو لەسەر نەتەوەکەی.

لە سەرەتای شەستەکان گرووپی کوردناسی لە بەشی ئینستیتوتی ڕۆژهەڵاتناسی ئەرمێنیا کرایەوە و لێرە ئەو وەك کارناسێکی تازە دەستی بەکار کرد. لە ساڵی ١٩٦٣ دکتۆرای لەسەر (بزووتنەوەی ئازادیخوازی نەتەوەی کورد لە پاش تەواو بوونی شەڕی جیهانی دووەم) تەواو کرد و وەری گرت. لە ١٩٧٧ دکتۆر "ناوك"ی لەسەر (کێشەی نەتەوەی کورد لە کۆماری ئێراق) دا وەرگرت. لەساڵی ١٩٨٢ پلەی زانستی پرۆفیسۆری پێبەخشرا و لە ١٩٩٠ لە ئەرمێنیا هەڵبژێردرا بۆ پلەی زانستی ئەکادێمیك و لە ساڵی ١٩٩٦ وە پلەی زانستی ئەکادێمیکی ئەرمێنیای پێبەخشرا. لەساڵی ١٩٨١ تا ١٩٩٤ وەك بەڕێوەبەری بەشی کوردناسی لە ئینستیتوتی ڕۆژهەڵاتناسی ئەرمێنیا سەرپەرشتی گرووپی کوردناسی دەکرد. لەساڵی ١٩٩٤ سەنتەری لێکۆڵینەوەی زانستی لە شاری مۆسکۆ کرایەوە، زاناکانی کە بەو کارە هەڵسابوون مامۆستا شاکرۆیان بە بەڕێوەبەری سەنتەر هەڵبژارد و تا ئێستاش لەسەر هەمان کار بەردەوامە. شاکرۆی مخۆیان لەسەر مێژووی کوردستان یەك لە کوردناس و زانا هەرە گەورەکانی هەموو کوردستانە. تا ئێستا حەوت پەرتووك و دەیان گوتاری زانستی لەسەر بابەتی دیارکراو بلاوکردۆتەوە. کارەکانی ئەو زانایە لەناو ڕۆژهەڵاتناسەکاندا شوێنی تایبەتی خۆیان هەیە و تا ئێستا بەزۆر زمانی جیا جیای جیهانیش وەرگێڕدراون.

- من لەناکاو بڕیاری لێکۆڵینەوەی مێژوویی، بەتایبەتی مێژووی باشووری کوردستانم نەداوە. ئەوە بەهێزکردنی بزووتنەوەی ئازادی نەتەوەی کوردە. چالاکی کوردی ئێراق بووە هاندەرێك بۆم بۆ ئەوەی لەسەر مێژووی ئەوان لێکۆڵینەوە بکەم. شاکرۆی مخۆیان پێمان ڕادەگەیێنێ و لەهەمان کاتیشدا باسی پلانەکانی داهاتوومان بۆ دەکا لەسەر هەمان بەشی کوردستان.

لەم هەموو کاتەی ئەو خەریکی لێکۆڵینەوەی مێژووی نەتەوەکەی بووە، بێ شك زۆر ناڕەوایی لەسەر مێژووی گەلەکەی بینیوە کە دژ بەکێشە ڕەواکەی کراوە. ئێستا کە بۆی ڕەخساوە بۆ خوێنەرانی ڕۆژنامەکەمان قسە بکا، پرێسکەی دڵمان بۆ دەکاتەوە:

- کورد مافی دامەزراندنی دەوڵەتی خۆی بەهەموو شێوەکانیەوە هەیە. بەداخێکی زۆر گەورەوە لە ڕێگای بەجێهێنانی ئەو ئامانجەی نەك هەر تەنیا دەوڵەتەکانی دەوروبەر کە بەشێك

له کوردستانیان لەژێر دەستە دژی ئەو مافە وەستاون، بەڵکو مافی ئازادی کورد لەسەر ئاستی نێونەتەوەییش لەبیر کراوە. زلهێزەکان چارەنووسی هەموو جیهانیان لەژێر دەستە، بۆچوونی ئەوان لە بڕیاری چارەنووسی کورد، لە مافی فەرهەنگیشەوە نییە. کورد لەسەر زەوی باوك و باپیرانیەوە دەژی، بەپێوەری مێژووییشەوە زلهێزەکان تەنیا بۆچوونێکی ڕۆژانەیان: لەسەر بنچینەی سیاسەت و دیپلۆماتیەت، ئابووری و ستراتیجی شەڕ، تەنها لەڕوانگەی بەرژەوەندی خۆیانەوە سەیر کردووە. بۆ مرۆڤ ئاسانە کاراکتێری (خەسڵەتی) نارەوای ئەم سیاسەتە بسەلمێنێ، بەڵام ئەمە بابەتێکی تایبەتییە.

لە ئەنجامی چەند فاکتەرێکی ناخۆش کە کورد خاوەنی دەوڵەمەندترین ئەزموونی بەڕێوەبردنی دەوڵەت و فەرهەنگ بووە، وەك گەلێکی گەورە، نەك لە ناوچەکەدا، بەڵکو لە هەموو جیهاندا، بێ ماف ماوەتەوە. لە ڕووی فاکتەری یاسا، لەبێ دەوڵەتی بێبەش کراون! یەك لە کاراکتێری تایبەتی مێژووی کوردستان ئەوەیە، کورد هەرگیز نەیتوانیوە داگیرکەر قبوڵ بکاو بەژێر دەستی ڕازی بێ. ئەوان بەدرێژایی ژیان خەباتیان بۆ ئازادی خۆیان کردووە. ئەمە لە حوکمڕانی خەلیفاتی عەرەبی، لە سەردەمی سەدەکانی ناوەڕاستەوە دەست پێدەکا. کوردەکان ئەزموونی حوکمڕانی زۆری خۆیان هەبووە. ئەمانە وەك: مەروانییەکان، بابانەکان، بەدرخان و زۆری تریش. ئێمە ترادیسیۆنی دەوڵەت بەڕێوەبردنمان هەیە، کەچی زۆر بەکەمی باسی ئەو ڕاستییە مێژووییە دەکەین. ئەوەی ڕاستی بێ، ئێمە بەردەوامین لەسەر گەڕانەوەی شێوەی بەڕێوەبردنی دەوڵەت، هەندێك لە ئەمیرەکانی کوردستان سکەیان لێداوە. ئەمە لەزۆر دەوڵەتانی سەردەمی ئەوان لە ڕۆژهەلاّت و ڕۆژهەلاّتی نزیك نەبووە. بۆیە بۆ کورد پرسیاری ئۆتۆنۆمی یان مافی چارەی خۆنووسین، بۆ لێکۆڵینەوە لە دەزگاکانی ڕاگەیاندن و لەناو پارتە سیاسییەکان بۆ ماوەیەکی زۆر دەرگای کراوەیە.

بۆ زیاتر باسکردن و لێکۆڵینەوە لەسەر هەمان بابەت شاکرۆی محۆیان بیر و بۆچوونی تایبەتی خۆی هەیە:

– دروشمی ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان کە پارتی دیمۆکراتی کوردستان لە بزووتنەوەی ئازادی کورد بۆ ماوەیەکی زۆر هەڵی گرتبوو، تا ئەمڕۆش هەر نەگۆڕاوە.

(دیمۆکراتی بۆ ئێراق و ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان) ئەم دروشمە ڕۆڵی خۆی دەگێڕێ و بەشێوەی سیاسی ڕەنگینە. بەڵام بەڕاستی کردنی ئەم دروشمە بەندە بە کۆمەڵێك کۆسپ. ئەوەی ڕاستی بێ زۆر مەنتقی نییە! بۆچی ئێمەی کورد دەبێ ئەوەندە زۆر خوێن برێژین بۆ



ئەوەی دیموکراتیەت لە ئێراق بچەسپێنین! لەوانەیە بەشەکەی تر هێشتا بۆ هەزمکردنی دیموکراتییەت ئامادە نەبێ! ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە بۆ نموونە: کێشەی ئێمە چارەسەر ناکرێ تا شیعەکانی ئێراقی بەدیموکڕاتی کردنی ولاّت ڕازی دەبن! لێرەدا پرسیارێك بەرز دەبێتەوە: ئایا ئەوان بەشێوەی گشتی بەبوونی دیموکراتییەت ڕازین؟ من ئەم دروشمە ڕەت ناکەمەوە، تەنیا باسی لایەنە لاوازەکانی دەکەم کە بریتین لەوانەی خوارەوە: ئەزموونی چیا سەلماندوویەتی کە ئۆتۆنۆمی ڕاستەقینە هیچ شانسێکی نییە نە لە ئێراق و نە لە هەموو ڕۆژهەلاّتی ناوەڕاست، لەکاتێکدا ڕژێمەکانی ڕۆژهەلاّتی ناوەڕاست خۆیان دیموکڕاتی نین! چۆن دەکرێ سوود لە ئۆتۆنۆمی وەربگیرێ کە بەشێکی گرنگی دیموکراتیەتە!

بە بۆچوونی شاکرۆی محۆیان کە کورد تا ئەمڕۆ نەیتوانیوە بگاتە ئامانجەکانی، لەمەدا هەر سەرکردەکانی بزووتنەوەی ئازادی کورد تاوانبار نین.

– ئێمە ناتوانین سەرکردەکانی خۆمان بەراورد بکەین لەگەڵ سەرکردەی بزووتنەوەی ئازادی گەلانی تر. عەرەفات و ماندێلا پشتیوانی هەموو جیهانیان هەبووە. کوردەکان تەنیا لەگەڵ بەدبەختیەکەیان دەژین!!!

کورد چ لە کوردستان، چ لەدەرەوەی ولاّت بەردەوام شاکرۆی محۆیان بۆ گێڕانی سمینار و کۆنفڕانسی جیا جیای تایبەت بەکورد بانگ دەکەن. ئەو کە بۆچوونی خۆی هەیە لەسەر بزووتنەوەی کوردی، لەو بڕوایە دایە کە مەسەلەی یەکگرتن هەموو کوردێك بەپەرۆشیەوەیەتی.

– مەسەلەی یەکگرتن و یەکبوون بەهیچ شێوەیەك نابێ بە پارتایەتییەوە یا لە ڕوانگەی ژیانی سیاسی لە کوردستان سەیر بکرێ و ببەسترێتەوە، بەڵکو ئەمە بۆکورد بوون و نەبوونی دەگەیەنێ، یانی بەردەوام بوون لەسەر خەباتی چڕ یان هیلاك کردنی گەل! شاکرۆ لەسەر قسەکانی بەردەوام دەبێ و لەو بڕوایەدایە کە سەرکەوتنی بەشێك لە بزووتنەوەی ڕزگاری کوردستان ڕاستەوخۆ کار دەکاتە سەر بەشەکانی تر.

**سەنتەری کوردی**

– ئێمە پێوەندیمان لەگەڵ سەنتەرەکانی تری کوردی هەیە. سەنتەری ئێمە جیاوازی لەگەڵ ئەوانی تر هەیە بەوەی کە ئێمە لە ڕوسیا، هەموو کوردناسەکانمان لەگەڵە. شەش پڕۆفیسۆر و چەند دکتۆرێك لە سەنتەری ئێمە کار دەکەن. ئێمە بناغەیەکی بەهێزمان لە زانست هەیە، بەلاّم لەلایەن ئابوورییەوە ئەوەندە چاك نییە و گرفتمان هەیە. سەنتەرەکانی تر پارەی زۆریان

هەیە بەلاّم کادری پسپۆر و شارەزایان کەمە. ئەوان ئێمە بـۆ کۆنفرانـسی جیـا جیـا دەعـوەت دەکەن و ئێمەش هەولْ دەدەین هاوکاریان بکەین.

شاکرۆی محۆیان داخ دەخوا کە ئـەم پەیوەندییانـە لـە ئاسـتی پێویـست نـین کـە دەبووایـە هەبووایـە. ئـەو لـەو بڕوایەدایـە کـە فەرهـەنگی هاوکـاری کـردن نـەك هـەر لـەناو پارتـە سیاسییەکاندا، بەلْکو لەلایەن نوێنەری ڕۆشنبیرانیشەوە لاوازە.

سەنتەری کوردی لە مۆسکۆ چوار ساڵە هەیە. بەدرێژایی ئەم کاتە دەولْەتی روسیا یارمەتی ماددی نەداون، لەهەمان کاتیشدا کۆسپی نەخستۆتە سەر ڕێگای کارکردنیان.

- دەولْەتی ڕوسیا بەئاشـکرا ڕێگـای کـارکردنی بەئێمـە داوە. ئـەوان بەشـێوەیەکی چـاك دەڕواننە سەنتەرەکەمان.

سەنتەر لەوەتی هەیە توانیویەتی چەند کارێکی زانستی بەچاپ بگەیـەنێ و پلانـی زۆر گەورەشی لەپێشە. یەك لەو پلانانە، چـاپکردنی کتێبێکـی زانـستییە بـەناوی "(مێـژووی گەلی کورد) کتێبی ناوبراو لەساڵی ٢٠٠٠ چاپکرا". ئەم کتێبە لەلایەن چەند ئەنـدامێکی سەنتەر نووسراوە.

لە مانگی ئایـاری ئـەم سـالْ پـلان بـۆ گێڕانـی سمینـاری زانـستی لـەیادی سـەد سـالْەی ڕۆژنامەگەری کوردی دانراوە. بۆ ئەم سمینـارە کوردنـاس و ڕۆژنامەنووسـی بـەناوبانگی کـورد لەدەولْەتی جیا جیای جیهان و کوردستان بۆ بەشداری کردن دەعوەت دەکرێن. (سمیناری ناوبراو لە ٥-٦ مانگی دێسەمبەر گێڕدرا).

### چاوپێکەوتنی هەوالْی

لەو کاتەی کە نووسەر لە بەرهەمەکەی دەیەوێ تەنیا ئاگاداری جەماوەر بکاتەوە لەوەی کە ئەو لە ئەنجامی ئینتەرڤیوەکە بەدەستی هێناوە و ناشیەوێت کۆمێنتاری (تەعلیق) خۆی لەسەر قسەکانی کەسی بەرامبەری لێبدا. لەو کاتە دەکرێ بگوترێ کە ئەو مەتریالْ بـۆ هـەوالْ پەیـدا دەکا. بەتایبەتیش ئەگەر پرسیارەکان، چ؟ لە کوێندەر؟ کەی؟ تێدا بێت. بەلاّم ئەگەر کـابرا لـە ئەنجامی ئەو پرسیارانەی کە لێی دەکرێت وەلاّمی: لەبەرچی؟ بـە چ جۆرێـك؟ مەبەسـت لـەوە چییە؟ تێدا بێت، لە ئەنجامدا مەتریالی ئەنالیستیچسکی "لێکۆلْینەوە" دەست دەکەوێت.

لەسەر هەوالْ زۆرجـار مـرۆڤ دەتوانێـت بلێـت، هـەوالْی گـرنگ و باسـکردنی، وەك ئـەوەی موستەحیل بێت وایـە. چـونکە ئـەو کەسـانەی تێیـدا بەشـدارن، نایانـەوێ باسـی بکـەن و



نکۆلْیشی لێناکەن. ئایا هەوالْەکە هەر بلاّوبکرێتـەوە یـان چـاوەڕێ بکـرێ؟ لـەو کاتەشـدا، بەدوور نازانرێ، دەزگایەکی تر پێش تۆ هەمان هەوالْ بـلاّو بکاتـەوە. بۆیـە مـەرج دانـان و سەیرکردن، بەچاوی ڕەخنەوە، زۆر ئاسانە بەلاّم جێبەجێ کردنی لە ڕۆژنامەگەری زۆر گرانە.

## گفتوگۆ

ئەو ژانرە لەگەڵ ئینتەرڤیو زۆر لەیەك نزیكن و شتی هاوبەشیان زۆرە وەك:

هەردووك بەدوولا دەكرێن، ئەگەر نووسینیش بێت، ئەوا دیسان هەردوولا تێیدا بەشدار دەبن. بەشێك لە نووسینەكە دەبێتە هی كەسی بەرامبەر و ئەوەی تریش هی ڕۆژنامەنووس.

چ ئینتەرڤیو چ گفتوگۆ، لە هەردووكیان گۆڕینەوەی بیر و ڕا هەیە، كەچی لە نێوان هەردووكیان جیاوازی زۆر گرنگ هەیە ئەویش لەناوەرۆكی نووسینەكە ڕەنگی داوەتەوە.

ئەگەر لەكاتی ئینتەرڤیو ڕۆژنامەنووس تەنیا پرسیار بكات و وەڵامەكانیش كەسی بەرامبەری بیداتەوە، ئەوا وەڵامەكان دەبنە كاكڵی چاوپێكەوتنەكان.

سیفاتی تری ژانر چاوپێكەوتن بۆ ڕۆژنامەنووس ئەوەیە كە ئەو چەند پرسیارێك لە كەسی بەرامبەری دەكات و پرسیارەكانیش تایبەتن بەو بابەتەی بەلای ڕۆژنامەنووس گرنگ و سەرنج ڕاكێشن. وەڵامەكانی ئەویش وەك نووسیمان دەبنە ناوەرۆكی نووسین و بابەتەكە.

لە گفتوگۆ ڕۆژنامەنووس و كەسی بەرامبەر هەردووك لە یەك ئاستدان و لە ئەنجامی گفتوگۆكە، نووسینەكە لەدایك دەبێ.

كە ڕۆژنامەنووس ئینتەرڤیو وەردەگرێ، ڕەوت و ناوەرۆكەكەی لەدەست خۆیەتی. بەڵام لە گفتوگۆ وەك گوتمان هەردووكیان وەك یەك وان. لێرەدا ڕۆژنامەنووس لەگەڵ كەسی بەرامبەر دەتوانێت لەسەر ڕای خۆیان بمێننەوە. هەربۆیەش لە گفتوگۆ، زۆر لایەنی بابەتەكە باس دەكرێن و كە دەكاتە باشتر هەڵسەنگاندن. لەوەش گرنگتر هەردوو لا ڕێز لەبیر و بۆچوونی یەكتر دەگرن و نایانەوێ لای تر بەزۆر بێتە سەر ڕای ئەوان. لە خراپترین جۆریشدا، گفتوگۆكە بێ ئەنجام دەبێت[1].

1. А.А.Тертычный, Жанры периодической печати. М., 2000- С.116.



لە گفتوگۆ ڕۆژنامەنووس قسە لەگەڵ كەسی بەرامبەری دەكا، بەڵام لە ئەنجامدا لەوانەیە هەردووك پرسیار لەیەكتر دەكەن.

هەر ئەو بەشداربوونەشە لە پرسیارو وەڵام، كە گفتوگۆ لە ئینتەرڤیو جیا دەكاتەوە، وەك جۆرێك بۆ بەدەستخستنی ئەو هەواڵانەی، ئەو زانیارییانەی بۆ كۆمەڵ پێویستن. لەو ژانرەدا وەك گوتمان هەردووكیان لە یەك ئاستدان.

# ڕێپۆرتاژ

ڕێپۆرتاژ لە بەشی یەکەمی سەدەی نۆزدەدا پەیدا بوو. ئەم ژانرە لەسەرەتادا لە دادگا و پەرلەمان و کۆبوونەوەکانی پارتە سیاسییەکان سەری هەڵدا و دواتر وەك ژانرێکی ڕۆژنامەنووسی سوودی لێ وەرگیرا.

نووسینی ڕێپۆرتاژ، باسکردنی ڕووداوێکە کە ڕۆژنامەنووس لەگەڵ خەڵکی تر تێیدا بەشدارە. لێرەدا ڕۆژنامەنووس نابێ ڕووداوەکە تەواو بنووسێتەوە، بەڵکو گرنگی ڕێپۆرتاژ دەگەڕێتەوە سەر شێوەی نووسینی لەگەڵ باسکردنی ڕووداوەکە.

ئەگەر ڕووداوێك ڕووبدات، لە ڕێپۆرتاژدا دەبێ زۆرتر بایەخ بەو شوێنە بدرێت کە ڕووداوەکەی تێدا ڕوویدایە. بەڵام ئەوەش لەڕاستیدا، شایەنی لێکۆڵینەوە و باسکردنە. زۆرجار لەکاتی نووسیندا زۆر گرانە چۆن بنووسیت بۆ نموونە: لەکاتی داخستنی کارگەیەك، ئایا زۆرتر لەسەر کرێکارەکان بنووسرێت و پشتگیرییان لێبکرێت، یان پشتگیری لەخاوەن کارگە بکرێت؟ لەکاتێکدا خاوەنی کارگەکە، لەزیان زیاتر هیچی بۆ نامێنێتەوە! یانیش ئایا دەنگوباسێکی ئەمریکا، زۆرتر شوێنی پێبدرێت و باس بکرێت، یان ڕووداوێکی ناوخۆی وڵات. لەم کاتەدا، کامە هەواڵ بەپێش کامە بکەوێت. ئەوانە هەمووی پرسیارن و پێویستیان بە بڕیاردانی خێرا هەیە. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەگەر ڕاستیت دەوێت، ڕۆژنامەنووس نابێت لایەنی هیچ لایەك بگرێت و پڕۆپاگەندەی بۆ بکات.

ژانری ڕێپۆرتاژ زیاتر لەلایەن ڕۆژنامەنووسانی ئەمەریکی و بەریتانی فۆرمی نوێی ئێستای بەخۆوە بینیوە. ئەوان تەکنیکی نووسینی ڕێپۆرتاژیان بەرەو پێشەوە برد و بایەخی زۆریان



پێدا. بەڵام وشەی ڕێپۆرتاژ، وشەیەکی فەرەنسییە کە دەکاتە: هەڵگرتن بۆ دواوە، گەڕانەوە بە شتێکەوە، گەیاندن، دان.

ژانری ڕێپۆرتاژ، لە مێژووی ڕۆژنامەگەری جیهان، زیاتر سێ ڕۆژنامەنووس بەرەو پێشەوەیان برد. جۆن ڕیدی ئەمەریکی، ئیگۆن ئێروین کیشی پراگ لەگەڵ ئێرنست هەمەنگوای نووسەر. جۆن ڕید لە کتێبی ڕاپەڕین لە مەکسیکۆ کە لە ساڵی ١٩١٣ ی نووسی، بەرهەمەکەی زەقترین نموونەی ڕێپۆرتاژە[١].

ڕێپۆرتاژ بۆ ڕۆژنامە و گۆڤار لە لایەن خوێنەرانەوە وەك فیلمی ڕووداوەکانە، کە لە تەلەفزیۆن بۆ بینەران نیشان دەدرێ. بە خوێندنەوەی ڕێپۆرتاژ، خوێنەر شارەزای تەواوی ڕووداوەکان دەبێ و لەگەڵ ئەوەشدا مەرج نییە نووسینی هەموو ڕێپۆرتاژەکان وەك یەك دەست پێبکەن و تەواو بن.

ڕێپۆرتاژی چاك و سەرنج ڕاکێش لەسەر بنچینەی زانیاری تەواو لەسەر بابەتێکی دیاریکراو دەنووسرێ. ڕێپۆرتاژی باش، ڕۆژنامەنووسی خاوەن ئەزموون دەینووسن. ئەوان ماوەیەکی زۆر لە ژیانیان بۆ نووسینی ژانری ناوبراو تەرخان کردووە[٢].

لە کاتی نووسینی ڕێپۆرتاژ زۆر گرنگە وەڵامی ئەم پرسیارانەی تێدا بێ: کێ لە ڕووداوەکە بەشدارە؟ لە کوێندەر ڕووی داوە؟ کەی ڕووی داوە؟ چ ڕووی داوە؟ ئەم چوار پرسیارەی سەرەوە تەنیا بۆ نووسینی ڕێپۆرتاژ گرنگ نین، بەڵکو نووسەرانیش لە کاتی نووسینی چیرۆك، ڕۆمان....هتد دەتوانن سوودی لێوەربگرن. جگە لەو چوار پرسیارەی سەرەوە، دوو پرسیاری تریش هەن کە وەك: چۆن ڕوویداوە؟ لەبەر چی ڕوویداوە؟ زۆر جار وەڵامی ئەم دوو پرسیارەی دواوە بۆ بەهێز کردنی نووسینەکان گرنگن.

لە نووسینی ڕێپۆرتاژ گرنگە ڕۆژنامەنووس بزانێ کە نووسینەکەی لەسەر چ بابەتێکە و لەوەش گرنگتر کێ دەتوانێ وەڵامی پرسیارەکان بداتەوە؟ چ کەسێك دەبێتە قارەمانی ڕێپۆرتاژەکە؟ کێش ڕۆڵی دووەم لە ڕێپۆرتاژەکە دەبینێ؟ لە وەڵامی پرسیاری دووەم ڕۆژنامەنووس خۆی بڕیار دەدا.

---

1. Sören Larsson, att skriva i tidning. Borås, 1992. p.106.

٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل.٩٦.

وەلاّمی کەنگی ڕوویداوە؟ بۆ نووسینی ڕێپۆرتاژ زۆر گرنگە، وەك لارسۆن گوتەنی فۆرمی نووسینەکەت دەداتێ. وەلاّمی پرسیارەکان دوور نییە نووسینەکە زۆر بەهێزتر بکا، ئەگینا دەکرێ دەور و پشتی کاتەکە بنووسرێ. وەك لە جیاتی دوێنێ کاتژمێر هەشتی ئێوارە، دەکرێ بنووسرێ دوێنێ ئێوارە، یان تەنیا دوێنێ. لە بەکار هێنانی کات ڕۆژنامەنووسی ڕۆژنامە دەبێ ئەوەی لەبیر نەچێ کە دوێنێی ئەو دەکاتە پێرێی خوێنەران یان درەنگتریش. ئەوە خاڵێکی گرنگە بۆ ڕۆژنامەنووسان لەکاتی نووسین بیری لێبکەنەوە.

لە وەلاّمی لە کوێندەر ڕوویداوە؟ وەك دەزانین شوێنی ڕووداوەکەمان بۆ دەستنیشان دەکا. ئەوەش دەکرێ گوند، شارۆچکە، شار، شەقام بێ. بۆ خوێنەر گرنگە بزانێ ئەم ڕووداوە لە کوێندەر ڕوویداوە؟ بۆ ئەوەی چاکتر لە نووسینەکە بگەن. ئەو شوێنەی ڕووداوی ڕێپۆرتاژەکەی دەربارە دەنووسرێ، گرنگە بە جوانی بنووسرێ، بۆ ئەوەی خوێنەر لەکاتی خوێندنەوەیدا هەست بە بەشداربوون لە ڕووداوەکە بکا. وەك نووسیشمان تۆ دەبێ بە شێوەیەك بنووسی کە جگە لە دەستنیشان کردنی فاکت، هەست و سۆزیش بۆ خوێنەران نیشان بدەی. بۆیە ئەگەر نووسەر زۆر بە وەستایانە قالبی ڕێپۆرتاژەکەی دابڕێژێ، خوێنەر خۆی وەك شایەدێکی ڕووداوەکە دێتە بەرچاو، ئەو هەست دەکا خۆی هەموو ڕووداوەکانی بە چاوی خۆی دەبینێت.

وەك لە سەرەوە نووسیمان، ڕێپۆرتاژ قارەمانێکی هەیە. ڕۆژنامەنووس لەکاتی نووسین لە سەری و دەربارەی ئەو دەتوانێ، هەمووی بە یەکجار لە سەر نەنووسێ، ئەگینا دەبێتە بیوگرافی کابرا، بەڵکو وا چاکە بەش بەش لە سەری بنووسێ.

کاری تۆ لەکاتی نووسینی ڕێپۆرتاژ ئەوە نییە کە ئەو شوێنەی ڕووداوەکەی لێ ڕوو دەدا، بەوردی بۆ خوێنەران بنووسی. بەڵکو تۆ دەتوانی سوود لە شوێنەکە وەربگری بۆ ئەوەی گیان وەبەر نووسینەکەت بنێی[1].

دیسان بۆ ڕۆژنامەنووس گرنگە شوێنی نووسینی ڕێپۆرتاژەکە دەستنیشان بکا. مەبەست ئەوەیە کە هەموو ڕووداوەکان دەبینێ، لە کوێندەر بۆ ڕۆژنامە یان گۆڤار بیخاتە سەر کاغەز (ژوور، سەرکار، پارك، چایخانە...هتد).

لە نووسینی ڕێپۆرتاژ پێویستە بایەخ بەشتە وردەکانی ڕووداوەکەش بدەی. چاکە بیر هەر لە چاو و گوێ نەکەیتەوە، بەڵکو باشە هەست و بۆنیش بەکاربهێنرێ. ئەگەر ڕۆژنامەنووس بیر

١. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل.١٠٣.



لەوانەی سەرەوە بکاتەوە، خوێنەر، نووسینەکە وەك فیلمێك، دەهێنێتە بەرچاوی خۆی. ئەوەش دەکاتە ڕێپۆرتاژێکی هەست بزوێن و زیندوو.

ڕێپۆرتاژ دەتوانێ ڕۆڵی هەواڵیش ببینێ. چونکە مەبەست لەم ژانرە، گەیاندنی ڕووداوێکە بە شێوەیەکی دوور و درێژتر لە هەواڵ، بۆیە دەکرێ ڕێپۆرتاژ وەك ژانرێکی هەواڵی دەستنیشان بکرێ. ڕێپۆرتاژ نووسین، کاری یەك ڕۆژنامەنووسە و هەر ئەویش بە تێڕوانینی خۆی ڕووداوەکان دەخاتە سەر کاغەز. لە ساڵەکانی ٢٠- ٣٠ سەدەی ڕابردوو، لە ڕۆژنامەگەری یەکێتی سۆڤێت، مشتومڕێکی زۆر لە سەر ئەم ژانرە ڕوویدا، هەندێك لە توندڕەوانی ناو پارتی کۆمۆنیست، دەیانویست ئەم ژانرە لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکان قەدەغە بکەن، گوایە دژی پرینسیپەکانی کۆمەڵگای سۆڤێتە. چونکە لە کۆمەڵگەی سۆڤێتی، هەموو کارەکان بە کۆمەڵ دەکرێن، ڕێپۆرتاژ نووسینیش وەك دەزانین کاری یەك کەسە، بۆیە ئەم ژانرەی ڕۆژنامەگەرییان بە نووسینی بۆرژوا لە قەڵەم دەدا و گوایە خزمەتی بیری سەرمایەداری دەکا. لە ناوەڕاستی سییەکانی سەدەی بیست، بۆچوونی ئەوان تەواو پشتگوێ خرا و بڕیاریاندا بەردەوام بن لە نووسین و بلاّوکردنەوەی ئەم ژانرە بۆ ڕۆژنامەکانی خۆیان. (بۆ زیاتر شارەزابوون، لە سەر ڕێپۆرتاژ لە ڕۆژنامە و گۆڤاری سۆڤێت، سەیری کتێبی: ژانرەکانی ڕۆژنامە لە چاپەمەنییەکانی سۆڤێت ل ٩٦- ٩٧ بکە). لە سەردەمی شەڕی دووی جیهانی، ئەم ژانرە خزمەتێکی زۆری بەحکومەتی مەرکەزی سۆڤێتی کرد. لەو کاتە ڕێپۆرتاژ نووسین لە ژانرە هەرە گرنگەکانی ئەو کاتەی ڕاگەیاندنی سۆڤێت، بوون.

ئەگەر ڕۆژنامەنووس دەستی نووسینی چاکی هەبێ و بتوانێ بە شێوەیەکی جوان نووسینەکە دابڕێژێ، قامك بۆ وردەکارییەکانی ناو ڕووداوەکە درێژبکا، ڕێپۆرتاژ دەتوانێ بۆ خوێنەر ببێتە ئاوێنەی ڕووداوەکان. ئەوەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە ڕێپۆرتاژی باش باشترین سەرنجی خوێنەر بۆ لای خۆی ڕادەکێشێ، هەر بۆیەش گرنگە ڕۆژنامەنووس نووسینەکەی بە زمانێکی ناسك و پاك و ڕەوان بنووسێ و مەبەستی خۆی بۆ خوێنەران دەربخا.

ڕێپۆرتاژ دەبێ، بە زمانێکی ئەدەبی زۆر جوان و لە هەمان کاتیشدا ئاسان، کە هەموو خوێنەران تێیبگەن، بنووسرێ. بە گشتی لە نووسین بۆ ڕۆژنامە، دەبێ زمانێکی ئاسان بەکار بهێنرێ. (لە هەردوو ڕۆژنامەی کوردی "خەبات" و "کوردستانی نوێ" ئەم شێوە نووسینە تا ئێستا وەك پێویست پەیڕەو ناکرێ).

وەك گوتمان لە نووسینی ڕێپۆرتاژدا، ڕۆژنامەنووس دەبێ لە ناو ڕووداوەکە بێ، بۆ ئەوەی بتوانێ بە شێوەی پێویست بیری نووسینەکە لەسەر کاغەز دابڕێژێ. گێڕانەوەی ڕووداو لە زمانی کەسی سێیەمەوە، گیان وەبەر ڕێپۆرتاژەکە نانێ و ئەو چێژەی نابێ کە خوێنەر چاوەڕوانی دەکا، (زۆر جار دەبێتە هۆی مردنی مەتریالەکە). بەشداربوونی ڕۆژنامەنووس لە ڕووداوەکە، خوێنەر بەجۆش دەهێنێ و لە هەمان کاتیشدا ئەو بە هەستێکی پڕ لە سۆزتر ڕێپۆرتاژەکە دەنووسێ. لەبەر ئەو هۆیانەی سەرەوە، لە ڕێپۆرتاژدا زۆر وشەی من، یان ئێمە بەکار دەهێنرێ. ئەوەش بهێنینەوە یاد، ڕۆژنامەنووس نابێ ئەوەندە ناوی خۆی دووبارە بکاتەوە، کە ڕێپۆرتاژ نووسینەکەی لێ ببێ بە چیرۆك![1].

گرنگی ڕێپۆرتاژ ئەوەیە کە شوێنی درۆ و دەلەسەی تێدا نابێتەوە، چونکە لەو کاتەدا نووسینەکە نابێ بە ڕێپۆرتاژ. هەموو نووسینەکە دەبێ هەڵێنجراوی ئەو ڕاستییانە بن کە ڕۆژنامەنووس، بەچاوی خۆی بینیویەتی. بۆیە ڕێپۆرتاژ ڕەنگدانەوەی ڕووداوەکانە کە یەك لە بەشداربووانی ڕۆژنامەنووس خۆیەتی. ئەگەر ڕۆژنامەنووسێك بە مەبەستی چەواشەکردنی خوێنەران هەموو ڕووداوەکان هەڵبگێڕێتەوە و درۆی بۆ هەڵبەستێ، باوەڕ ناکەم ئەوەندە کار بکاتە سەر خوێنەر، چونکە شوێنی هەست و سۆز بە درۆ پڕ ناکرێتەوە.

ئەوانەی سەرەوە کە لەسەر ڕێپۆرتاژ نووسیم، زیاتر مەبەستم ڕێپۆرتاژ لە ڕۆژنامە و گۆڤارە. دەزانین ڕێپۆرتاژی ڕادیۆ لەگەڵ تەلەفزیۆن، لەگەڵ ڕێپۆرتاژی ڕۆژنامە و گۆڤار لەدارشتندا تەواو لێك جیان. لە نووسینی ڕێپۆرتاژ، بۆ ئەوەی نووسینەکە بە هێزتربێ و خوێنەران چاکتر بکەونە ناو بابەتەکە، بەڕای من باشترە وێنەشی لەگەڵ بلاّو بکرێتەوە. وێنە بۆ ڕۆژنامەکانی سەردەم زۆر پێویستن. دەکرێ وێنەی قارەمانی ڕێپۆرتاژەکە بێ. یان ڕووداوەکە یان ئەو وێنانەی لەگەڵ نووسینەکە کە هەمان بابەت بە دەستەوە دەدەن بلاّوبکرێنەوە. بۆ نموونە: کردنەوەی پێشانگایەکی شێوەکاری، دەکرێ لەگەڵ ڕێپۆرتاژەکە وێنەی هەندێك تابلۆ، یان ئەو کەسەی پێشانگاکە دەکاتەوە، وێنەی سەیرکەران، وێنەی هۆڵەکە بەکار بهێنرێ و بلاّوبکرێتەوە. بۆ نووسینی ڕێپۆرتاژ لەسەر ئەو جۆرە بابەتانەی ناومان هێنان، چاکە پرسیارێك لە چەند کەسێکی بەشداربووانی ڕووداوەکەش بکرێ، بۆ ئەوەی نووسینەکە زیندووتر دیار بێ.

1. Жанры советской газеты. М., 1972- С.104.



لەبیر نەکەین، وەرگرتنی ڕای خەڵك، بیرکردنەوە و بۆچوونی جەماوەر، بۆ ڕۆژنامەنووس دەبێ زۆر گرنگ بێ چونکە هەموو خۆ هیلاك کردنەکە هەر بۆ خاتری ئەوانە.

## ڕێپۆرتاژ لە ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکان

یەکەمین ڕێپۆرتاژ لەو ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردییانەی من دەستم کەوتوون و لێکۆڵینەوەم لە سەریان کردووە، تەنیا لە ڕۆژنامەی ڕۆژی کوردستان، ژمارە هەشت، ساڵی ١٩٢٢ بووە. لەم ڕێپۆرتاژە ڕۆژنامەنووس بە دوور و درێژی باس لە سەردانەکەی سمکۆ ئاغای شکاك، بۆ بینینی مەلیکی کوردستان شێخ مەحمودی حەفید دەکا. نووسەر توانیویەتی وەستایانە بینینەکانی سمکۆ ئاغا بە خوێنەر ڕابگەیەنێ. خوێنەر لە کاتی خوێندنەوەی، هەست دەکا کە خۆی بەشدارە لە بینینەکان. ئەم ڕێپۆرتاژە ئەگەر چی لە ساڵی ١٩٢٢ نووسراوە، لەگەڵ ئەوەشدا، زانیارییەکی تەواو لە سەردان و ڕووداوی ناوبراو بە خوێنەران دەدا و نووسەر زۆر بە پرۆفسانە کارەکەی خۆی ئەنجام داوە.

نووسینی ڕێپۆرتاژ لە یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی "کوردستان" شوێنی نەبۆتەوە. لە ڕۆژنامەی "ڕۆژی کورد"( زۆربەی نووسەرانی کورد کە لە سەر ڕۆژنامەکانی کوردیان نووسیوە، گۆڤاری ڕۆژی کورد کە لە ساڵی ١٩١٣ لە ئەستەمبۆل سێ ژمارەی لێ دەرچوو، بە ڕۆژنامە ناوی دەبەن، بە ڕای من زیاتر لە گۆڤار دەکاو تا ڕۆژنامە. ئەمەش چ لەبەر درێژی گوتارەکانی"ڕۆژی کورد"، چ لە زۆری ژمارەی لاپەڕەکانی و قەبارەی) یشی شوێنی نەبۆتەوە. بۆیە بە دوور نازانرێ، هاتنەکەی سمکۆ ئاغای شکاك بۆ سلێمانی و سەردانی مەلیکی یەکەمی کوردستان، بە یەکەمین ڕێپۆرتاژ لە مێژووی ڕۆژنامەگەری کوردی لە قەڵەم بدرێ. ئەو ژانرە لە گۆڤاری هەتاویش لە پەنجاکان بە دیار کەوت. یەك لەو ڕێپۆرتاژانە بەو ناونیشانەی خوارەوە بوو:

### تشریف هێنانی پادشای خۆشەویستی عراق خاوەند شکۆ "ملك فیسل" بۆ هەولێر

لەم ڕێپۆرتاژە بە دوور و درێژی باس لە گەشتەکی مەلیك لە کەرکوکەوە بۆ هەولێر دەکرێ بۆ نموونە: کێ پێشوازی لە پاشا کردووە و لە کێوە بەرەو هەولێر بەڕێ کەوتووە. پادشا بە گوێرەی ناوەرۆکی ڕێپۆرتاژەکە، پاش لافاوەکەی سلێمانی چۆتە کەرکوك لەوێش هاتۆتە هەولێر. لە هەولێریشەوە چۆتە هاوینەهەواری پیرمام و دوای پشوودان چۆتە ڕەواندوز.

مەلیك لە ٦-١١-١٩٥٧ لە شاری کەرکوك بەرەو هەولێر بەڕێکەوتووە. هەتاو ژمارە ١٣ ساڵی ٤ ، یەکشەممە ١٠ تشرینی دوو ١٩٥٧ ل. ١- ٢ تەواوکردنی ل.٢٤. هەر چەندە

نووسەری ڕێپۆرتاژەکە دیار نییە، لەگەڵ ئەوەش وەستایانە توانیویەتی گەشتەکەی پاشا بۆ کوردستان، بۆ خوێنەران باس بکا و بنووسێ. لەم ڕێپۆرتاژە ناوی زۆر کەسیشی تێدا نووسراوە کە پێشوازیان لە مەلیك کردووە. ئەگەر نووسەر، ئەم دیتنانەی نەدیبا، باوەڕ ناکەم، توانیبای وا وەستایانە، هەمووی بۆ خوێنەران بخاتە سەر لاپەڕەی گۆڤاری هەتاو. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەوە یەکەمین ڕێپۆرتاژ نییە لە گۆڤاری هەتاودا بڵاوکرابێتەوە.

لە گۆڤاری هەتاو زۆر بابەتی نوێ هاتۆتە ناو ڕۆژنامەگەری کوردی "لە دەرفەتێکی تر باسیان لێوە دەکەم". گۆڤاری ناوبراو شایەنی لێکۆڵینەوەیەکی زانستییە، بە داخەوە تا ئەمڕۆ وەك زۆربەی گۆڤارو ڕۆژنامەکان، لە چەند ڕستەیەك یان گوتارێك زیاتر لە سەریان نەنووسراوە!

بۆ ئەوەی خوێنەران، چاکتر لەم ژانرە بگەن، بەپێویستم زانی ڕێپۆرتاژێك کە بۆ ڕۆژنامەی "کوردستانی نوێ" بە زمانی ڕووسی لەسەر کتێبخانەی کوردی لە ستۆکهۆڵم نووسیبووم، وەك خۆی بنووسمەوە (هەر چەندە ڕێپۆرتاژەکەم بە زمانی ڕوسی نووسیبوو، بەلاّم بەبێ دەستکاری بۆ سەر زمانی کوردی گۆڕیتم. دەهێنمەوە یادی خوێنەران، کە ئەو گوتارانەی نووسەران، ڕۆژنامەنووسان بە زمانانی ئەورووپی دەینووسن، زۆر جار بیرکردنەوەکانیشیان و شێوەی داڕشتنیان بە زمانی ڕۆژنامەکە دەبێ. لەوانەیە ئەگەر بۆ ڕۆژنامەیەکی کوردیم بنووسیبا، شتی تر هەبوو کە دەمتوانی بایەخیان زۆرتر پێبدەم. لە گەڵ جیاوازی زمان و داب و نەریت، باوەڕ ناکەم بۆ خوێنەرانی کورد بێ سوود بێ، بە تایبەتیش کە مەبەستم چۆنیەتی نووسینی ژانری ڕێپۆرتاژە.

## کتێبخانەی کوردی لە ستۆکهۆڵم

لە ژمارەی مانگی ١٢ ڕۆژنامەکەمان، هەواڵێکمان لە سەر کردنەوەی کتێبخانەی کوردی لە سوید بڵاوکردەوە. بەلاّم ئەوە تەنیا لە فۆرمی هەواڵ بوو. لەسەر ڕووداوی کردنەوەی کتێبخانەی کوردی کە بۆ کورد زۆر گرنگە، دەستەی نووسەرانی ڕۆژنامەکەمان، پێش کردنەوەشی لە پرۆسێسەکە ئاگادار بوون. کە چی بەداخەوە لە سێرمۆنیای کردنەوەی نەمانتوانی بەشدار بین و بە درێژی لەسەر کردنەوەی کتێبخانەی کوردی خوێنەرانی ڕۆژنامەکەمان ئاگادار بکەینەوە. کە من چوومە ستۆکهۆڵم، یەك لە کارەکانم، سەردانی کتێبخانەی کوردی بوو. من هەر چەندە ناونیشانی کتێبخانەم هەبوو، بەلاّم بڕیارمدا لەگەڵ برادەرێك بۆ ئەوێندەرێ بچم. لە وێستگای میترۆی "کۆنگستریگۆردن" لە گەڵ برادەرەکەم یەکترمان بینی. ئەوە دوای سەنتەر یەکەمین وێستگایە کە لێی دوورە.



لە وێستگای میترۆ دەرچووین و بە پێش هوتێلی "گراند" ڕەت بووین. پەنجا مەتر دوورتر ڕۆیشتین، گەیشتینە مۆزەخانەی میللی سوید. دوای مۆزەخانە لەسەر پردێك پەڕینەوە و پیلێکمان بینی ناوی کتێبخانەی کوردی لەسەر نووسرابوو، کە خەڵکی پێ ئاگادار دەکرایەوە کە کتێبخانەی کوردی کەوتۆتە چ لایەك. سەد مەتری تر ڕۆیشتین گەیشتینە خانووێکی چوار نهۆمی زەرد. لەسەر هەمان خانوو بە پیتی بچووك، بە زمانی سویدی نووسرابوو "کتێبخانەی کوردی"، لە ژێرەوەش بە پیتی بچووکتر بە زمانی کوردی "پیتی لاتینی" نووسینەکە دووبارە بوو بۆوە.

ئەو شتانەی یەکەم جار لە کتێبخانە بینیم: کتێب، ڕۆژنامە، گۆڤار لەگەڵ پێشانگایەکی وێنە. لە قوژبنێك ژنێکی سویدی دانیشتبوو، دوایی بۆم دەرکەوت ئەو ژنە لەوێ کار دەکا. لە ژوور کابرایەکی بالاّ بەرز بەرەو ڕوومان هات، کە برادەرەکەم دەیناسی و ئێمەی بە یەکتر ناساند. من بەم شێوەیە لەگەڵ نەدیم، کە بە بیر و هەوڵ و تەقەلاّی ئەو ئەم کتێبخانە کرایەوە و ئێستا بەڕێوەبەرێتی، ئەوم ناسی. نەدیم کوردی کوردستانی تورکیایە. لەو ١٥ خولەکەی من لە کتێبخانەکەدا بووم، بەردەوام خەڵك تەلەفۆنیان بۆ کتێبخانە دەکرد. بۆیە کاك نەدیم زۆرتر بەوەلاّم دانەوەی تەلەفۆنەکان خەریك بوو. من کاتێکم لەگەڵی دانا، بۆ ئەوەی چاوپێکەوتنێکی بۆ ڕۆژنامەکەمان لەگەڵ بکەم.

- دووشەم کاتژمێر دوو بۆ تۆ باشە؟ نەدیم لێمی پرسی.

- بەڵێ، بەڵێ زۆر باشە. وەلاّمم دایەوە.

نەدیم داوای لێبووردنی کرد کە دەبێ بۆ کاروباری کتێبخانە بچێتە شار. دوای ڕۆیشتنی ئەو، ئێمەش کەمێك سەیری کتێبەکانمان کرد دواتر ئەوێمان بەجێ هێشت.

پێنج ڕۆژ ڕۆیشت، ڕۆژی دووشەم هات، کاتژمێر دوو لەگەڵ نەدیم یەکترمان بینی و بەدوور و درێژی لە سەر ئاهەنگی کردنەوەی کتێبخانە پرسیارم لێکرد.

- کتێبخانە لە ١٠ ی ئۆکتۆبەری ساڵی١٩٩٨ بە ڕەسمی کرایەوە. بۆ کردنەوەی نووسەرانی کورد، کوردناس و زانایان بەشدارییان تێدا کرد. زاناو نووسەران لە دەوڵەتی جیاجیای جیهان بۆ ئەم کردنەوەیە هاتبوون: ئەکادێمیك شاکرۆی محۆیان لە ڕوسیا، عومەر شێخ موس لە سوید، پرۆفیسۆر یوسێ بلاو Jouse Blau لە پاریس، پرۆفیسۆر مارتن ڤان Martin von Bruinessen لە هۆڵەندا، دکتۆر مایکل چێیت Michel L. Chyet لە ئەمریکا، میرێللا گالێتی Mirella Galletti لە ئیتاڵیا، دکتۆر حەسەن پوور لە کەنەدا، دکتۆر( یوهانس

مێیەر ئینگڤرسن Johannes Meyer-Ingwersen لە ئەڵمانیا لەگەڵ چەندین زاناو نووسەری تر لەکردنەوەی کتێبخانە بەشدار بوون.

ئەو زانایانەی سەرەوە بەشداری زۆریان لە کردنەوەی ئەم کتێبخانەیە کرد، ئەوانەی سەرەوە لەگەڵ نوێنەرانی فەرهەنگ، لە ١٠ ی ئۆکتۆبەر کتێبخانەیان بە ڕەسمی کردەوە. حکومەتی سوید لە ساڵی ١٩٩٦ مۆڵەتی کردنەوەی کتێبخانەی، لە گەڵ پشتیوانی و یارمەتی ماددی زۆری دا. دوو ساڵی ڕەبەقی ویست بۆ ئەوەی پلانەکەی سەر کاغەز بخرێتە کارەوە، کە خەونی دێرینی هەموو کوردێك بوو. بە گوێرەی قسەی نەدیم لە ساڵی داهاتوو کتێبخانە بودجەی تایبەتی بۆ تەرخان دەکرێ. ئەو بودجەیەش ٧٠٪ پێویستیەکان پڕدەکاتەوە. نەدیم ئەو قسانەی بۆ کردم و کاغەزێکی بە زمانی سویدی پێدام، کە بە درێژی باس لە کردنەوەی کتێبخانەی تێدا نووسرابوو.

لە کتێبخانەدا نزیکەی ٣٠٠٠ کتێب هەن، زۆربەیان بە زمانی کوردین. پلانی داهاتووی نەدیم پەیداکردنی هەموو ئەو کتێبانەیە، کە تەنانەت، یەك وشەشی لە سەر کورد تێدا نووسرابێ! جگە لە کتێب، لە کتێبخانەدا چاپەمەنی و بڵاوکراوە کوردییەکانیش بەرچاو دەکەون. گرنگە بهێنینەوە یاد کە بەشێکی زۆر لەو کتێبانە نووسەران خۆیان پێشکەشیان کردووە و هەندێکی تر کوردەکان داویانە و ئەوانی تریش کڕاون.

دەبارەی کتێب بە زمانی ڕوسی، لە دە کتێبی زۆرتر تێدا نییە. زۆربەش لەوانە شاکرۆی محۆیان لە کتێبخانەی تایبەتی خۆی، لە ئاهانگی کردنەوە پێشکەشی کردبوو. نەدیم هیوا بە ڕۆژنامەی ئێمە دەخوازێ، کە کتێبی کوردناسەکانی ڕوسیای بۆ پەیدابکەین و بهێنین. ئەوەش بە ئەرکی سەرشانی خۆمان دەزانین.( بەڵێنەکەمان بەجێ هێنا. نووسەر). نەدیم پلانی زۆری هەیە بۆ کۆکردنەوەی کتێب و ڕۆژنامە کوردییەکان. بەڵام ئایا پلانەکانی بۆ دەکرێن بە ڕاستی؟

- تا ئەمڕۆ، من کتێبخانەکەم کردەوە، بەڵام پاراستن و مانەوەی لەسەر ئەرك و شانی هەموو کوردێکە. ئاشکراشە هەر من بە بەڕێوەبەری کتێبخانە نامێنم، بەڵام کتێبخانە هەر دەمێنێ! بێشك، پێویستمان بە یارمەتی و پشتیوانی هەیە. ئەو پێمانی گوت. لەم کاتەدا سێ کەس هاتنە کتێبخانە. ئەوان داوای کتێبێکیان کرد، کە نەدیم دە دانەی لێ هێنابوو، بەڵام هیچیان نەمابوو. نەدیم بەڵێنیانی پێدا کە بەم زووانە بۆیان پەیدا دەکا. لەسەر قسەکانمان بەردەوام بووین، پێم خۆش بوو بزانم کێ سەردانی ئەم کتێبخانەیە دەکا؟



- پێش مانگێك ٣٠ منداڵی کورد لە کارلسکرۆنە( نزیکەی ٥٠٠ کم لە شاری ستۆکهۆڵم دوورە)، هاتن سەردانی کتێبخانەکەیان کردین. گرنگ ئەوەیە ئەو منداڵانە، بەڕەنجی شان و بازووی خۆیان پارەی گەشتەکەیان دەست کەوتبوو ئەویش لەڕێگای شت فرۆشتن. بەڵام لەجیاتی ئەوەی پارەکە بۆ ڕابواردن بەکاربهێنن، بڕیاریان دابوو سەردانی کتێبخانەکەمان بکەن. ئەوە بۆ ئێمە گەورەترین بەختەوەریە.

من بەچاوی خۆم بینیم کە دوو کورد هاتنە ژوورەوە لە خۆشیاندا گریان! بەڕێوەبەری کتێبخانە ئەو قسانەی بۆ دەکردین و سەر لە نوێ تەلەفۆن زەنگی لێ بەرز بۆوە.

- لە دووشەمە تا هەینی، کتێبخانەکەمان لە کاتژمێر ١٠ ی بەیانی تا ٥ ی ئێوارە، ڕۆژی شەممان، لە ١٢ تا ١٥ کراوەتەوە. سەردانمان بکەن لەو کاتانەی بۆ ئێوە باشە. بەڵام چاکترە پێش هاتنتان تەلەفۆنمان بۆ بکەن، بۆ ئەوەی قاوەتان بۆ ئامادەبکەین. نەدیم تەلەفۆنەکەی داناو گەڕایەوە لام و داوای بوردنی کرد کە قسەکانمان لەبەر وەڵامی تەلەفۆنەکە پچڕان. ئەو گوتی: ئەوە مامۆستایەکی زمانی سویدیە، دەیەوێ لەگەڵ قوتابیەکانی خۆی سەردانی کتێبخانەکەمان بکەن. بەدوور نازانرێ، لە گرووپەکەی ئەو خوێندکاری کوردیش هەبن.

- ئێمە ئیش بۆ ئەوە دەکەین، کتێبخانەکەمان ببێتە سەنتەرێکی کەلتووری کوردی. ئێستا پێشانگای فۆتۆگرافی بەناوبانگی سوید یوران بێرگێ Göran Börge مان لا کراوەتەوە. هونەرمەندی ناوبراو ئەو وێنانەی لە کوردستان گرتووە. ئەم پێشانگایە تا ١٠ ئۆگۆست بەردەوام دەبێ. دوای ئەو دوو فۆتۆگرافی تریش بۆ نیشاندانی کارەکانیان شوێنیان لامان گرتووە.

لە کتێبخانە ژوورێکی بچووك بۆ منداڵان تەرخان کراوە، منداڵان لە ژوورەکە دەتوانن وێنە بکێشن، یان کتێب بخوێننەوە. جگە لەوانە کۆمپیوتەریشی بۆ میوانان تێدایە. بەم زوانە لە ئینتەرنێتیش مرۆ دەتوانێ لاپەڕەکەی ئەوان بکاتەوە.

لەگەڵ ئەوەی نەدیم زۆر چالاکانە بۆ کتێبخانەی کوردی لە ستۆکهۆڵم کار دەکا، کوردی ناڕازیش لە کارەکانی ئەو هەن. ڕەخنەگران لەو بڕوایەدان، کە نەدیم لە کاری کتێبخانە پسپۆڕ نییە و ئەو پارەیەش کە حکومەتی سوید بۆی تەرخان کردووە، دەکرێ زۆر باشتر سوودی لێوەربگیرێ. من لەبەر ئەوەی جاری یەکەمە لەگەڵ نەدیم ئەوەندە بەیەکەوە قسەمان کرد، بە پێویستم نەزانی پرسیاری ڕەخنە گرانەی ئاڕاستە بکەم، لە لایەکی تریش بەڕای من شەش مانگ کەمە بۆ سەنگی مەحەك!

نەدیم شاعیر و نووسەرە. لە ١٩٨٩ کتێبێکی شیعری بە ناوی ئامەد بەچاپ گەیاند و کتێبی دووەمی لە ساڵی ١٩٩٣ چاپکرد. ئەو کتێبەی لە بیبلیۆگرافیا دەچێ کە ناوی ٢٦٤ کتێبی تێدا هاتوون. نەدیم دەڵێ چەند چیرۆکێکی بڵاونەکراوەشم هەیە.

من پەرداغێکی تر قاوەم بۆ خۆم تێکرد و زۆر بە وردی سەیری ئەو هەموو کتێبانە، گۆڤار و ڕۆژنامەکان، لەگەڵ وێنەکانم دەکرد. بیر دەکەمەوە لەوەی ئەگەر ئەم کتێبخانەیە ٣٠ ساڵ بەر لە ئێستا کرابایەوە، ئەمڕۆ دوور نەبوو هەموو ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکانی تێدا دەبوو! من چەند وێنەیەکی نەدیمم گرت، وێنەی گۆڤار و کتێبەکانم گرت، بە هەمان ڕێگا کە ئێستا باش شارەزای بووم بەرەو ماڵ بەڕێکەوتمەوە.

ڕیپۆرتاژەکە لێرەدا تەواو دەبێ.

لەوانەیە من زۆر جار وشەی (منم) بەکار هێنابێ، بەڵام دیارە بە پێویستم زانیە، بۆ ئەوەی فۆرمێکی ئەدەبی پێبدەم و خوێنەرانیش بۆ گەشتەکە لەگەڵ خۆم ببەم. وەك لە سەرەوەدا نووسیمان ڕێپۆرتاژ لە هەواڵ دەچێ، دیارە هەواڵی ئەم نووسینەش کردنەوەی کتێبخانەکەیە و پاش شەش مانگ گەیشتوونەتە چ ئەنجامێك؟

من دیسان بە درێژی باسم لە چوون بۆ کتێبخانەکە کردیە ئەویش لەبەر ئەم هۆیانە:

١- هەرکەسێك بگاتە ستۆکهۆڵم، بە هۆی ڕێپۆرتاژەکەی من کتێبخانە بدۆزێتەوە. (ئەوە زۆرتر فۆرمی پڕوپاگەندەیە)، بەڵام بەلای من گرنگە کە خەڵك سەردانی ئەو کتێبخانەیە بکاو ببینێ کە چەند کتێب بەزمانی کوردی و لە سەر کورد هەن؟

٢- نزیکی کتێبخانەکە لە سەنتەری شاری ستۆکهۆڵم. ئەمەش نیشان دەدا کە بایەخ بە کورد وەك نەتەوە لە ئەورووپای ڕۆژئاوا کەم تا زۆر دەدرێ.

٣- لە بەر ئەوەی خۆم لە سەرمۆنی کردنەوەکەی بەشدار نەبووم، دەبوایە بە جۆرێتر سەرنجی خوێنەران بۆ ڕێپۆرتاژەکە ڕابکێشم.

جگە لەوانەی سەرەوە هەوڵم داوە ژیانی ئەو کاتژمێرەی لەوێ بووم بە خوێنەران ڕابگەیەنم و لە ڕێگای نووسینەکەشەوە بۆیان ڕوون بێتەوە، ئیشکردن لە کتێبخانە چۆنە؟ وەك گوتم بایەخی زۆرم بە زیندوویێتی ڕێپۆرتاژەکە داوە. دەکرا باسی هۆڵی کتێبخانەکە کەمێك بە درێژتر بنووسم، بەڵام نابێ لە بیر بکەین کە لە ڕۆژنامە گوتاری درێژ بە گشتی کەمتر دەخوێندرێتەوە. من بۆ ڕێپۆرتاژی ناوبراو، سێ وێنەم بەکارهێناوە. یەکیان وێنەی پیلەکەی دوای پردەکەیە، دووەمیان نەدیم سەیری کتێبێك بە زمانی ئینگلیزی لە سەر کورد دەکا، دوا وێنەش هی هۆڵی کتێبخانەکەیە و لەوێدا بۆ خوێنەران چاکتر ئاشکرا دەبێ کە ناو کتێبخانەکە چۆنە؟

لە نووسینی ڕێپۆرتاژ جگە لە نیشاندانی فاکت، بەشداربوونی ڕۆژنامەنووس وەك شایەدێك، شوێنی بیرکردنەوەی ڕۆژنامەنووسیش دەبێتەوە.

ڕۆژنامەنووس بە سێ جۆر دەتوانێ لە سەر ڕووداوەکان بنووسێ:

١- بە چاکە هەڵسەنگاندن.

٢- بە خراپە هەڵسەنگاندن.

٣- بێ لایەنی.

لە ڕۆژنامەکانی سۆڤێتی کەون ڕۆژنامەنووس بەردەوام بە گوێرەی پێویست، حوکمی لە سەر ڕووداوەکان دەدا. ئەگەر ڕێپۆرتاژ لەسەر وڵاتانی سەرمایەداری بوایە، ئەوا بێشك ڕەخنەگرانە سەیری دەکرد و تا شوێنیش هەبوایە دژیان قسەی دەکرد. ئەگەر کردنەوەی فابریکێك بوایە لە شارێکی خۆیان، تا بکرابا بەچاکە باسی دەکرد.

بەڵام لە دەوڵەتانی پێشکەوتوو و دێموکرات، ڕۆژنامەنووس تەنیا فاکتەکان دەخاتە سەر کاغەز. ئەگەر بە چاکەش باسی بکا، ئەوا زۆرتر قسەی یەك لەو کەسانەی ئینتەرڤیوی لێوەرگرتوون دەگێڕایەوە. خۆی وەك بێلایەنێك دەمێنێتەوە.

بەڕای من نیشاندانی فاکت لە نووسیندا چاکترین شێوەیە. بۆ نموونە: ئەگەر بتەوێ بنووسی ئەندامێکی سەرکردایەتی فلانە حیزب خۆفرۆشە! دەکرێ بنووسرێ، خەڵك فلانە ئەندامی سەرکردایەتییان خۆش ناوێ، چونکە لەو بڕوایەدان تائێستاش پێوەندی لەگەڵ ڕژێمی داگیرکەر هەر ماوە! لێرەدا دەبێ یەکێك ببیندرێتەوە کە ئەو قسەیە لە دەمی ئەو دەربچێ. لەو کاتە ڕۆژنامەنووس بە نووسینەکە تاوانبار ناکرێ، چونکە قسەی خۆی نییە و هی یەك لە بەشداربووانی ڕووداوەکەیە. چونکە ڕۆژنامەنووس ڕەخنەگر نییە و کاری ئەو نییە جەماوەر فێری ژیان بکا! بۆ ئەم مەبەستە لە هەموو شارێك و دەوڵەتێك مرۆڤی پسپۆر بەم کارانە هەڵدەستن. ئەوانەش پێش هەموویان سیاسییەکان، کۆمەڵناسەکان، ئابووری زانەکانن. کاری ڕۆژنامەنووس دەبێ تەنیا ئەڵقەیەك بێ لە نێوان سیاسییەکان و جەماوەر. هەرکەسێك لەو سنوورە دەرچوو چاکترە ناوی بنرێ پۆلیس نەك ڕۆژنامەنووس!

# نووسین

رۆژنامە، گۆڤار، ڕادیۆ یان تەلەفزیۆن، شێوەی نووسین و قسەکردنی تایبەتی خۆیان هەیە. بۆ نموونە: نووسین بۆ ڕادیۆ، چاکە زۆرتر ئەو زمانە بەکاربهێنرێ کە زۆربەی خەڵك تێی دەگا. یانی زمانی ئاسان یان زمانی قسە پێکردن. لێرەدا نابێ لەگەڵ بەرنامەی سیاسی کە لە ڕادیۆ پەخش دەکرێ، لێمان تێکەڵ بێ. لە بەرنامەکانی ئەدەبی، سیاسی، لێکۆڵینەوە و ڕەخنەی ئەدەبی، ئەگەر چی ئەوانەی سەرەوە لە بەرنامەی ڕادیۆشن، لەگەڵ ئەوەشدا ڕۆژنامەنووسانی ئەو بەشە دەتوانن بەزمانی ئەدەبی ڕایان دەربڕن، چونکە ئەوان گوێگری تایبەتی خۆیان هەیە. ئەوە هەمان شتە بۆ بەرنامەکانی تەلەفزیۆنیش، بەتایبەتی کە ئێستا بە هۆی تەکنیکی نوێوە، ڕۆژنامەنووس دەتوانێ هەموو تێکستەکە (نووسینەکە) لەسەر شاشەی کامیرای بەرامبەری بخوێنێتەوە، نەك لەسەر کاغەزی بەردەمی.

لەگەڵ ئەوانەشدا بەگشتی زمانی ڕادیۆ و تەلەفزیۆن زیاتر لە زمانی ڕۆژانەی سەر شەقام دەکەن، تا لە زمانی ئەدەبی. ئەوەش زۆرتر لەبەر ئەوەی لە زۆربەی بەرنامەکان چاوپێکەوتنی لەگەڵدایە و زۆر لەبەشداربووانی بە پێویستی نازانن، لەکاتی گفتوگۆ کردندا بە دوای وشەی ئەدەبی و جواندا بگەڕێن. نووسین بۆ گۆڤار یان ڕۆژنامە دەبێ زمانی ڕاگەیاندن بەکاربێ. لێرەش نابێ لێمان تێکەلاو ببێ، نووسینەکە بۆ چ گۆڤارێك دەنووسین؟ گۆڤار وەك ئەوەی ئێمە دەیزانین دەیان جۆری هەیە و چەند نموونەیەك لەو جۆرانە لەخوارەوە دەنووسین:

- گۆڤاری مندالاَن.
- گۆڤاری ئەدەبی.
- گۆڤاری سیاسی.



- گۆڤاری زانستی.
- گۆڤاری ڕەخنە.
- گۆڤاری سپۆرت (وەرزش).
- گۆڤاری تایبەت بە: کشتوکاڵ، جوگرافیا، کۆسمەس، سینەما، وەرگێڕان، خوێندکاران، ژنان، کامیرا، کۆمپیوتەر... هتد.

نووسین بۆ هەر یەك لەم جۆرە گۆڤارانەی سەرەوە، دەبێ ستایلی تایبەتی خۆی هەبێ ئەوەش زیاتر لەلایەن دەستەی نووسەرانەوە بڕیاری لەسەر دەدرێ کە چ جۆرە ستایلێك بۆ گۆڤارەکەیان بەکار دەبەن. (لە زمانە زیندووەکانی جیهان و دەوڵەتە ئازادەکان، دەمێکە نووسین شێوەی تایبەتی خۆی گرتووە و زمانەکەیان بۆتە زمانێکی ستاندارد، بەلاَم بۆ کورد و زمانی کوردی، لەبەر ئەوەی ئازاد نەبووین، زۆر لەم جۆرە گۆڤارانەمان نەبووە، خراپ نییە ئەگەر لەکاتی دەرکردنی گۆڤارێك بۆ نموونە: لەسەر کۆمپیوتەر، دەستەی نووسەران لەگەڵ زمان زانان و پسپۆران لەسەر داڕشتنی وشە یان چۆنیەتی بەکارهێنانی دابنیشن و بەتێری لێکۆڵینەوە و باسی لەسەر بکەن. لەو کۆبوونەوەش بڕیار بدەن ئایا وشە لاتینیەکان وەك خۆی بنووسرێنەوە یانیش ئەگەر بە کوردی بەرامبەری هەبێ، ئەوی بۆ دابنرێ. ئەوانە پرسیاری گرنگن و نابێ پشتگوێ بخرێن).

نووسین بۆ ڕۆژنامە دەبێ بەجۆرێك بنووسرێ کە هەموو کەسێك لەکاتی خوێندنەوەی بە ئاسانی تێی بگا، چونکە ڕۆژنامەنووس مەبەستی لە نووسین، گەیاندنی هەواڵێکە، ڕووداوێکە یان بیرو بۆچوونێکە، بۆ خوێنەران. ئەگەر ڕۆژنامەنووس نەتوانێ مەبەستی خۆی بە زمانێکی ئاسان بۆ خوێنەران دەربڕێ، چاکتر وایە لاپەڕەی ڕۆژنامەی پێ ڕەش نەکرێتەوە. کە دەڵێین ڕۆژنامە مەبەستمان لەو ڕۆژنامانەیە کە لە بازاڕدا دەفرۆشێن و بەئاسانی دەست خەڵك دەکەون.

نووسین جگە لەوەی ڕۆژنامەنووس دەبێ بە وشەی ئاسان بیروڕای بۆ خوێنەران دەربڕێ، نابێ هەناسە هەڵمژینی خوێنەران لە بیر بکا! بۆیە ڕستەی کورت بۆ ڕۆژنامە زۆر پێویستە. نووسەر دەبێ بیر بکاتەوە، کە خوێنەر لە ماوەی یەك هەناسە هەڵمژین، بە ئاسانی پێڕابگا تەواوی ڕستەکە بخوێنێتەوە. (لە خوێندنەوەی هەر بابەتێك بە دەنگی بەرز، گوێگر هەست بە مێلۆدیەك دەکا، کە هەر زمانەو شێوەی دەربڕینی خۆی هەیە. لە کوردی زۆر جار دەگوترێ زمانێکی شیرینە، یان خۆشە. ئەو خۆشە یان ئەو شیرینە لە کاتی نووسیندا دەبێ زۆر بایەخیان

پێ بدرێ. دیاره له قسه‌کردن چاکتر ده‌رده‌که‌وێ، چونکه ده‌ربڕینه‌کان به شێوه‌ی سروشتی دێنه سه‌ر زمان و مرۆڤ بیر له وشه به‌کارهێنان ناکاته‌وه. به‌لاّم ئه‌گه‌ر گوتار به ده‌نگی به‌رز بخوێنرێته‌وه، دوور نییه ئه‌م مێلۆدیه‌ی نه‌بێ، له‌وێش ده‌رده‌که‌وێ، ئایا فاریزه‌و خاڵ له‌شوێنی خۆیان دانراون یان نا؟.

له زۆربه‌ی ڕۆژنامه گه‌وره‌کانی جیهان، جگه له ڕۆژنامه‌نووس، چه‌ند که‌سێکی تریش هه‌ن، ئه‌رکی تریان به ئه‌ستۆوه‌یه وه‌ك: هه‌ڵه‌بژێری، چاککردنی نووسین و داڕشتنه‌وه‌ی، دیزاین و...هتد ئه‌وانه له کاری خۆیان پسپۆڕن و که‌م و کورتی گوتار و نووسینه‌کان چاکتر له خوێنه‌ران ده‌بینن و به چاوێکی تر ده‌یخوێننه‌وه. به هۆی هه‌وڵ و ماندووبوونی پسپۆڕانه‌ی ئه‌وان، ڕۆژنامه‌کان هه‌ڵه‌یان زۆر که‌متر تێده‌که‌وێ.

نموونه‌یه‌ك له‌سه‌ر نووسین و داڕشتنی هه‌واڵ له ڕۆژنامه‌ی "کوردستانی نوێ" له ژماره ١٨٩٩ تایبه‌ت به نێت پێنج شه‌ممه ٨-٧-١٩٩٩ ده‌نووسینه‌وه: له سه‌ر ڕاسپاده‌ی مام جه‌لال (سه‌رناوی هه‌واڵه‌که‌یه)، سه‌ری دێر: **کاره‌با گه‌یه‌نرایه شێخ وه‌سانان** (جارێکی تر سه‌ری دێڕ) سه‌عات چواری ئێواره‌ی دوێنێ ٧-٧ بۆ یه‌که‌مجار کاره‌با گه‌یه‌نرایه گوندی شێخ وه‌سانان، ئه‌مه‌ش به‌رهه‌می هه‌وڵ و ماندوبونی هه‌ردوو فه‌رمانگه‌ی کاره‌بای سلێمانی و ڕانیه بوو له‌سه‌ر ڕاسپارده‌ی هه‌ڤاڵ مام جه‌لال جێبه‌جێ کرا وه‌ك وه‌فاداریه‌ك بۆ خه‌ڵکی تێکۆشه‌ری شێخ وه‌سانان که خاوه‌نی چه‌ندین شه‌هیدن و ساڵی ١٩٨٧ یش کیمیاباران کراوه. به‌م بۆنه‌یه‌وه هه‌ڤاڵ مام جه‌لال له برووسکه‌یه‌کدا پیرۆزبایی له خه‌ڵکی تێکۆشه‌ری گونده‌که کرد و ده‌ستخۆشی له فه‌رمان و کرێکاره ماندوونه‌ناسه‌کانی دائیره‌ی کاره‌بای سلێمانی و رانیه‌ش کرد بۆ ئه‌و کاره خزمه‌ت گوزاریه‌ی پێشکه‌ش به خه‌ڵکی شێخ وه‌سانانیان کرد.

ئه‌مه‌ی سه‌ره‌وه ته‌واوی هه‌واڵه‌که بوو. من له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌دام که پێویسته له‌م جۆره ده‌نگوباسانه زۆرتر بایه‌خیان پێبدرێ و جه‌ماوه‌ری لێ ئاگادار بکرێته‌وه. به‌لاّم له‌نووسینی نه‌ك هه‌ر هه‌واڵ، گوتار، ڕێپۆرتاژ یان هه‌ر نووسینێك چاکه تا بکرێ، وشه زۆر دووباره نه‌کرێته‌وه. که ده‌ڵێین زمانی ده‌وڵه‌مه‌ند، مه‌به‌ست ئه‌وه‌یه که مرۆڤی پسپۆر هه‌وڵ ده‌دا وشه‌ی نزیك له‌و به‌کار بهێنێ. زۆرجار ده‌کرێ ته‌واوی ڕسته‌که به‌شێوه‌یه‌کی نوێ دابڕێژرێته‌وه، ته‌نها بۆ ئه‌وه‌ی له‌وشه دووباره کردنه‌وه نووسه‌ر خۆی بپارێزێ.

له‌هه‌واڵی ناوبراو، جگه له‌وه‌ی یه‌ك فاریزه و یه‌ك خاڵی تێدایه، سه‌ردێره‌که‌شی سه‌قه‌ته. سه‌ردێر نابێ له ڕسته‌یه‌ك پێکبێ که نیوه‌ی به گه‌وره‌یی و نیوه‌ی تری له‌سه‌ری دێره‌وه ده‌ست



پێبکرێته‌وه. ئه‌گه‌ر هه‌موو ڕسته‌که‌ش سه‌ردێر بێ، دیسان بۆ کورته هه‌واڵ زۆره و نابێ ئه‌وه‌نده ڕووبه‌ر له ڕۆژنامه بگرێ. له‌م هه‌واڵه چوار جار ناوی گوندی شێخ وه‌سانان و سێ جار ناوی مام جه‌لال هاتووه. دووباره له‌م هه‌واڵه زۆره. جگه له‌و تێبینییانه‌ی سه‌ره‌وه، هه‌موو هه‌واڵه‌که پێویستی به‌داڕشتنه‌وه‌ی ته‌واو هه‌یه. نووسه‌ری ئه‌م هه‌واڵه یان نه‌شاره‌زا بووه، یانیش زۆر په‌له‌ی له نووسینه‌که کردووه. له نووسینیشدا، به‌هیچ شێوه‌یه‌ك نابێ کار به‌نیوه‌چڵی به‌جێ بهێڵدرێ و دواتریش چاپ بکرێ. زۆر چاکتره نووسینه‌که بلاّونه‌کرێته‌وه. من لێره‌دا هه‌مان هه‌واڵ به‌و شێوه‌ی خواره‌وه داده‌ڕێژمه‌وه:

**(کاره‌بای شێخ وه‌سانان)**، **(کاره‌با له شێخ وه‌سانان)** **(کاره‌با بۆ شێخ وه‌سانان)** **(ڕووناك کردنه‌وه‌ی شێخ وه‌سانان)** یه‌ك له‌و سه‌ردێرانه‌م ده‌کرده ناونیشانی هه‌واڵه‌که، یان ناونیشانێکی ترم بۆی هه‌ڵده‌بژارد که بووبایه ڕه‌نگدانه‌وه‌ی ناوه‌ڕۆکی هه‌واڵه‌که.

"کاتژمێر چواری ئێواره‌ی دوێنێ ٧-٧ -١٩٩٩ له‌سه‌ر داواکاری به‌ڕێز مام جه‌لال کاره‌با گه‌یێنرایه گوندی شێخ وه‌سانان. گوندی ناوبراو ده‌که‌وێته دۆڵی بالیسان و دانیشتوانی له خه‌باتی ڕزگاری نه‌ته‌وه‌که‌ماندا، ڕۆڵی دیاریان هه‌بووه. ئه‌وه‌ش چ له ناندانی پێشمه‌رگه و چ له‌به‌شداری کردنی ڕاسته و خۆ به‌شۆڕشه‌وه. دێنینه‌وه یاد، گوندی ناوبراو له‌به‌هاری ١٩٨٧ ڕژێمی به‌غدا به‌چه‌کی کیمیاوی تۆپبارانی کردن، له ئه‌نجامدا چه‌ند که‌سێکی بێتاوان شه‌هید بوون. کاره‌باچیه‌کانی سلێمانی و ڕانیه به‌م ئه‌رکه گرنگ و پیرۆزه هه‌ڵسان و دانیشتوانی شێخ وه‌سانانیان له تاریکی ڕزگار کرد".

ئه‌وه‌ی من سه‌رله‌نوێ دامڕشته‌وه کورته هه‌واڵه‌که‌یه و خوێنه‌ر ده‌زانێ، به‌فه‌رمانی کێ ئه‌م کاره جێبه‌جێ کراوه؟ چ که‌سانێك به‌م کاره هه‌ڵساون و کاره‌باش بۆ چ گوندێك ڕاکێشراوه. له‌م نووسینه وه‌لاّمی هه‌رسێ پرسیاری (چ ڕوویداوه؟ که‌ی ڕوویداوه؟ له‌کێنده‌ر ڕوویداوه؟) ی تێدایه. له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ڕووداوێکی گرنگه، به‌ڕای من شایه‌نی نووسینی ڕێپۆرتاژێك بوو نه‌ك کورته هه‌واڵ. به‌لاّم که بڕیاردراوه به‌کورته هه‌واڵ بلاّوبکرێته‌وه، له‌وه‌ی من نووسیومه زیاتر پێویست ناکات، له‌سه‌ری بنووسرێ.

نووسین بۆ ڕۆژنامه جگه له‌وه‌ی ده‌بێ به‌زمانی کوردی په‌تی و پاراو بنووسرێ، چاکه تێبینی ڕسته‌ی کورتیشی بۆ بکرێ. داڕشتنی ڕسته‌کانیش ده‌بێ لۆژیکیان تێدابێ، نه‌ك هه‌ر وشه به‌دوای یه‌کتر ڕیز بکرێن، بێ ئه‌وه‌ی هیچ مه‌به‌ستێك ببه‌خشن.

ڕۆژنامەی داگینس نیهێتەری سویدی، کە گەورەترین ڕۆژنامەی بەیانیانی هەموو دەوڵەتانی سکەندەناڤیە، بۆ ئەوەی ڕۆژنامەنووسان، لەکاتی نووسینی ناوی دەوڵەتان و ناوی نامۆ، تووشی هەڵەی زمانەوانی نەبن، کتێبی تایبەتییان بۆ ئاسان کردنی نووسین بەچاپ گەیاندووە. کتێبی ناوبراو بەناوی (زمانی ڕۆژنامە) بەو بە١٤٢ لاپەڕە نووسراوە. زمانی ڕۆژنامە وەك فەرهەنگۆکێکی بچووکە و ئەم بەشانەی خوارەوەی تێدایە: وشە دەربڕین، وشە دارشتن و شێوەی نووسین، ژمارە، فاریزە و پرسیار، خاڵ، ستایل (جۆری نووسین)، ناو لەگەڵ ناز ناو و چەندین بابەتی گرنگی تر کە پەیوەندیان بە نووسین و ڕۆژنامەگەری هەیە. ڕۆژنامەنووس ئەگەر لەکاتی نووسینی پێویستی بەیارمەتی هەبێت، هانای بۆ دەبات. ئەم کتێبە لەساڵی ١٩٩٨ چاپ کراوە.

"بۆ ئەوەی ڕۆژنامەکانمان کەمتر هەڵەی تێبکەوێ، خراپ نییە هەمان ئەزموونی سویدییەکان بەکار بهێنین و لەلایەن شارەزایان فەرهەنگۆکێك بۆ هەمان مەبەست بنووسرێ و بەسەر ڕۆژنامەنووس دابەش بکرێ".

گرنگیەکی تری نووسین لەوە دایە کە ئەو ڕۆژنامە یان گۆڤارە تا چەند توانای ماددی هەیە؟ گوتار هەیە ڕۆژنامەنووس چەندین ڕۆژ خەریکی دەبێ و بۆ بەهێزکردنی نووسینەکەی بەدوای بەڵگەی زۆر دەگەڕێ. ئەمەش چ لە ئەرشیڤی جیا چ لەو کەسانەی لەبابەتەکە بەشدارن و شارەزان. هەرچەندە زۆر لەم گوتارانە زیاتر بۆ گۆڤار دەنووسرێن، بەلام ڕۆژنامەش لەم نووسینانە بێ بەش نییە. یان ڕوو دەدا کە ڕۆژنامەنووس ناچار دەبێ سەردانی چەند دەوڵەتێك بۆ بەدەستهێنانی دەکۆمێنت و زانیاری تەواو لەسەر بابەتی دیارکراودا. بکا ئەم جۆرە گوتارانە بەپارە گران دەوەستن.

لەگەڵ ئەوانەشدا، نووسین زۆرتر پەیوەندی بە ڕۆژنامەنووسەوە هەیە وەك: ئایا ئەم هەموو فاکتانەی لەسەر بابەتی دیارکراو کۆی کردوونەتەوە بەسن یان نا؟ ئایا گوتارەکە شایەنی بلاوکردنەوەیە یان نا؟ ئایا نووسەر توانیویەتی مەبەستی خۆی لەیەك گوتاردا بۆ خوێنەران دەربڕێ؟ ڕۆژنامەنووس کە زانی ئەرکی پیشەیی خۆی بەجێ گەیاندووە و نووسینەکەی سوودی بۆ خوێنەران دەبێ، دەتوانێ بۆ دواجار بە خەتێکی خۆش لەسەر یەك ڕووی لاپەڕە بۆ ڕۆژنامە بنێرێ یان ببا. زۆر چاکترە ئەگەر نووسینەکە بە کۆمپیوتەر بنووسرێ، چونکە لەوکاتە گوتارەکە تەواو بەشێوەی تر بەرچاو دەکەوێ، لە هەڵەی چاپیش دوورتر دەکەوێتەوە.

نووسینی ناو، نازناو، شار و گوند، دەبێ بەڕاستی بنووسرێن. شەرم نییە ئەگەر ڕۆژنامەنووس لە کەسی بەرامبەری بپرسێ ناوت چۆن دەنووسرێ؟ یان ناوی گوند، شارۆچکە



یان شارەکەت چۆن دەنووسرێ؟ لە ڕۆژنامە بەهیچ شێوەیەك بۆیان نییە ناو بەویستی خۆیان بگۆڕن یان ناوی زیادەی بخەنە سەر.

**نموونەی دیکە لە پێوەندی نێوان ڕۆژنامەنووس و سەرنووسەر:**

سەرنووسەر دەڵێ تکایە گوتارێکی چاك دەربارەی هەواپەیمایی بنووسە، تەواو جیایە لەوەی ئەگەر سەرنووسەر بڵێ ڕیپۆرتاژێ لەسەر فلانە فڕۆکەوان بنووسە. لە داواکاری دووەم ڕۆژنامەنووس زۆر چاکتر تێدەگات لەوە کە سەرنووسەر چ جۆرە نووسینێکی لێ داوا دەکا.

**ڕووداو چییە:**

**یەك:** دوێنێ نیو ملیۆن کرێکار ڕژانە سەر شەقامەکان و داوای بەرزکردنەوەی مووچەیان دەکرد.

**دوو:** لە کۆبوونەوەی دوێنێ حکومەت بڕیاری دا مووچەی دکتۆر و مامۆستایان بەرزبکاتەوە.

**سێ:** کرێکارەکانی چاپخانە کتێبی نوێیان بۆ وەزارەتی پەروەردە چاپ کرد.

**چوار:** د.بەرهەم ساڵح لە دوا گەشتی بۆ دەوڵەتانی ئەوروپا گەیشتە فەرەنسا.

هەر لە بینینی سەرپێی جاری یەکەم بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە ڕۆژنامەنووسی یەکەم باس لە کۆمەڵە کەسێك دەکات کە ئامانجی دیاریان هەیە چونکە:

**یەك:** بەرزکردنەوەی مووچەیان، دەکاتە بەرز کردنەوەی باری ژیانیان.

**دوو:** باس لە گرووپێکی بچووك دەکات کە حکومەتە. بڕیاردانی ئەوان تایبەتە بە کەسانێك. چاککردنی باری ژیانی ئەوان بەدوور نازانرێت کە ببێتە هۆی باشکردنی ئاستی فێرکردن و بەرزی باری ژیانی قوتابیان.

**سێ:** باس لە چاپکردنی کتێبی نوێ دەکات، ئەوەش ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە قوتابیانەوە هەیە، کە ئەو ساڵ هەر یەکەو کتێبی خۆی دەدرێتێ.

**چوار:** پەیوەندی تەنیا بەیەك کەسەوە هەیە و کەچی ئەنجامی گرنگە، لە لایەك بۆ ئەو یانی دکتۆر بەرهەم لە لایەکی تر بۆ جەماوەر و گەلانی کوردستان.

لەوانەی سەرەوە دەزانین کە وەلامی ئەم پرسیارانە دراونەوە وەك چ ورویدا؟ کەی ڕوویدا؟ لە کوێندەر ڕوویدا؟

**ڕۆژنامەنووس هەڵدەبژێرێت:** تەنیا فاکت بنووسێت، لایەنی تر بەجێ بهێڵێ، یانیش ڕۆژنامەنووس ئەوانە هەڵدەبژێرێت وەك: گرنگترین شت، سەرنجڕاکێشترین شت، نامۆترین شت،

ڕوونترین شت. گرنگترین شت لێرەدا ئەوەیە کە جەماوەر تەنیا یەك لایەنی ڕووداوەکە دەبینێت، لەو لایەنەشەوە فاکتەکە حوکم لەسەر دنیا و دەوروبەر دەدات.

پرسیاری ئۆبیەکتیڤ (مەوزوعیەت) لە نووسین، بەم دوایانە، وەك پرسیاری چۆنایەتی ڕۆژنامەنووس بەرز دەبێتەوە. ئەوەی زۆر بەلایەنی ڕۆژنامەنووس دەبێ گرنگ بێ، ئەوا تەکنیکی نووسینەکەیە، کە دەکاتە ئاشکراکردنی فاکتەکانی (ڕاستییەکانی) ناو ڕووداوەکە. شێوەی پرسیارکردن، زۆرجار دەبێتە گرنگتر لە ناوەرۆکی پرسیارەکان. وەك ئەوەی لە ڕووداوێکی دڵتەزێن، زۆرجار یەکێك یان دوویان دەبنە قارەمانی ڕووداوەکە و ڕۆژنامەکان هەر باسی ئەوان دەکەن. بەقسەی زانای ڕاگەیاندن ماریانا گێرستی Marina Ghersetti چاکتر وایە، ئەو پرسیارانە لە بەرنامەکانی تەلەفزیۆن بەرزبکرێنەوە، کە خەڵك خۆی لەناو پرسیارەکان، دەدۆزێتەوە. ئەوەش زۆرتر ئەو چیرۆکەمان بۆ دەگێڕێتەوە، کە لایەنی باشە سەردەکەوێت و لایەنی خراپەش ژێردەکەوێت[1].

هەندێك زانا لەوەش زیاتر لە نووسینەکانیان قووڵ دەبنەوە، بەوەی کە ڕۆژنامەنووسان، زیاتر چیرۆکمان بۆ دەگێڕنەوە. ئەوەش دەکاتە سەر شێوەی تەکنیکی نووسینەکە لەسەر بابەتی دیارکراو.

سەرنووسەر بۆی هەیە سەرلەنوێ نووسینەکە دابڕێژێتەوە، کورتی بکاتەوە، تا ڕاددەیەك دەستکاری نووسینەکەش بکات، بەمەبەستی زمانەوانی یان ستایل گۆڕین. لە کوردستان لەبەر ئەوەی ڕۆژنامەنووسی چاك و پسپۆر کەمن، بۆیە دەستەڵاتی سەرنووسەر لەوانەیە کەمێك زۆرتر بێ.

**ڕۆژنامەنووس هەرچەند زۆرتر خۆی بەنووسینی دروست خەریك بکا و بایەخی پێبدا، ڕۆژنامەکەی زۆرتر بەرەو پێشەوە دەچێ و خوێنەری زۆرتری دەبێ. ئێمە قەت ناتوانین بیر لەدەرکردنی ڕۆژنامەیەك بێ نووسین بکەینەوە، کە دەشنووسین، دیارە بۆ خوێنەرانە. بۆ ئەوەی ڕێز زۆرتر لە خۆمان و لە خوێنەران بگرین، دەبێ زۆرتر بایەخ بەنووسین و ناوەرۆکەکەی بدەین. ئەگەر بەم شێوەیەی سەرەوە کار بکەین، بێگومان دەبینە خاوەنی ڕۆژنامەیەك کە زۆرترین خوێنەری دەبێت.**

---

1. Stig Hadenius, Lennart Weibull, Massmedier. Falun, 2003.p.378.

## وێنە بۆ ڕۆژنامە

پێش ئەوەی باس لە گرنگی وێنە بۆ ڕۆژنامە بکەم، بە پێویستم زانی خوێنەران کەمێك لە سەر کارکردن بۆ دروستکردنی کامیرا و هونەری وێنە گرتن ئاگادار بکەمەوە.

**ئاوڕێك بۆ پاشەوە...**

ژۆزێف نیسێڕۆف نێپس لە ٧ مارتی ١٧٦٥ لە شالۆنی نا سۆنی لە فەرەنسا لەخێزانێکی دەوڵەمەند لەدایك بووە. لە تەمەنی ٦٨ ساڵیدا یانی ٥-٧-١٨٣٣ کۆچی دوایی کرد. نێپس یەك لەو کەسانەیە کە بۆ یەکەم جار، لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەیەکی زۆر توانی وێنە بە کامیرای ئەبسکورە بگرێ. مانای وشەی کامیرا بەکوردی دەکاتە ژوور، ئەبسکورە دەکاتە تاریك. نێپس لە نامەیەکی کە لە ٦ مایسی ١٨١٦ بۆ کلۆدی برای نووسیوە دەڵێ: لەسەر کاغەز کۆریتی مریشکەکان و چوارچێوەی پەنجەرەکانم دەست کەوت. ئەو لەسەر نامەکەی بەردەوام دەبێ و دەنووسێ: بەلآم ئەمە زۆر دوورە لەو ئەنجامەی کە پێویستە. وێنەکە زۆر بێهێزە، لێت ناشارمەوە کە هێشتا ماندووبوونێکی زۆری ماوە، تۆش دەزانی بەهیلاکی و زۆر و پشوویەکی فراوان، مرۆڤ دەتوانێ زۆر شت بکا(١).

بە گوێرەی سەرچاوەی پێشوو، نێپس لەگەڵ کلۆدی برا گەورەی پێوەندییان زۆر بە هێز بوو. ئەم دوو کەسە نەك هەر وەك دوو برا بەڵکو وەك دوو برادەریش لەیەك نزیك بووین. ئەوان بەردەوام لەکاتی لەیەك دابڕانیان بەڕێگای نامە، هەواڵی یەکتریان زانیوە و نێپس هیچ سەرکەوتنێکی لە برا گەورەکەی خۆی نەدەشاردەوە.

---

1. И.А.Головня، С чего началасъ фотография. М.، 1991- С.5.

لە نامەیەکی تر نێپس بۆ هەمان برای لە ٧-٨-١٨٢٥ دەنووسێ: ئەگەر ڕووداوێکی چاوەڕێ نەکراوم نەیەتە سەر ڕێگا، بەپشتیوانی خودا، ئەنجامی پێویست دەست دەکەوێ و لەو کاتە دەتوانم وێنەی سروشت بگرم. ئەمەش دەکاتە گرنگترین مەبەستی ئەم دۆزینەوەیەم[1].

پاش هەوڵ و تەقەلای زۆر زانای بەناوبانگ، نێپس لەساڵی ١٨٢٦ توانی یەکەمین وێنەی، کە بەکامێرای ئەبسکورەی خۆی گرتبوو، لەسەر کاغەز دەستی بکەوێ. نێپس جگە لە برا گەورەی بەردەوام دوو کەسی تریشی لە لێکۆڵینەوەکانی ئاگادار دەکردەوە.ئۆپتیك شێڤالیێ لەگەڵ نیگار کێش لێمێتار Lemetar نێپس چەند عەدەسەیەکی لەلایەن شێڤالیێ بۆ کامێراکەی بەڕادان دا. لە ١٨٢٦ شێڤالیێ بینی کارەکانی نێپس بەرەو سەرکەوتن دەڕۆن، بەلاّم لەهەمان کاتیشدا دەیزانی جگە لەو دەگۆریش خەریکی دۆزینەوەی وێنە گرتن بوو. بۆیە شێڤالیێ بەپێویستی زانی بەیەکتریان بناسێنێ.

لە سەر داواکاری شێڤالیێ، دەگۆر لەمانگی یەکی ١٨٢٦ نامەیەك بۆ نێپس دەنووسێ و تێیدا دەڵێ: من کاتێکی زۆر لەگەڵ کامێرای ئەبسکورە بەسەر دەبەم، بۆ ئەوەی بتوانم وێنە بگرم و ئەنجامی چاکم دەستبکەوێ. لەهەمان نامەدا دەگۆر داوای زانیاری گۆڕینەوە لەسەر هەمان بابەت لەنێپس دەکا و ئەویش ڕازی دەبێ.

لە ١٤-١٢-١٨٢٩ لە نێوان ئەم دوو زانایە نامەیەکی ١٣ بەندی ئیمزا کرا. زۆر کەس ئەم ڕۆژە بەلەدایك بوونی وێنەگرتن لەقەڵەم دەدەن!

**خاڵە گرنگەکانی ئەم نامەیە:**

١- نێپس و دەگۆر بە هاوڕێیەتی لە کۆمپانیای نێپس- دەگۆر کار دەکەن.
٢- ماوەی کارکردنی ئەم سەنەدە دە ساڵە.
٣- پاش ئیمزا کردنی ئەم دەکۆمێنتە، نێپس دەبێ بڕوای بەدەگۆر هەبێ بۆ نهێنی پاراستن.
٤- ئاشکرا نەکردنی نهێنییەکەیان و هێشتنەوەی بەنهێنی.
٥- دەگۆر دەبێ بڕوای بە نێپس هەبێ بۆ پاراستنی ئەم نهێنییە.

١. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٦١.



بۆ ئەوەی نهێنیەکە بەهیچ لایەك بلاّونەبێتەوە، هەردووکیان بڕیاریان دا لەنامە نووسین، شفرە بەکار بهێنن. کلیلی شفرەکەش تەنها لەلای ئەم دوو زانایە هەبوو. هاوکاری بەینی هەردووکیان بەردەوام بوو تامردنی نێپس لە ٥-٧-١٨٣٣. دوای مردنی نێپس ئیسیدۆری کوڕی لەهاوکاری کردن لەگەڵ دەگۆر بەردەوام بوو. ئەوانیش دوو جار سەنەدی نوێیان لە نێوان خۆیان ئیمزا کرد. دەگۆر پاش مردنی نێپس، لە بەڵێنەکانی خۆی پەشیمان بۆوە و بڕیاریدا لێکۆڵینەوەکان بەناوی خۆی ئاشکرا بکا. ئەوەش وای لێکرد ناوی کۆمپانیاکە بکا بە دەگۆرەتیپ. (بە گوێرەی سەنەدی یەکەم کۆمپانیا دەبووایە ناوی نێپس- دەگۆر بوایە) دەگۆر لە نامەیەکی کە لە ٢-١-١٨٣٩ بۆ ئیسیدۆر دەنووسێ: لەکۆتاییدا توانیم لەگەڵ ئەراگۆدا دابنیشم، ئەو بڕوای بەداهێنانەکەم هێنا. ئەراگۆ لای چاکبوو داهێنانەکەم بەدەوڵەتی فەرەنسی بفرۆشم. هەر ئەویش داهێنانەکەم لەگەڵ خۆی بۆ پەرلەمان دەبا. من تائێستا چەند ئەندامێکی پەرلەمانم بینیوە کە پشتگیری تەواو لەمن و ئەکادێمێك ئەراگۆ دەکەن. بەڕای من بەم ڕێگایە سەرکەوتنی زۆر بەدەست دێنین. لەدوو شەممەی داهاتوو ئەراگۆ چەند کەسێکی ئەکادێم بۆ لام دەنێرێ و من دەگۆرەتیپیان بۆ ڕوون دەکەمەوە و ئەوانیش بەڕێگای خۆیان بۆ ئەندامانی پەرلەمانی باس دەکەن[1].

## دەگۆر تیپ و ئەکادیمیای فەڕەنسی

لە ١٧-١-١٨٣٩ دەگۆر لە کۆبوونەوەیەکیدا لەگەڵ ئەکادێمیکەکان باس لەداهێنانی دەگۆرەتیپ بۆ ئامادەبووان دەکا. هەر لەم کۆبوونەوە بەشداران ئاگادار دەکاتەوە کە وێنە بەدەگۆرەتیپ لە ماوەی ٨- ١٠ خولەك دەگیرێ و لەسەر کاغەز چاپ دەکرێ. ئەو دەگۆرەتیپ زۆر باش هەڵدەسەنگێنێت و پەنجەش بۆ کارەکانی نێپس ڕادەکێشێ. (ئەمڕۆ زۆر کەس ئەم ڕۆژە بەلەدایك بوون و دۆزینەوەی وێنەگرتن لەجیهان دادەنێن. ئەوە بوو لە کۆبوونەوەی ئەکادێمیکەکان کە لە ٧-٩-١٨٣٩ کرا، بڕیاردرا وێنەگرتن بەڕێگای ڕۆژنامە و گۆڤارەکان بۆ جەماوەر ئاشکرا بکرێ. لە ١٩-٨-١٨٣٩ ئەکادێمیای زانست لەگەڵ ئەکادێمیای هونەر کۆبوونەوەیەکی تایبەتیان لەسەر وێنەگرتن بەست. ئەراگۆی فیزیك باسی هونەری دەگۆرەتیپی بۆ ئامادەبووان کرد. هەر لەو کۆبوونەوەش بڕیاریاندا کە ئەمە گەورەترین دۆزینەوەی سەدەی

١. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٦٠- ٧٠.

نۆزدەمە و ناویشیان نا فۆتۆگرافی. لەهەمان کات لوی فلیپ و وەزارەتەکەی پشتگیری تەواوی خۆیان لەم دۆزینەوە کرد.

پاش ئاشکرا کردنی دەگۆرەتیپ ناوی دەگۆر بەهەموو پاریس بلاوبۆوە و ڕۆژنامە و گۆڤارەکان بەردەوام لەسەریان دەنووسی. زۆری نەخایاند، دەنگی وێنەگرتن گەیشتە هەموو ئەوروپا، ئەمەریکا دواتر زۆربەی دەوڵەتانی جیهان. دەگۆر ناوی وەك قارەمان دەهات و زۆربەی زانکۆکانی ئەوروپی دکتۆرای فەخریان بەدەگۆر دا. هەر لەو کاتە پلۆساکی زانا گوتی: ئەمە کارێکی ئازادە و لە ماوەیەکی کەمدا ڕۆڵێکی گرنگ لەناو کۆمەڵدا دەگێڕێ. دەگۆر بۆ ئەوەی کاری وێنەگرتن بۆ جەماوەر ئاسان بکا، لە ٢٠ -٨ -١٨٣٩ نامیلکەیەکی بچووکی لەسەر هونەری وێنەگرتن نووسی. لەم نامیلکەیەدا باس لە وێنەگرتن و شوشتنەوەی دەکاتن. ئەمە یەکەمین نامیلکەیە لە جیهان کە لەسەر وێنە گرتن و شوشتنەوەی نووسرابێ. هەر زوو هەندێك لە زانایان لەو بڕوایە دابوون کە وێنە دەتوانرێ لەزۆر مەیاندا سوودی لێوەربگیرێ وەك: مێدیسین، فەلەك، ئەرکیۆلۆژی...هتد.

دەگۆر لە کۆتایی ساڵەکانی ژیانیدا هیچی تری نەخستە سەر هونەری وێنەگرتن. بەلاّم وەك قارەمانێکی فەرەنسی مایەوە تا لە ١٠-٦-١٨٥١ لە تەمەنی ٦٣ ساڵیدا کۆچی دوایی کرد. لە ١١-٢-١٨٥٢ پەیکەری دەگۆریان لەسەر گۆڕەکەی داناو خەرجی پەیکەرەکەش جەماوەر کۆیکردبۆوە. دوای پەیکەری یەکەم، لە شارەکەی خۆشی پەیکەریان بۆ دانا.

**تالبۆت و دۆزینەوەکانی بەکامیرای ئەبسکورە**

لە بواری وێنەگرتندا هاوکات لەگەڵ دەگۆر و نێپس دا، زانای بەریتانی ویلیام هێنری تالبۆت خەریکی لێکۆڵینەوە بوو بۆ بەدەست کەوتنی هەمان مەبەست. ئەوە بوو لە ٢٥-١-١٨٣٩ یانی تەنیا ١٨ ڕۆژ پاش پێشکەش کردنی دەگۆرەتیپ لەلایەن ئەراگۆدا لە پاریس، تالبۆت پێشانگایەکی فۆتۆگرافی خۆی لە کتێبخانەی مەلەکی لەندەن کردەوە. لەو پێشانگایەدا هەموو ئەو وێنەو کامیرانەی تێدا بوو کە تالبۆت لەسەر وێنەگرتن هەی بوون و بەکاری هێنابوون. لەهەمان پێشانگا چەند وێنەو نێگەتیڤی ١٨٣٥ ی تێدا بوو. لەو کاتە تالبۆت نامەیەکی بۆ ئەکادێمی بەناوبانگی فەرەنسی ئەراگۆ بەرێ کرد، لە نامەکەیدا داوای کرد کە دان بەداهێنانەکەی ئەو دابنێن. بەلاّم ئەراگۆ زۆر دژی داواکاری تالبۆت وەستا و لە وەلاّمی نامەکەیدا نووسی کە ئەو لەساڵی ١٨٣٣ وێنەی دەگۆری بینیوە. لێرەدا دەردەکەوێ



کە ئەراگۆ باش ئاگاداری لێکۆڵینەوەکانی نێپس نەبووە و نەیزانیوە کەئەو لە ساڵی ١٨٢٦ ئەنجامی باشی دەست کەوتووە و توانیویەتی وێنە لەسەر کاغەز چاپ بکا. دیسان لەم وەلاّمەدا بۆمان دەردەکەوێ، کە دەگۆر سەرکەوتن و ئەنجامەکانی نێپسی وەك خۆی باس نەکردووە. نێپس پاش مردنی مافی خوراوەو لەزۆر شت بێبەش کراوە. ئەو مووچەی کە دەوڵەتی فەرەنسیش بۆ ئەو دوو زانایە بڕیبوویەوە بەشی زۆرتریان دەگۆر وەری دەگرت.

تالبۆت لە وێنەگرتندا زۆر شتی نوێی داهێنا، وەك: بۆ یەکەمین جار لە مێژووی وێنەگرتندا توانی وێنە گەورە بکا.

**ئەنجامێك و هەوڵی جیاجیا لە سەر کامیرای ئەبسکورە**

لێرەدا پرسیارێکی گەورە هاتۆتە پێشەوە وەك: بۆ یەکەمین جار لەکامە دەوڵەت وێنە گیراوە و کامیرا دروست کراوە؟ لە وەلاّمی ئەم پرسیارەدا هەر دەوڵەتێك بۆچوونی خۆی هەیە. بەلاّم ئەوەی تائێستا ئاشکرا بێ، ئەوا بەڕای من فەرەنسایە. بەریتانیا و ئەڵمانیاش ولاّتی خۆیان بەیەکەم ولاّت لەدۆزینەوەی هونەری وێنە گرتن لەقەڵەم دەدەن.

**چەند نموونەیەك دەهێنینەوە:**

- **ئەڵمانیا:** فرانج فۆل لەگەڵ کارل سێتین هێیل، پێش مانگی ١ ی ١٨٣٩ توانیویانە وێنە بەکامیرای ئەبسکورە بگرن و بشۆنەوە و چاپیشی بکەن.
- **سویسرا:** فرێدریك هێبەر لە ٢-٢-١٨٣٩ توانیویەتی وێنەی لەسەر کاغەز بەکامیرای ئەبسکورە دەست بکەوێ.
- **هەنگاریا:** پێچڤال لەمانگی ٥ ی ١٨٤٠ ئەنجامی باشی لە هونەری وێنەگرتن دەستکەوتووە.
- **فەرەنسا:** جگە لەو دوو زانایەی فەرەنسی کە لەسەرەوە ناومان هێنان ئیپۆلیت بریاد لە ٢٠-٣-١٨٣٩ نێگەتیڤی دەست کەوتووە.

لە ڕوسیا و ئەمەریکا و چەندین دەوڵەتی تر زانایان خەریکی هەمان لێکۆڵینەوە بوون. ئەو زانایانەی سەرەوە، ئاشکرایە هەر کەسە و لای خۆی خەریکی بەدەست هێنانی ئەنجامی باش بوون لەبەرەو پێشەوە بردنی وەك:

- کامیرا بچووك کردنەوە.
- کامیرا لەسەر سێ پێ دانان.

- خێرا کردنی پرۆسیسی وێنەگرتن و شوشتنەوە و چاپکردنی.
- چۆنایەتی کاغەز لەگەڵ نێگەتیڤ چاك کردن.
- وێنەی ڕەنگی چاپکردن.
- هەوڵدان بۆ گرتنی وێنەی جووڵێنەر.

**هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی کامیرای سینەمایی**

لە پەنجاکانی سەدەی نۆزدە، وێنە گرتن بوو بەکارێکی ئاسایی و سەدان هەزار کامیرە لە ماڵەکان و ستۆدیۆکان پەیدا بوون. هەر لەچلەکانیشەوە وێنە گرتنی پاشا و وەزیر و خەڵکی ئەرستۆکرات و دەوڵەمەند دەستی پێکرا. دواتر توانرا وێنە لە مەیدانی زانستیش بەکار بهێنرێ، بەلاّم بۆ کتێب و ڕۆژنامە و گۆڤار هێشتا نەدەتوانرا سوودی لێوەربگیرێ.

لە کتێب و ڕۆژنامە و گۆڤارەکان، بەشێوەیەکی سەرەتایی و کاتی توانرا سوود لە وێنە بگیرێ. ئەویش بەوەی کە شوێنی وێنەکەیان بەبۆشی دەهێشتەوە و دوای بەچاپگەیاندنی (زۆرتر کتێب) وێنەکەیان بەکەتیرە لەشوێنی دیارکراو دەچەسپاند.

ئەم پرۆسێسە دەیان ساڵی خایاند، تا توانرا کلێشەی وێنە لەسەر زەنگ دروست بکەن و لەهەمان کات لەگەڵ کتێب، گۆڤار و ڕۆژنامە وێنەکە لەشوێنی پێویست چاپ بکەن.

ئەگەرچی وێنە گرتن بەدەگۆڕەتیپ، شۆڕشێکی گەورە بوو، بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا، بێ کەم و کورتی نەبوو.

لەساڵی ١٨٤٩ لەلایەن برێوستەر Brewster و لەساڵی ١٨٥٣ لەلایەن یوهن دانسەر John Danser کامیرای ستریۆ دروست کرا. بەهۆی ئەم کامیرایەوە، بۆ یەکەم جار توانرا وێنەی جووڵێنەر بگیرێ. لە سەرەتای حەفتاکاندا، چەند زانایەکی تر توانییان وێنەی جووڵێنەریان دەست بکەوێ و ئەمەش یەکەم هەنگاو بوو بۆ بیرکردنەوە لە کامیرای سینەمایی.

وێنەی جووڵێنەر بەچەند شێوەیەك لەلایەن چەند فۆتۆگرافێکەوە گیراوە. هەر یەك لەو فۆتۆگرافانەش ڕێگای تایبەتی خۆی هەبوو. لێلاند ستانفۆرد Leland Stanford لە کالیفۆرنیا، بۆ ئەوەی وێنەی جووڵێنەری دەست بکەوێ، ١٠-١٢ کامیرای لەیەك کاتدا بەکار هێنا. لەپێش کامیراکان ئەسپێك غار دەدا. ئەسپەکە بەپێش هەر کامیرایەك ڕەت دەبوو. وێنەیەکی دەگیرا. دواتر نێگەتیڤەکان دەشواتەوە و لەسە کاغەز چاپیان دەکا، لەئەنجامدا وەك ئەوەی لەسەرەوەدا باسمان کرد، ستانفۆرد تا ڕاددەیەك وێنەو فیلمی جووڵێنەری دەست کەوت.



ماریێی Marey بۆ گرتنی وێنەی باڵندە لەکاتی فڕینی، کامیرایەکی لەساڵی ١٨٨٢ لەشێوەی تفەنگ دروست کرد. بەهەمان کامیرا توانی وێنەی جووڵێنەری باڵندە فڕیوەکەی بەئەنجامی زۆر باشەوە دەست بکەوێ.

هەنگاوی تری هەمان فۆتۆگراف ئەوە بوو کە ئەسپێك بەسوار غار دەدا و لە تەنیشت ئەسپەکەش هێڵی ئاسن وەك هێڵی شەمەندەفەر دروست کراوە و پەیتوونێکی لەسەر دانراوە. ئەسپێکی تر پەیتوونەکە ڕادەکێشێ و کابرای فۆتۆگرافیش لەسەر پەیتوونەکەیە و کامیرای بەدەستەوەیە. لەیەك خێراییدا هەردوو ئەسپەکە بەتەنیشت یەکەوە غار دەدەن و فۆتۆگرافەکەش وێنەی ئەسپ و سوارەکە دەگرێ. بەم شێوەیە فۆتۆگرافی ناوبراو ئەنجامی زۆر چاکی لەگرتنی ئەم فیلمەی دەست دەکەوێ."تا ئێستاش لەکاتی گرتنی فیلمی سینەمایی هەمان پرینسیپی Marey بەکار دێنن. ئەوەش بەدروستکردنی هێڵی ئاسن بۆ کامیرا لەسەر دانان. بۆ ئەوەی لەکاتی فیلم گرتن کامیراکە نەجووڵێ."

**سەرهەڵدانی فیلمی دەکۆمێنتی**

یەکەمین فیلمی سینەمایی کە تا ئەمرۆ لە لایەن زانا و پسپۆرانەوە بەناوبانگە، لەلایەن برایان (لویس ئیمێرێ Luis Iumiere لە ٢٨-١٢-١٨٩٥ لە قاوەخانەی گراند لەپاریس لەسەر شاشەی پەرۆك نیشان درا. درێژی فیلمەکە چەند خولەکێکە. جووتە برا فیلمی دەوروبەری خۆیان گرتبوو. ئەو شتانەی ڕۆژانە هەموو کەسێك لەو سەردەمەدا لەپاریس دەیبینی. فیلمەکە بەم شێوەیە دەست پێدەکا:

- کرێکارەکان لەکارگە دێنە دەرەوە.
- شەمەندەفەرێك دەگاتە وێستگا.
- چەند منداڵێك نان دەخۆن.

ئەگەر لەبابەت و ناوەڕۆکی فیلمەکە ورد ببینەوە، بۆمان دەردەکەوێ، برایان شێوەی ژیانی خەڵکی پاریسمان نیشان دەدن. ئاشکراشە کە بابەتی ئەم فیلمە کۆمەلاّیەتییە. دەشزانین وێنەگر چۆن جیهان و دەوروبەر دەبینێ، چاوی کامیراش وای دەگرێ. لە سەر ئەم فیلمە کورتە، خەڵکی زۆر لەو بڕوایە دابوون، کە ئەم جۆرە فیلمانە لە داهاتوودا سوودی زۆریان بۆ کۆمەڵ دەبێ و جەماوەری زۆر سەیریان دەکا. یەك لەوانە جۆرج مێلییێس Georgs Melies بوو کە گوتی، ئەم جۆرە فیلمە ڕاستییانە (واقعی) لە داهاتوودا دەتوانرێ سوودی لێوەر بگیرێ.

له سەرەتای پەیدابوونی سینەما، لەلایەك فیلمەكان ڕەش و سپی بوون، لەلایەكی تریش بێدەنگ بوون. بۆ ڕەنگی فیلمەكان جارێ هیچ چارەیەك نەبوو، بەڵام بۆ دەنگ بەم شێوەیەی خوارەوە پینەیان كردبوو:

١- نووسین (تێكست) لەسەر شاشەی پەڕۆك دەنووسرا. ئەگەر چی لەكاتی پەیدابوونی تێكست لەسەر پەڕۆك، وێنەكان ون دەبوون، بەڵام بۆ ئەو كاتە چارەسەرێكی خراپ نەبوو، هەرچەندە لەلایەك فیلمەكە مردار دەبوو، لەلایەكی تریش تەنیا خوێندەوارەكان لە مەبەستی ڕاستی فیلمەكە دەگەیشتن.

٢- ئەكتەرەكان لە پشت شاشەوە دەوەستان و تێكستی فیلمەكەیان دەخوێندەوە.

له جۆری دوودا فیلمەكانی سینەما زۆر لە شانۆگەرییان دەكرد. یەك لەجیاوازییە زەقەكان، لە سینەما فیلمی دەرەوەی هۆڵەكەشیان گرتبوو، یانی بینەر لە ژوورەوە دادەنیشت، كەچی دەرەوەی دەبینی. ئەم بینینە بۆ ئەو كات ڕووداوێكی زۆر گەورە بوو.

دەربارەی مۆسیقاشەوە، ئەوا چۆن لە شانۆگەرییەكان، تیپی مۆسیقای لێبوو، بەهەمان شێوەش سینەماكان تیپی مۆسیقای خۆیان هەبوو. ئەم مۆسیقاژەنانە بەگوێرەی فیلمەكە نۆتەیان دەنووسی و لەكاتی نیشاندانی فیلمەكە مۆسیقایان لێدەدا.

لەساڵی **١٩٢٣** بۆ یەكەم جار توانرا مۆسیقا و دەنگ لەگەڵ فیلم پێكەوەبێ. بەڵام تەنها لەساڵی **١٩٢٧** توانرا دەنگ بخرێتە سەر فیلم. لەم ماوەیەدا گۆڕانكارییەكی زۆر بەسەر سینەما داهات و فیلمی باشتر بۆ كامێراكان دروست كران، چۆنایەتی كامێرا باشتر كرا، كادیری چاكتر لەسەر كامێراكان كاریان كرد، سیناریستی پسپۆڕیش پەیدا بوون، ئەكتەری تایبەت و ڕێژیسۆری تایبەت بۆ سینەما پەیدا بوون، بەكورتی سینەماماڵێكی بۆ خۆی پێكەوەنا و بوو بەئۆرگانێكی سەربەخۆ. لەم هەموو گۆڕانكارییەشدا قارەمانی شاشە پەیدا بوو.

## سیناریۆ بۆ فیلمی دەكومێنتی

نووسینی سیناریۆ بۆ فیلمی دەكۆمێنتی، لەكارە مەحاڵەكانە. ئەوەش چ بۆ ڕۆژنامەنووسە گەورە و بەناوبانگەكان، چ بۆ ئەوانەی تازە لەم مەیدانەوە دەست بەكار دەكەن. لێرەدا پرسیارێك زەق دەبێتەوە، ئەی ئەم هەموو فیلمانە چین كە ئێمە ڕۆژانە لە كەناڵەكانی تەلەفزیۆن دەیانبینین؟ پرسیارێكی بەجێیە و لە شوێنی خۆیەتی: بۆ فیلمی دەكۆمێنتی، دەكومێنتالیستەكان، هەوڵدەدن، بیری فیلمەكە، گیانی فیلمەكە، دڵی فیلمەكە، لە بچووكترین



بەشیەوە تا گەورەترینی بخەنە سەر كاغەز. ڕۆمان كەرمێن كە دەكومێنتالیستی گەورەی یەكێتی سۆڤێت بوو دەنووسێ: سیناریۆ بۆ فیلمی دەكۆمێنتی، پێش هەموو شتێك بیرەكەیەتی، بێ ئەوە ڕۆژنامەنووس ناتوانێ دەست بەگرتنی بكا. مەبەست لە كاری مەحاڵ ئەویە كە بۆ نموونە: ڕۆژنامەنووس لە بیری فیلمەكە نووسیویەتی كە ئینتەرڤیو لەگەڵ فلانە كەس دەكا، بەڵام خۆ وەڵامەكان جارێ نازانێ؟ لەوانەیە بیری بۆ وەڵامەكان چووبێ لەوانەشە بیرو بۆچوونی هەڵە بێ، یان ئەو وەڵامەی دەستی دەكەوێ، شایانی خستنە ناو فیلمی نییە. باس لەوە ناكەین كە كابرا داواكاری ڕۆژنامەنووس ڕەت دەكاتەوە و نایەوێت ئینتەرڤیوشی لەگەڵ بكرێ!. لەگەڵ ئەوەشدا فیلمی دەكۆمێنتی بە سێ قۆناغ ڕەت دەبێ:

١- داڕشتنی بیری فیلمەكە.

٢- پڕۆسێسی فیلم گرتن.

٣- مۆنتاژ كردن و دەنگ و مۆسیقا خستنە سەری.

بێجگە لەوانەی سەرەوەش، چارەنووسی فیلمەكە بەسیناریۆكەوە یان بەبیری فیلمەكە بەندە. كابرای دەكۆمێنتالیست خۆی بابەتەكە هەڵدەبژێرێت و دەزانێ چ ئامانجێكی لە گرتنی فیلمەكە هەیە. زۆر جار ڕوودەدات كە بیری فیلمەكەش خۆی دایڕشتووە. بۆیە سەیر نییە، كە خۆی گەورەترین دەسەڵاتی لەسەر فیلمەكە هەبێ. گەورەترین دەسەڵات، مەبەستمان ئەوە نییە كە بەردەوام خۆی لەسەر شاشەكە نیشان بدا! وەك دەزانین دەكومێنتالیست هەن كە خۆیان لەسەر شاشەكە هەر دەرناكەون. گەورەترین دەسەڵاتی هەیە، چونكە لەلایەك، خۆی بیری فیلمەكەی داڕشتووە و دەشزانێ مەبەستی لە فیلمەكە چییە؟

بۆ ئەوەی فیلمەكە وەك پلانەكانی سەر لاپەڕە، بەچاكی بگیرێ، دەكومێنتالیست دەبێ، بیری خۆی بەتەواوی بۆ ڕێژیسۆر و كابرای فۆتۆگرافیش ڕوون بكاتەوە. دوور نییە ئەوانیش بیرو بۆچوونی خۆیان هەبێ، كە زۆر جار دەبێتە باشكردنی فیلمەكە. لەزۆر كاتدا، خراپ نییە گەر پرس بەخەڵكی شارەزاش بكرێ. پێش ئەوەی دەست بە پرۆسێسی فیلم گرتنەكە بكرێ. لێرەدا دەبێ، دەكومێنتالیست وریا بێ، بیر و ڕای خەڵكی لابەلا بەسەر فیلمەكەی زاڵ نەبێ و ناوەرۆكی فیلمەكە تێك نەچێ. باشی فیلمەكە و سەركەوتنی، زۆر بەندە بەوەی كە كابرای دەكومێنتالیست، چەند توانیویەتی لەژیانی ڕاستی ڕۆژانە نزیك بێتەوە؟ چونكە بینەر ئەو فیلمانەیان دەوێ، كە باس لە ژان و دەردەكانی ئەوان دەكەن، باس لە ڕاستی ژیان، دوور لە درۆ و دەلەسە دەكەن.

مەبەست لە گرتنی فیلمی دەکۆمێنتی، خزمەتکردنی جەماوەرە، بەرزکردنەوەی پرسیارێکی لە بیر کراوە، کە پێویستی بەچارەسەر کردنی هەیە. ئەم جۆرە فیلمانە بۆ کۆمەڵ لەلایەن سیاسیەکانەوە، وەك داو دەرمان پێویستە. هەر بۆیەش پاش نیشاندانی فیلمی دەکۆمێنتی سەرکەوتوو بە گشتی، پرسیاری بەرز کراوە لە فیلمەکە، چارەسەر دەکرێ و دەزانین، سیاسییەکان ناتوانن جەماوەر بۆ ماوەیەکی زۆر پشتگوێ بخەن، چونکە پشتگوێ خستنی جەماوەر، مەرگی ئەوانی بە دواوەیە. بە تایبەتی لەو دەوڵەتانەی بەئازادی هەڵبژاردن دەکرێ. فیلمی دەکۆمێنتی لەسەر بابەتێکی دیارکراو بەتێر و تەسەلی دەدوێ. بە ٢٠ خولەك، ٤٠ خولەك یان کەمێك زۆرتر. ئەم بابەتانە، دەکرێ، کۆمەلاێەتی ، سیاسی بن یان هەر بابەتێکی کە ڕۆژنامەنووس بزانێ، پشتگوێ خراوەو پێویستی بە بەرزکردنەوە و چارەسەرکردن هەیە.

یەك لەوانەی فیلمی دەکۆمێنتی لە فیلمی یاری جیا دەکاتەوە، ئەوەیە کە ئەوانەی لە فیلمی دەکۆمێنتی قسە دەکەن، قسەکانیان بۆ نەنووسراوەتەوە و پێیان نەگوتراوە، دەبێ وا بڵێن. ئەوان وەك ئەکتەر دەور نابینن. قسەکانیان هەڵێنجراوی بیر و بۆچوونیانە و لەزۆر کاتدا بڕوای تەواویان پێ هەیە. ئەوان وەلامی پرسیارەکانی دەکۆمێنتالیست بەگوێرەی ڕاددەی شارەزایی و تێگەیشتنیان دەدەنەوە. بۆیەش لەم جۆرە فیلمانە کەس نالێ، فلانە کەس ئەکتەرێکی خراپە، بەڵکو زۆرتر دەڵێن، قسەکانی نابەجێن، یان بۆچوونەکانی هەڵەن.

**وێنە لە ڕۆژنامە**

وێنە ئاوێنەی ڕووداوەکانە. ڕۆژنامەنووس کە وێنە لەگەڵ نووسینەکەی بەکار دەهێنێ، بۆ ئەوەی فاکتەکانی بەهێز تر بێ و هەوڵ دەدا واقیعی ڕووداوەکە وەك خۆی بگەیەنێتە خوێنەران. هەر بۆیەش لەلاپەڕەی یەکەمی هەموو ڕۆژنامەیەك، وێنەیەکی گەورە بلاوکراوەتەوە. کە دەکاتە گەورەترین ڕووداوی ژمارەی ناوبراو. لە ڕۆژنامەکانی دەوڵەتانی ڕۆژئاوا، لەژێر هەموو وێنەیەك، جگە لەوەی ناوی کابرای فۆتۆگراف یان ئاژانس دەنووسرێ، کۆمێنتاری ڕۆژنامەنووسیش، بەقەد بلاوکردنەوەی وێنەکە کار دەکاتە سەر خوێنەران. کۆمێنتار دەکرێ، چەند وشەیەك بن، یان چەند ڕستەیەك.

بە گشتی وێنە لە ڕۆژنامەدا هاوکارییە لەنێوان ڕۆژنامەنووس و فۆتۆگراف و ئەو کەسەی ڕۆژنامەکە مۆنتاژ دەکا. بەڕای سۆران لارسۆن، فۆتۆگرافیش ڕۆژنامەنووسە. جیاوازی نێوان



هەردووك ڕۆژنامەنووسان تەنیا ئەوەیە کە پێیان دەڵێن ڕۆژنامەنووسی نووسەر، ڕۆژنامەنووسی فۆتۆگراف. هەردووکیان پێش ئەوەی بەکارێك هەڵبستن، دەبێ بەیەکەوە قسە بکەن و لەسەر بابەتەکە گفتوکۆ بکەن[1].

وێنە لە ڕۆژنامەدا دەگەڕێتەوە سەر ئەوەی چەند ڕووبەری پێدەدرێ، بە گشتیش تاڕووبەری زۆرتر پێ بدرێ، ئەوا کار زۆرتر دەکاتە سەر خوێنەران. بەڕای من ئەو وێنەیەی لەگەڵ نووسین لە ڕۆژنامە یان گۆڤار بلاودەکرێتەوە، دەبێ پێش هەموو شتێك وێنەکە بەجوانی گیرابێ، ئینجا وێنەیەکی ڕوون بێ نەك لێڵ کە ببێتە هۆی چاو ئێشانی بینەران و خوێنەران. جا بۆ ئەوەی وێنەی زیندوو بۆ خوێنەران لەسەر لاپەڕەی گۆڤار و ڕۆژنامەکان بلاوبکرێتەوە، شوێنی فۆتۆگراف بەردەوام سەنتەری ڕووداوەکانە. چونکە دەبێ ئەو وێنانە بگیرێ کە بۆ خوێنەران سەرنج ڕاکێشن، نەك وێنەی وەستاو و مردوو!!! بۆیە وێنەکان دەبێ لەگەرمەی ڕووداوەکان بگیرێن.

هەندێك وێنە هەن بینەر قەت ناتوانێت لەبیری بکا، ئەو جۆرە وێنانە ئەگەر لەکاتی شەڕ گیرابن، بوونەتە سیمبۆلی ( ڕەمزی) شەڕەکە. بۆ ئەوەی مەبەستم چاکتر بۆ خوێنەران ڕوون بکەمەوە، بەپێویستم زانی دوو نموونە بهێنمەوە:

**یەك:** هەموو تراژێدیای هەڵەبجە، یەك وێنە بۆتە رەمزی، ئەویش پیرەمێردێکە کە منداڵی بە باوەشەوەیە هەردووکیان لە وێنەکە دیارن وەك ئەوەی خەویان لێکەوتبێ، لەم وێنەیە دوو کەس تراژێدیای پێنج هەزار شەهید نیشان دەدەن. وێنەی ناوبراو ئەوەندە کار دەکاتە سەر بینەر، کە ناتوانێ دیمەنی تراژێدیای لە بیر بچێ، ئەگەر لە کاتێکدا لە بیریشی چووبێ لە کاتی بینینی وێنەکە دەزانێ هی چ تراژێدیایەکە. بەڕای من ئەو وێنەیە نەك هەر سیمبوڵی تراژیدیایە بۆ هەڵەبجە، بەڵکو تراژێدیای هەموو گەلانی کوردستان لە ناو ئەو وێنەی "عومەری خاوەر"دا دەبینرێ.

**دوو:** بەڕێوەبەری پۆلیس بەناوی، نگوێێن نگوس لوان، دیلێك لە شاری سایگۆن لەساڵی ١٩٦٨ دەکوژێ. هەر دوو وێنە کاریان زۆر لە جەماوەر کردووە و لەلایەن فۆتۆگرفی پسپۆڕەوە گیراون، هەردووکیان بوونەتە سیمبوڵی شەڕ. وێنەی دووەم لەلایەن فۆتۆگرافی ئاژانسی ئەی پی AP بە ناوی

---

1. Söran Larsson، att skriva i tidning. Borås، 1992.- p.171..

ئێدی ئادەمس Eddie Adams گیراوە. ئەو لەسەر گرتنی وێنەکە دەڵێ: ئەگەر کەسێکی ملهوڕیش لەشوێنی من بوایە، دەیتوانی هەمان وێنە بگرێ. "بەتایبەتی کە بەڕێوەبەری پۆلیس ئاگاداری ڕۆژنامەنووسەکەی نەکردۆتەوە کە ئەو دیلە دەکوژێ". کە دەستی بەڕێوەبەری پۆلیس بەدەمانچەکەیەوە بەرز کرایەوە، دەستی منیش بەکامێرا بەرز کرایەوە، بەڵام من هێشتا لەو بڕوایە نەبووم کە دیلەکە دەکوژێ. ئەوەی ئێددی گرتی هەر ئەوە نەبوو کە ئەو لەکات و شوێنی پێویست لەوێ بوو، بەڵکو وێنەی ناوبراو بەڕای زۆر کەس، هەموو تەرازووی شەڕی ڤێتنامی گۆڕی[1].

ئاژانسی ناوبراو بەم شێوەیەی خوارەوە لە ژێر وێنەکە کۆمێنتاری نووسیوە: "دەنگی ئەو دەمانچەیە، لەوانەیە لە هەموو دەنگ و ڕووداوەکانی تری ئەو شەڕە گرنگتربێ، نەك لەبەر ئەوەی لەهەموو جیهان دەنگی دایەوە، بەڵکو لەبەر ئەوەی دەبینرا".

وەك گوتمان وێنە بۆ ڕۆژنامە و گۆڤار زۆر گرنگن، بەڵام زۆر جار لە وێنەکانیش گرنگتر، نووسینی ژێر وێنەکەن. ڕۆژنامەنووس چاکە بایەخی زۆر بەو تێکستە بدا کە لەژێر وێنەکە دەینووسێ.

هەندێك جار، ڕووداوەکە لەیەك وێنەدا شوێنی نابێتەوە، بۆیە ڕۆژنامەنووس بۆ نووسینەکەی چەند وێنەیەك بەکار دەهێنێ، ئەو وێنانەش بەگشتی سێ وێنەن یان زیاتر کە بەزمانی ڕاگەیاندن پێی دەڵێن فۆتۆ ڕێپۆرتاژ. دیارە مەبەستمان لە فۆتۆ ڕێپۆرتاژ گرتنی چەند وێنەیەکە لەسەر یەك ڕووداو، لەگەڵ نووسینەکەی دەبنە تەواوکەری یەکتری. ئەم نووسینەش دەکرێ یەك ڕۆژنامەنووس نووسیبێتی، یان دوو، یان سێ یان زیاتر. زۆر جار ڕۆژنامەنووسان، فۆتۆپەنۆڕاماش، بۆ نووسینەکانیان، بەکار دەهێنن، ئەمەش دەکاتە گرتنی چەند وێنەیەك لەسەر هەمان بابەت نموونە: لەوانەیە وەرگەڕانی شەمەندەفەرێك، لەیەك وێنە بەتەواوی شوێنی نەبێتەوە، بۆیە کابرای فۆتۆگراف پێش گرتنی وێنەکان، شەمەندەفەرەکە دەکاتە چەند بەشێك و ئینجا دەست دەکا بەوێنە گرتنی. لەکاتی مونتاژ کردندا، وێنەکان لەتەنیشت یەکتر دادەنرێن، کە زۆرجار بینەر وادەزانێ یەك وێنەیە.

ڕۆژنامەنووس، لەگەڵ فۆتۆگراف، خۆیان بڕیار دەدەن کە وێنەکان چۆن بگرن! ئەمە لەکاتی ڕووداوەکانە، بەڵام لەکاتی ئینتەرڤیو، یان نووسین لەسەر بابەتی تر، ئەو وێنانە بڵاودەکرێنەوە

١. هەمان سەرچاوەی پێشوو. ل ١٧٣.



کە زیاتر ڕەنگدانەوەی نووسینەکان بن وەك: ئەگەر گرژی لەنێوان دوو سەرۆك وەزیران هەبێ، بەهۆی لایەنی سێیەمەوە، لەڕێگای ڕۆژنامە و گۆڤار و ڕادیۆ و تەلەفزیۆنەوە، ڕازی بن لەسەر لابەلاکردنی کێشەکانیان، کە هەردووکیان لە دەزگاکانی ڕاگەیاندن، ڕایان گەیاندبێ کە لەم ڕۆژانە ناخۆشییەکان چارەسەر دەکرێن. ڕۆژنامەنووس بۆ ئەوەی چاکتر بۆ خوێنەران بابەتەکە ڕوون بکاتەوە، لەگەڵ ئەم نووسینەدا، نابێ وێنەیەکی سەرۆك وەزیران بڵاوبکرێتەوە کە بەدەست هەڕەشە دەکا، یان پەنجەی بەرز کردبێتەوە! ئەم جۆرە وێنانە خۆ ئامادەکردن بۆ شەڕ نیشان دەدەن، نەك بۆ ئاشتی. ئەگەر ڕۆژنامەیەکی گەورەی وڵاتەکە بێ، بەدوور نازانرێ، ببێتە هۆی سەرئێشەی زۆر بۆ سەرۆك وەزیران.

لە زۆربەی ڕۆژنامەکانی دەوڵەتانی ڕۆژئاوا، ڕووداوی گەورە، زۆرتر بەوێنە ڕوون دەکرێتەوە، تا بەنووسین. ئەو ڕووبەرەی بەوێنە دەدرێ، زۆر جار چوار هێندەی ڕووبەری نووسینەکەیە. لەوانەیە زیاتر لەبەر ئەوەبێ، کە خوێنەری ڕۆژنامە لەبەر تەلەفزیۆن و گرفتی ڕۆژانەی خۆیان ئەوەندە سەلیقەی خوێندنەوەیان وەك جاران نەمابێ. خەڵك وەك جاران ناتوانێ، گوتارێك بخوێنێتەوە، کە زیاد لەچەند دەقیقەیەك بخایەنێ. بەتایبەتیش کە دەزانێ، باسکردنی هەمان ڕووداو لەڕادیۆ و دەنگوباسی دوێنێ باس کراوە.

ڕۆژنامەکان بەردەوام تیراژیان لە کەمبووندایە. ئەگەر ڕێکلام نەبێ، کە هەموو ڕۆژنامەکان دەژیێنێ، مووچەی کارگێڕانی لێدەدرێ، جگە لەقازانج، بەدوور نازانرێ، ڕۆژنامەکان بەشی هەرەزۆریان ئەمڕۆ دەرنەچووبانە. بۆیە لەزۆر دەوڵەت، بۆ پشتگیری کردنی چاپەمەنی، حکومەت یارمەتی ماددی چاك بەڕۆژنامەکان دەدا.

ڕۆژنامە ڕۆڵی زۆر گرنگ لە پێشخستنی دیمۆکراتیەت لەکۆمەڵدا دەگێڕێ، بۆیە وێنە دەبێ تەواوکەری نووسینەکە بێ نەك شێواندنی.

زۆرجار ئەگەر وێنە بۆ گوتار نەبێ، ڕۆژنامەنووسیش لەو بڕوایەدابێ کە وێنە زۆر پێویستە، دەتوانێ بەهۆی نیگار کێشەوە، وێنە بکێشرێ و لەگەڵ نووسینەکە بڵاوبکرێتەوە. ئەوەش دەکرێ وەك کاریکاتۆر وێنەکە بکێشرێ، یان وێنەی ئاسایی بڵاوبکرێتەوە.

ئەمڕۆ بەهۆی تەکنیکی نوێ وەك کامیرا و سکانەر بۆ کۆمپیوتەرەکان، بەکارهێنانی وێنەی بۆ ڕۆژنامە و گۆڤارەکان زۆر هەرزان و ئاسان کردووە.

# فۆتۆگراف

**فۆتۆگراف** بەوکەسە دەڵێن بەکامیرا وێنە دەگرێت. ئەگەر فۆتۆگراف لە رۆژنامە یان گۆڤار کار بکات، پێی دەگوترێ رۆژنامەنووسی فۆتۆگراف. یان "رۆژنامەنووسی وێنەگر". ئەو لەجیاتی نووسین، بەوێنە مەبەستی خۆی دەردەبڕێ. بۆیە بەڕێگای وێنەکانەوە کەسی فۆتۆگراف، هەواڵ و روداوەکان دەگەیێنێ.

**فۆتۆگرافی رۆژنامەو گۆڤار**، زۆرتر لەسەر فەرمانی دەستەی نووسەران بۆ شوێنی رووداوەکان دەنێردرێ. ئەگەر فۆتۆگراف بۆخۆی کار بکات، لەوکاتە لەگەڵ چەند رۆژنامە و گۆڤارێك پێكدێت و وێنەکانی خۆی بەوان دەفرۆشێ. بۆ ئەوەی وێنەکانی بفرۆشرێن، دەبێ کابرای فۆتۆگراف پێشتر وێنەی گرتبێ و ئەزموونی لەم بوارەدا هەبێ. ئەوەی سەرەوە فۆتۆگرافی رۆژنامە یان گۆڤار بوو. چەند جۆری تری فۆتۆگراف هەیە وەك **فۆتۆگرافی رێکلام و پۆرترێت**. ئەگەر فۆتۆگراف لە بواری پۆرترێت کار بکا، شوێنی زۆرتر ناو ستۆدیۆیە و زیاتریش وێنەی ئەو کەسانە دەگرێت کە دێنە ستۆدیۆ، وەك وێنەی بووك و زاوا، منداڵ و جۆری تریش. رووش دەدات کە فۆتۆگراف لەسەر داوای خەڵك بچێتە دەرەوەی ستۆدیۆ و لەوێ ئەو وێنانە بگرێ کە داوای لێکراوە.

ئەگەر لە بواری رێکلام وێنە بگرێت، ئەوا شوێنی ناو یان دەرەوەی ستۆدیۆیە. ئەوەش دەمێنێتەوە سەر ئەوەی وێنەی چی و بۆ چ دەگرێت.

وەك فۆتۆگرافی مۆدێل، وێنەی جل و بەرگ دەگرێت.

فۆتۆگرافی پۆرترێت و ریکلام رۆژنامەنووسیان پێناگوترێ، چونکە کار بۆ رۆژنامە و گۆڤار ناکەن.

فۆتۆگرافی تر هەیە لەدەزگاکانی میری و کارگەکان کار دەکەن. دەزگاکانی میری وەك نەخۆشخانە، لەوێ کابرای فۆتۆگراف وێنەی نەخۆش و نەخۆشییەکە دەگرێت، هەندێك جار وێنەکانی نەخۆشخانە لە کۆلێژی پزیشکی دەخوێندرێت. وەك فۆتۆگرافی پۆلیس، وێنەی تاوانەکان و ئەو کەسانەی بەتاوانەکان بەستراونەتەوە دەگیرێت. لەگەڵ هەموو ئەو جۆرە وێنانەی لەکار و باری پۆلیس بەکار دێن.

وەك **فۆتۆگرافی مۆزەخانە،** ئەوا وێنەی تابلۆ، ناو خانوو لەگەڵ ئەو وێنانەی پەیوەندییان بەمۆزەخانەوە هەیە دەگیرێت.

وەك **فۆتۆگرافی کارگە،** زیاتر وێنەی پرۆسێسی بەرهەم هێنانی شتە نوێکان کە لە کارگە دروست دەکرێن دەگیرێت. فۆتۆگرافی ئەرشیڤ، لێرەدا ئەو وێنانە دەگیرێن کە لە ئەرشیڤەکان بەکار دەهێنرێن یان بۆ ئەرشیڤ کردنی مەتریالەکان دەگیرێن.

**فۆتۆگرافی فیلم و تەلەفزیۆن و ڤیدیۆ،** لە هەرسێ جۆر لەگەڵ کامیرای جووڵێنەر کامیرای ڤیدیۆ، یان کامیرای فیلم کار دەکرێت، ئەوەش دەکرێ لەناو ستۆدیۆ بێت یان لەدەرەوەی ستۆدیۆ. ئەوانەی لەگەڵ کامیرای ڤیدیۆ کار دەکەن، لەزۆر کاتدا پێویستیان بەلای کەم بەیاریدەدەرێك هەیە. ئەوانەی لە تەلەفزیۆن وەك فیلمگر لەسەر کامیراکان کار دەکەن، دەکرێ بەرۆژنامەنووس ناویان بهێنرێت. لەهەموو ئەو جۆرانەی سەرەوە، کەسی فۆتۆگراف، دەبێت وشیار بێت و سەری لە رووناکی باش دەربچێت و بزانێت وێنە بگرێت، بشواتەوە و چاپ بکات.



## سەردێر یان ناوی گوتار

هەموو نووسین و بڵاوکراوەیەك لە رۆژنامەو گۆڤاردا، بە هۆی سەردێرەوە دەناسرێنەوە. سەرگوتار دەکاتە کلیل یان کۆدی نووسین، کە خوێنەر نووسینەکەی پێدەناسێتەوە. سەردێر لە نووسیندا لەگەڵ وێنە، لە لاپەڕەی رۆژنامەی چاپکراو زۆرترین سەرنجی خوێنەر بۆ خۆیان ڕادەکێشن. لەبەر ئەوەی ڕۆژنامەکانی سەردەم لاپەڕەیان یەکجار زۆرە. زۆر جار لە ٦٠- ٧٠ لاپەڕە تێپەڕ دەکا، خوێنەر بە گشتی ناتوانێ هەموو رۆژنامەکە بخوێنێتەوە، بەڵام دوور نییە سەیری هەموو لاپەڕەکانی بکا و لە هەر لاپەڕەش هەموو سەردێڕەکان بخوێنێتەوە. سەردێر لە هەر نووسینێکدا لەبەر ئەوەی بەخەتێکی خۆش و پیتی ڕەش و گەورە نووسراوە، زەقتر دەکەوێتە بەر چاوی خوێنەران.

سەردێر ئەگەر قسەی بکردایە، بە خوێنەری دەگوت: تکایە گوتارەکەشم بخوێنەوە! بۆیە هەر سەردێڕیشە، خوێنەر بڕیاری لەسەر دەدا، ئایا ئەم نووسینە شایانی خوێندنەوەیە یان نا؟ سەردێڕ باشترین ڕەنگدانەوەی لەسەر خوێنەران دەبێ، ئەگەر فاکت بەرز بکاتەوە و ئەو فاکتەش کار بکاتە سەر ژیانی خەڵکێکی زۆر، چ بە باشە یان بە خراپە[1].

کەواتە لە کاتی نووسینی سەردێر، رۆژنامەنووس دەبێ گرنگییەکی زۆری پێبدا و پێش ئەوەی بڕیاری تەواوی لەسەر داڕشتنی بدا، باشە زۆر بیری لێ بکاتەوە. ئەوەش لەبیر نەکەین کە سەردێر دەبێ ڕەنگدانەوەی ناوەرۆکی نووسینەکان بێ و لە درۆش دوور بێ.

سەردێڕ لە گوتاردا تەنیا یەك مەبەست و ئامانجی نییە، بەڵکو دەبێ چەند مانایەکی هەبێ. بەڕای ئەنتۆن کارلگرێن، کە لە ١٩٠٩- ١٩٢٣ سەرنووسەر و خاوەن ئیمتیازی

1. Björn Nöljer, Så snickar du en tidningsartikel. Borås, 1994.- p.16.

ڕۆژنامەی داگینس نیهێتەری سویدی بوو، سەردێر دەبێ دوو ئامانجی هەبێ، **یەکەمیان:** کار بکاتە سەر خوێنەران کە گوتارەکە بخوێننەوە **دووەمیان:** ئاگاداری خوێنەر لە ناوەرۆکی گوتارەکە بکاتەوە. ئەوەی سەرەوە ناگەیەنێ کە خوێنەر پاش ئەوەی کە سەردێرەکەی خوێندەوە، ئیتر پێویست نەکا گوتارەکە بخوێنێتەوە، ئەگەر وابێ، بەڕای من چاکترە ئەم جۆرە سەردێرانە نەنووسرێن. سەردێر دەبێ گرنگی گوتار نیشان بدا و لە چرکەی یەکەم سەرنجی خوێنەر بۆ لای خۆی ڕابکێشێ. لە هەمان کاتیشدا باس لە ناوەڕۆکی نووسین یان گوتارەکە بکا. بە کورتی سەردێر دەبێ بە شێوەیەکی ئەوەندە سەرنج ڕاکێش بنووسرێ، لە جیاتی نووسەر وەك گوتم هاوار بکا: من بخوێنەوە!!!

سەردێر جگە لەوەی دەبێ بەزمانێکی شیرین و سەرنج ڕاکێش و کوردییەکی پەتی بنووسرێ، نابێ لە چەند وشەیەکیش زۆرتر بێ. ئەگەر سەردێر نەکرا بە کورتی مەبەستی گوتارەکە یان نووسینەکە دەربڕێ، لە زۆر کاتدا لە دوای سەردێر کە بەخەتێکی گەورە و پیتی ڕەش نووسراوە، لە ژێرەوەی بە پیتی کەمێك بچووکتر دیسان ڕەش ڕستەیەك دەنووسرێ، کە مەبەستی سەردێرەکەی پێ بەهێز دەکرێ.

لە سەردێردا مەرج نییە ڕستەی تەواو پێکبهێنرێ و بنووسرێ، دەتوانرێ لەکاتی نووسینی سەردێر، زۆر بیر لە ڕێزمان نەکرێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو چەند وشەیەی بەدوای یەك ڕیز کراوە، دەبێ لۆژیکی تێدا بێ.

لە نووسینی سەردێردا چاکە ڕۆژنامەنووس یان نووسەری گوتار، بە شێوەی پرسیار نەینووسێ. ئەگەر نووسەر بزانێ بۆ نووسینەکەی چەند ڕووبەری پێدراوە، لەوەش سەردێر چەندی بەر دەکەوێ و (لید) چەندی بەر دەکەوێ. (مەبەست لە لید ئەو چەند دێرەیە کە بە کورتی و خەستی باس لە ناوەڕۆکی گوتارەکە دەکات. لە گوتاردا دەکەوێتە نێوان سەردێر و نووسینەکە. لید دەبێ بە خەتێکی ڕەش بنووسرێ، لە زۆر کاتدا هەمان خەتی گوتارەکە و هەمان گەورەیی پیتی نێو گوتار بەکار دەهێنرێ، بەلاّم لە جیاتی بە سپیەکی کاڵ بنووسرێ، ئەوا دەبێ بە ڕەشی چاپ بکرێ، جاریش هەیە بۆ سەرنج ڕاکێشانی خوێنەران، بە ڕەشی و لاری دەنووسرێ و لە ڕۆژنامە چاپ دەکرێ). لە ڕۆژنامەکانی ئێستای ئەوروپا، زۆر بایەخ بەفۆرم و قەبارەی ڕۆژنامە دەدەن. هەوڵ دەدەن، بە هیچ شێوەیەك ستایلی ڕۆژنامەکەیان نەگۆڕن. بۆ ئەم مەبەستەش وەك دەزانین پرۆگرامەکانی کۆمپیوتەر، کاری دەرکردنی ڕۆژنامەی زۆر بۆ ئاسان کردوون.



ڕۆژنامەنووس بۆی نییە بەویستی خۆی، چەند گوتارەکەی پێویستی بەڕووبەر بێ، پێی بدرێ. (باس لەو ڕۆژنامەنووسانە دەکەین کە لە ڕۆژنامەکان کاردەکەن، نەك ڕۆژنامەنووسی ئازاد، کە لەوانەیە دوو هەفتە جارێك گوتارێك بنووسێ). ئەو کەسەی ڕۆژنامەکە مۆنتاژ دەکا، ڕووبەرێکی دیاریکراو بە ڕۆژنامەنووس دەدا، ئەو ڕووبەرەش لەسەر شاشەی کۆمپیوتەری ڕۆژنامەنووسەکە دیارە. ڕۆژنامەنووس بۆی نییە یەك ڕستە زیاتر لەوەی بۆی دیاری کراوە بنووسێ. لە کاتێکدا ئەگەر گوتارەکە درێژتر بێ، دەبێ کورتی بکاتەوە، ئەگەر کەمیشی نووسیبێ، دەبێ زۆرتری بۆ بنووسێ. بۆیە زۆربەی ڕۆژنامەکان بەرنامەی(کوارك ئێکسپرێس) بەکار دەهێنن. بەرنامەی ناوبراو یارمەتیان دەدا شێوەی ڕۆژنامەکە وەك خۆی بمێنێتەوە.

جگە لەوانەی سەرەوە، هەوڵ دەدەن تا بۆیان بلوێ، خەتەکان و شێوەی نووسینی سەردێرەکان نەگۆڕن. لە هیچ ڕۆژنامەیەکیش لە ٤ — ٥ جۆرە خەت و شێوە زیاتر بەکارناهێنرێ.

لە ڕۆژنامە چەند جۆرێك نووسینی سەردێر هەن وەك: مقەسی، ناوەڕاستی، لای ڕاست، لای چەپ، خەتی پڕ، یەك خەتی. ئەو ناوانەی سەرەوە لەوانەیە بە زمانی کوردی کەمێك سەیر بێنە بەرچاو، بەلاّم من لێرە هەوڵ دەدەم نموونەیان بۆ بهێنمەوە بۆ ئەوەی خوێنەر چاکتر تێیان بگا.

**مقەسی**

**XXX XXXX XXX**

**XXXXXXXXX XX**

**XXXXXXXXXXXX**

**ناوەڕاست**

**XXXXXXXXXXXX**

**XXX XX**

**XXXXXX XXX**

**XXXXX XXX**

**XXX XX**

**XXXXXX**

**XXX XXXXXX**

**XXX XXX**

**XXXXXXX**

**لای ڕاست و لای چەپ**

**XXXXX XX XXX**

**XXXXX XXXX**

**XX XXXX XXXX**

**XXXXXX**

**XXXX XXXXXX**

**XX XXXX**

**XXX XXXXXXXX**

**XXXXXXX**

**XXX XXXXXX**

**خەتی پڕ**

**XXXXXXX XXXX**

**XX XXXX XXXX**

**XXXXX X XXX**

**یەك خەتی**

**XXXXXXXXXXXX XXXX XXX**

**XXXX XXX**

**XXXXXXXX**

جۆرەکانی نووسینی سەرگوتار کە لەسەرەوە ڕوونمان کردەوە، لە کتێبی بیۆرن نێلەر ل.٤٠ بە زمانی سویدی وەرگیرایە. نووسەری ناوبراو نموونەشی بۆ هێناون، بەلاّم لەبەر ئەوەی نموونەکان تایبەتن بەرۆژنامەی سویدی، بە پێویستم نەزانی لێرە بیان نووسمەوە.



لە نووسینی سەردێردا ڕۆژنامەنووس هەن، دوای نووسینی گوتارەکە ناونیشان بۆ نووسینەکەیان دیار دەکەن، هەیە لە سەرەتادا ناو بۆ نووسینەکەی دادەنێ، ئینجا دەست بە نووسینی گوتارەکەی دەکا. بەلاّم ئەوەی تا ئێستا زۆرتر باوە، ئەوا شێوەی یەکەمە. گوتار دەنووسرێ ئینجا ناونیشانی بۆ هەڵدەبژێردرێ. گرنگ نییە ئەو سەرناوەی جاری یەکەم بەمێشکتدا دێ، بنووسی و لێی پەشیمان نەبیەوە. ڕۆژنامەنووس بە گشتی چەند ناونیشانێك دەنووسێ، پاش بیرکردنەوەی زۆر یەکیان هەڵدەبژێرێ. گرنگیشە بزانین کە نابێ پەلە لە نووسینی سەردێر بکرێ. چونکە ئەگەر ناوێك کە شایانی گوتارەکەیە نەنووسرێ، بە دوور نازانرێ، هەموو هەوڵی ڕۆژنامەنووسەکە بەخۆڕا بڕوا و نووسینەکەشی تێك بدا. لەو کاتەشدا وەك دەزانین کەمتر خوێنەران دەیخوێننەوە ئەوانەی دەشی خوێننەوە، لەوانەیە هەست بە کەم و کورتی دارشتنی نووسینەکە بکەن. ئەمەش دەکاتە ئیفلیج بوونی نووسینەکە.

بەڕای زۆر لە ڕۆژنامەنووسانی سویدی و بە تایبەتی ئەوانەی کە لەسەر تیۆری ڕۆژنامەنووسی کتێب و بلاّوکراوەیان زۆرە، لە سەرگوتار دەبێ هەوڵ بدرێ، وشەی نێگەتیڤ (خراپ) بەکار نەهێنرێ. ئاشکرایە لەهەر ژمارەیەکی ڕۆژنامەدا، دەیان نووسین، وەك: هەواڵ، گوتار، ڕێپۆرتاژ، ئینتەرڤیو...هتد. بلاّوکراونەتەوە. هەموو نووسەرێك، ئاواتە خوازە، زۆرترین خوێنەر نووسینەکەی ئەو بخوێنێتەوە، بۆیە بێ ئەوەی ڕۆژنامەنووس پێی بزانێ و هەستی پێ بکا، پێشبڕکێیەك لە نێوان نووسینەکانی ناو ڕۆژنامەکە دەست پێ دەکا، بۆ ئەوەی خوێنەر نووسینەکەی تۆ بخوێننەوە، ئەوا سەرگوتارەکەت بڕیار دەدا. بۆئەوەی ماندووبوونەکەت بەخۆڕا نەڕوا، لەسەر ئەوە وەستاوە، کە سەردێرەکە چەند توانیویەتی سەرنجی خوێنەران بۆ لای خۆی ڕابکێشێ.

# پیشەی ڕۆژنامەنووس و ئەخلاق لە ڕاگەیاندن

سوید یەکەمین دەوڵەتە لە جیهان کە یاسای تایبــەتی بــەئازادی چاپەمەنی دارِشـت. ئـەم یاسایە لە ساڵی ١٧٦٦ دەنگی لەسەر درا. یاسای نـاوبراو چـاپ و بلاَوکردنـەوەی کتێبــی لــە سەنــسوور (ڕەقابــە) دوور کــردەوە. پــاش ماوەیــەك، هــەمان یاســا بــە بڕیــارێکی تایبــەتی حکومەتەوە لە ساڵی ١٧٧٢ ڕەتکرایــەوە. بــەلاَم لــە ســاڵی ١٧٧٤ ســەر لــەنوێ یاســاکە بــە بڕیارێکی نوێ دەست بە کار کرایەوە. ئەم یاسایە بــاس لــەوە دەکــا کــە هــەموو کەســێك: بــە نووسین مافی دەربڕینی بیر و بۆچوونی تەواوی خۆی هەیە.

ئەو یاسایەی کە ئەمڕۆ لە ولاَتی سوید هەیە، لەساڵی ١٩٤٩ دەنگی لەسەر دراوە. کەچــی لەڕاستیدا هەمان پرینسیپی سالاَنی ١٧٦٦، ١٨١٠، ١٨١٢، بوون.

پرینسیپەکانی ئازادی چاپخانە بەگشتی لەو خالاَنەی خوارەوە خۆیان دەبیننەوە:

١- هەموو هاولاَتییەك ئازادە لەوەی ڕۆژنامە دەربکات، بــێ ئــەوەی لەلایــەن دەزگاکــانی دەوڵەت یان کۆمەڵەو ڕێکخراوە جەماوەرییەکان کۆسپی بخرێتە سەر ڕێگا.

هەموو ڕۆژنامە یان بلاَوکراوەیــەك دەبــێ مۆڵــەتی هــەبێ و لــەوێ نووســرابێ کــە خــاوەن ئیمتیازی ڕۆژنامە یان بلاَوکراوەکە ناوی چــیە، چــونکە ئــەو لەبــەردەم دادگــا بەرپرســیارە لــە ناوەڕۆکی نووسینەکان.

٢- هــەموو جــۆرە حوکمــدانێکی زوو لەســەر چــاپ و بلاَوکــراوە بــۆ هــەموو دەزگــا جەماوەرییەکان قەدەغەیــە. هــەموو هــەوڵ و تەقەلاَیــەك بــۆ کۆســپ خــستنە پــێش چــاپ و بلاَونەکردنەوەی یان بلاَوکردنەوە قەدەغەیە[1].

---

1. Stig Hadenius, Lennart Weibull, Massmedier. Falun،2003.p.26..

٣- ئەو کەسەی کە ئاگاداری دەستەی نووسەران بە هەواڵێك دەکات، پارێزگاری دەکرێت و ئاشکرا ناکرێ. هەموو ئەو کەسانەی لە ڕاگەیاندن کار دەکەن، لەگەڵ کتێب نووسەکان، مافی پاراستنی هەواڵ هێنەرانیان هەیە. بۆ ئەوەش هەموو دام و دەزگا میرییەکان بە لێکۆڵینەوەو گەڕان بەدوای هەواڵ هێنەرەکان، قەدەغە دەکرێن. شکاندنی نهێنی پاراستن تەنها لەوکاتە دەبێت ئەگەر هەواڵهێنەر پێوەندی بەتاوانی گەورەوە هەبێت.

٤- بۆ هەموو چاپکراوێك یان بەرنامەی ڕادیۆ یان تەلەفزیۆن دەبێ بەرپرسێك هەبێت و ئەویش لەلایەن خاوەنی دەزگاکە دادەمەزرێت. بەڕێوەبەر بەرپرسە لە ناوەڕۆکی بەرنامەکان، نەك نووسەر یان دەرهێنەری بەرنامەکە. دوای ئەوان یاساو بنەمای تر هەن، ئەگەر لەکاتێکدا بەرپرسی نووسینەکان دەست نەکەون، زۆرجار خاوەنی ڕۆژنامە "خاوەن ئیمتیاز" بەرامبەر یاسا لە دادگا بەرپرس دەبێت.

٥- گەیاندنی ئەو هەواڵانەی دژ بە ئەمن و ئاسایشی دەوڵەت، تێکدانی ڕیزەکانی جەماوەرن[١].

لە ساڵی ١٩٣٩ کۆمەڵەی نێودەوڵەتی ڕۆژنامەنووسان بنەمایەکی ئەخلاقییان بۆ ڕۆژنامەنووسان دانا. لە هەشتاکانیش ئەنجومەنی نێودەوڵەتی ڕۆژنامەنووسان پرینسیپە ئەخلاقیەکانیان سەرلەنوێ لەژێر ناوی: "بنەما نێونەتەوەییەکانی خووڕەوشتی ئەخلاقی و پیشەی لە ڕۆژنامەوانی"دا داڕشتەوە. International Principles of Professional Ethics in Journalism ئەو پرینسیپانە باس لە هاولاتیان دەکەن کە مافی تەواوی گەیاندنی هەواڵی ڕاست و دروستیان هەیە[٢].

یاسا میللییەکان کە ئێستا باو و دیارن، لە شوێنێك بۆ شوێنێك لە داڕشتن و ناوەڕۆك جیاوازن.

لە دەوڵەتی ئەمەریکا، زۆرجار یاسای ئەخلاقی لە هەندێك کۆمار کاری پێدەکرێ و لە هەندێکیش پشتگوێ دەخرێ. بەڵام لە هەموویان زیاتر و بلاوتر ئەوا دەزگاکانی ڕاگەیاندن خۆیان یاسا و بنەمای ئەخلاقی بۆ ڕۆژنامەنووسانیان دادەڕێژن.

لە سوید یاساکانی ئەخلاقی ڕۆژنامەنووسی، لە کلوبی ڕۆژنامەنووسان لە ساڵی ١٨٧٤ دەرچوو. کلوبی ناوبراو کاری کۆکردنەوەی ئەو ڕۆژنامەنووس و سەرنووسەرانە بوو کە

١. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل.٢٧.
٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل. ٢٩.



ئارەزوویان لە بەچاپگەیاندن و ڕاگەیاندنی چاك هەبوو. هەر لەساڵی ١٩٠٠ هەمان کلوب هەندێ پرینسیپی داڕشت کە پێویست نەکات ناوی مرۆڤ بێ پێویست بۆ تاوانەکان دەستنیشان بکرێن[١].

ئەو بنەمایانەی سەرەوە ئەوەبوو کە مرۆ دەیویست، ڕۆژنامەنووس ئەو شتانە بگەیێنێت کە ڕاست و دروستن. لە هەمان کاتیشدا، کەس لەڕێگای بلاوکراوەکان، دەزگاکانی ڕاگەیاندن مافی پێشێل نەکرێ.

لە حەفتاکانەوە بنەما ئەخلاقییەکان کراون بە سێ بەش. بنەمای ڕاگەیاندن، بنەمای پیشە لەگەڵ بنەما بۆ نووسینی تێکستی ریکلام.

لەنێو ئەو سێ جۆرە بنەمایانەدا، بنەمای ڕاگەیاندن لە هەموویان کۆنترە و ناوەڕۆکەکەشی بریتییە لە ئامۆژگاری کردنی ڕۆژنامەنووسان کە بەچاوێکی ڕەخنەگرانەوە بڕواننە سەرچاوەکانی هەواڵ. ریز بۆ تاك دابنێ و وشیار بێ لە بەکارهێنانی ناو و بلاوکردنەوەی وێنە. مەبەست لەو جۆرە بنەمایانە ئەوەیە کە ڕاگەیاندنەکی چاك بداتە خوێنەران.

لە سوید دەزگایەك بەناوی لیژنەی بالای ڕاپرسی راگەیاندن Pressens Opinionnämnd هەیە. ئەو دەزگایە چاودێری دەزگاکانی ڕاگەیاندن دەکات کە چۆن پەیڕەوی یاسا و بنەماکانی ئەخلاق لە ڕۆژنامەگەری دەکەن. دەزگای ناوبراو چەندین ڕێکخراو سەرپەرشتی کارەکانی دەکات و ئەندامن تێیدا. ئەوانەش وەك: سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی سوید، خاوەن ئیمتیازەکان، پێن کلوب لەگەڵ دوو ئەندام یەك لەلایەن وەزارەتی دادەوە ئەوەی تریش لەلایەن ئەنجومەنی پارێزەران دادەمەزرێن. دەزگای ناوبراو دەزگایەکی ئازادە و دادگای میری نییە. دەبێ بەڕێوەبەری پارێزەر بێ و پێشتریش ماوەیەك لە دادگا کاری کردبێ و خاوەنی ئەزموونی دادگا بێت.

"لەماوەی یەك ساڵ ١،٥ ملیار دانە ڕۆژنامە لە سوید چاپ دەکرێ و دانیشتوانی سوید نۆ ملیۆن کەسە، کە دەزگای تایبەت بەبلاوکراوەکان بۆ داڕشتنی یاسا و بنەمای نوێ هەن، بۆ ئەوەی تاك لە کۆمەڵ مافی نەخورێ.

جەماوەر بە گشتی و ڕۆژنامەنووس بە تایبەتی، لەناو هەموو کۆمەڵگایەکدا چالاکی ڕۆژانەی خۆیان لە چوارچێوەی یاسا و داب و نەریتی ئەو کۆمەڵەی تێیدا دەژین، ئەنجام دەدەن.

١. هەمان سەرچاوەی پێشوو. ل. ٣٠.

بۆیە یاساکان و داب و نەریت و دیانەتە ئاسمانییەکان لە دەوڵەتێك بۆ دەوڵەتێك دەگۆڕێن. ناتوانین بڵێین یاسای فلانە دەوڵەت بۆ فلانە کۆمەڵ دەگونجێ. بۆ نموونە: یاسای دەوڵەتی سوید بە گشتی تایبەتە بۆ دەوڵەت و دانیشتوانی سوید. هەر لە سویدیش دەتوانرێ وەك پێویست، سوودی لێ وەربگیرێ. ئێمە ناتوانین تەواوی یاسا و داب و نەریتی سوید کۆپی بکەین و لە کوردستان جێبەجێی بکەین. چونکە ئەو شتانەی بۆ سویدییەکان گرنگن، کورد لەوانەیە هەر بایەخیان پێنەدا، یانیش تەواو بە پێچەوانەوە.

لە باسکردنی ئەوانەی سەرەوە، مەبەستمان هەموو لایەنێکی ژیان نییە. هەندێ کاری خراپ هەن کە لە هەموو شوێنێك بە تاوان لە قەڵەم دەدرێن. نموونە: دزی، کوشتن، سووککردنی خەڵك، شەڕ. ...هتد. ئەگەر چی ئەوانەی سەرەوە هەموویان، لە هەموو شوێنێك و لەنێو هەموو کۆمەڵگایەك بەتاوان سەیر دەکرێن، لەگەڵ ئەوەشدا، جۆری سزادان جیاوازە.

مەبەستمان لەو چەند دێرە ئەوە بوو کە ڕۆژنامەنووس دەبێ زۆر وریا بێ لەوەی دەینووسێ. نووسینەکەی نابێ لە چوارچێوەی داب و نەریت، دیانەت و یاسای ئەو دەوڵەتەی تێیدا دەژی بچێتە دەرەوە. ئەو دەبێ لەکاتی نووسین زۆر تێبینی ئەو خالانەی سەرەوە بکا. ئەگەر ڕۆژنامەنووس سەری لەو خالانەی سەرەوە دەرنەچێ، لەوانەیە لەسەر نووسین تووشی دادگا و بەلای گەورە ببێ!!!

لەسەر ئەخلاقی ڕۆژنامەنووسی وەك گوتمان لە دەوڵەتێ بۆ دەوڵەتێك جیایە. لە کتێبی ڕۆژنامە دەرکردن نووسەران ئەم نموونەیان لە سەر بابەتی ناوبراو هێناوەتەوە، ( ئەگەر ڕۆژنامەنووسێك لە سەر نانەوایەکی تەمەن ٣٦ساڵی بنووسێ، لەبەر ئەوەی بەسەرخۆشی ئۆتۆمبیلی لێخوڕیوە و یەك مانگ بەند کراوە، سەرنووسەری ڕۆژنامە بەو هەواڵە تێك دەچێ. بەڵام لە هەمان کاتدا سەرنووسەر مەدحی ڕۆژنامەنووس دەکا، ئەگەر بنووسێ سەرۆکی شارەوانی باجی نەدایە)[1].

دەبینین ئەم دەنگوباسانە لە ڕاگەیاندنی سویدی بایەخی زۆری پێدەدرێ، بەڵام لە ڕۆژنامەگەری کوردی تەواو پشتگوێ خراون. ئەگەر پشت گوێ خراون، ئەو مەبەستە ناگەیەنێ، کە لە ڕۆژنامەگەری کوردی بۆشاییەك هەیە، لەبەر ئەوەی باس لەو جۆرە هەوالانە ناکرێن.

1. Åke Edwardson, Kenth Andreasson, Per Andersson-EKStig, Göra tidning. Stockholm, 1998.p.136..



کۆمەڵگەی کوردی لەگەڵ کۆمەڵگەی سویدی تەواو جیایە. لەگەڵ ئەوانەی سەرەوەشدا، ڕۆژنامەنووس بە هیچ شێوەیەك بۆی نییە، لەسەر کەسێك بنووسێ و ناوو وێنەی بلاوبکاتەوە، کە گوایە تاوانێکی گەورەی کردووە، لە کاتێکدا لە دادگا هێشتا تاوانەکەی لەسەر ساغ نەبۆتەوە. زۆر جار ئەگەر کابرا لە ڕاستیدا تاوانباریش بێ، دیسان دەکرێ ناوو وێنەی بلاونەکرێتەوە، چونکە دوور نییە خزم و کەس یان منداڵەکانی بەچاوی سووك لە ناو کۆمەڵدا سەیر بکرێن، ئەوە دەکاتە ئەخلاق لە ڕۆژنامەنووسی. ئێمە باس لەوە ناکەین ئەگەر کابرا بۆ کۆمەڵ ببێتە مەترسییەکی گەورە. ئەوەش وەك بۆ نموونە: کابرا منداڵ دەدزێ و دەیانباتە دەرەوەی ولات بۆ فرۆشتن، یان نەخۆشی ئایدزی هەیە، بۆ ئەوەی جەماوەر ئاگادار بکرێتەوە و بە زووترین کات دەستگیر بکرێ، لەو کاتانە دەکرێ لە ڕاگەیاندن ڕەسمی کابرا بلاوبکرێتەوە. بۆ ئەوەی بە یارمەتی جەماوەر، پۆلیس کابرای تاوانبار دەستگیر بکا. یانیش ئەگەر کابرا بە پارەی دوژمنان بیەوێ، خەڵك تیرۆر بکاو نائاسایی بخاتە ناو کۆمەڵ. ڕووداوێك ببێتە هۆی تێکدانی ژیانی ئاسایی جەماوەر، دەکرێ لە دەزگاکانی ڕاگەیاندن باس بکرێ و ئەگەر کەسێك بەڕووداوەکەوە ببەسترێتەوە وێنەی نیشان بدرێ و بلاوبکرێتەوە. لە دەوڵەتانی ئازاد ئەگەر وێنەی کابرایەکی تاوانبار بلاوبکرێتەوە، یان گوتارێکی نا ڕاست لەسەر یەکێك بنووسرێ، ئەوا نووسەری گوتار مەبەست ڕۆژنامەنووسەکەیە، یان ئەو کەسەی ڕۆژنامەنووسەکەی بە هەواڵی ناوبراو ئاگادار کردۆتەوە، بەرامبەر بە یاسا هیچیان بۆ نابێ، بەڵکو سەرنووسەر بۆ دادگا ڕادەکێشرێ و سزاش لە ڕۆژنامەکە دەستێنن، نەك لە ڕۆژنامەنووس خۆی. چونکە سەرنووسەر نابێ ڕێگا بەبلاوکردنەوەی ئەم جۆرە گوتارانە لە ڕۆژنامەکەی خۆی بدا. ئەوانەی سەرەوە هەرچەندە مەسەلەی ئەخلاقین، بەڵام لە زۆر کاتدا دەبێ سەیری یاسای چاپەمەنیش بکرێ، کە ڕۆژنامە بۆی هەیە چ بلاوبکاتەوە و چ بلاونەکاتەوە.

بە گشتی لە ڕاگەیاندندا دەبێ هەوڵ بدرێ کە تاك هێرشی نەکرێتە سەر و لەناو کۆمەڵدا ڕیسوا نەکرێ. دەبێ هەموو ئەو مافانەی مرۆ لە کۆمەڵەکەیدا هەیەتی بە تەواوی بپارێزرێ و ڕێزی لێ بگیرێ.

ئێمە کە بڕوای تەواومان بە ئازادی چاپەمەنی هەیە، ئەوە ناگەیەنێ کە ڕۆژنامەنووس هەموو شتێك بلاوبکاتەوە و بە ئازادی ڕاگەیاندنی لە قەڵەم بدا. زۆر هەواڵ هەن نابێ لاپەڕەکانی ڕۆژنامەیان پێ پڕ بکرێتەوە، بە تایبەتی ئەو هەوالانەی کە ڕۆژانە ڕوودەدەن. بۆ

نموونە: کابرایەك تەلەفۆن بۆ سەرنووسەری ڕۆژنامەیەك یان ڕۆژنامەنووسێك دەکات و دەڵێ بەیانی یان پاش چەند ڕۆژێکی تر لە فلانە شوێن، بۆمبایەك دەتەقێتەوە. ئەو کارانە هەرچەند زیاتر لە ئەوروپا دەکرێن، بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا لە ڕۆژنامەکانیان بلاّوناکەنەوە. کە ئەم هەواڵە بلاّوناکەنەوە، مەبەست ئەوە نییە، کە بڕوا بە کابرا ناکەن، بەڵکو بە ڕێگای خۆیان پۆلیس ئاگادار دەکەنەوە و کارەکە پۆلیس لە جیاتی ڕۆژنامەنووس پێی هەڵدەستێ. ئەگەر بۆمباکە بتەقێتەوە ئەوا بێگومان هەواڵی ناوبراو شایەنی بلاّوکردنەوەیە.

مەبەست لە بلاّونەکردنەوەی ئەو جۆرە هەوالانە تەنیا نەشێواندنی کۆمەڵە. ئەوان نایانەوێ خەڵك نەتوانێ لە ماڵی خۆی بە ئاسوودەیی دابنیشێ و بژی. لەو جۆرە هەوالانەی سەرەوە گەر خەڵکی زۆر پێی بزانن، لەوانەیە لە ڕۆژنامەکان بلاّوبکرێتەوە. چونکە لەو کاتە ڕۆژنامەنووس ئەو مافەی نییە کە نهێنی لە جەماوەر بشارێتەوە.

پیشەی ڕۆژنامەنووسی پیشەیەکی زۆر پیرۆزە و بەرپرسیارەتی زۆر گرنگی لەناو کۆمەڵدا لە سەر شانە. بۆ ئەوەی ڕۆژنامەنووس بە خۆی بڵێ من ڕۆژنامەنووسم و پسوولەی ڕۆژنامەنووسێتی پێبێ، دەبێ خاوەنی کەرامەت بێ و خۆی بەم و بەو نەفرۆشێ. جگە لەوانەش بە هیچ شێوەیەك برادەرایەتی، پارە، دەسەلاّت کار لە ناوەڕۆکی نووسینەکانی نەکا. ئەگەر بە پێچەوانەی ئەم نووسینانە بێ بەڕای من ئەوە ڕۆژنامەنووس نییە و بەڵکو تووتی یان بڵندگۆی ئەو دەزگایەیە کە کاری تێدا دەکا.

ڕۆژنامەنووس بۆ خۆی نانووسێ، بەڵکو بۆ جەماوەر دەنووسێ، بۆیە دەبێ بیر لە هەموو ئەو وشانە بکاتەوە، کە لە گوتارەکەی بەکاری دەهێنێ. جگە لەوەش دەبێ مەسەلەی ئەخلاق بە هیچ شێوەیەك پشتگوێ نەخرێ. ئەگەر ڕۆژنامەنووس لە کاتی نووسین بیری لەو بۆچوونانەی سەرەوە کردەوە، بێگومان نووسینەکەی جگە لەوەی بێ کەم و کورتی دەبێ، زۆر خزمەتی ئەو کۆمەڵگەیەش دەکا کە خۆی لە ناویدا دەژی.

ڕۆژنامەنووس بۆ ئەوەی کەرامەتی خۆی و قودسیەتی پیشەکەی بپارێزێ ، نابێ بە هیچ شێوەیەك گوتارێك بنووسێ، کە خۆی بڕوای تەواوی بە نێوەڕۆکەکەی نەبێ.

جگە لەوانەی سەرەوە، سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی سوید، لەگەڵ کۆمەڵەی خاوەن ئیمتیازی ڕۆژنامەکان، کۆمپانیای ڕادیۆ و تەلەفزیۆن، دەربارەی ئەخلاقی ڕۆژنامەنووسی لەسەر ئەم خالانەی خوارەوە دەمێکە پێك هاتوون:



١- ڕۆڵی ڕاگەیاندن لە کۆمەڵدا پێویستی بە ڕاستی و دروستی هەواڵ و نووسینەکان هەیە.

٢- بەڕەخنەوە سەیری سەرچاوەکانی هەواڵ بکە، بە چاکی کۆنترۆڵی هۆی ڕووداوەکە بکە و ئەگەر لە کاتێکدا پێشتریش هەمان هەواڵ بلاّوکرابێتەوە. ئەو ئازادییە بە خوێنەران بدە کە جیاوازی لە بەینی فاکت و کۆمێنتاری خۆت بکەن.

٣- سەر دێر و چەند خەتی دوای سەردێر دەبێ ڕەنگدانەوەی هەواڵ و نووسینەکە بن.

٤- بە وردی لە دەکۆمێنت و وێنەکان بکۆڵەوە، کە ڕاستن و بۆ مەبەستی کەسانێك بەکارناهێنرێن.

٥- دەنگوباس و هەواڵی هەڵە دەبێ ڕاست بکرێنەوە.

٦- ئەو ڕەخنەیەی لە ڕۆژنامەکەت دەگیرێ، لەسەر بلاّوکردنەوەی هەواڵی هەڵە، بە بێ درەنگ کردن، یەکسەر لە ڕۆژنامەی خۆت بلاّویان بکەوە.

٧- ئەو شتانە بلاّومەکەوە کە تایبەتن بە ژیانی تایبەتی کەس لە کاتی پشوودانی. (کارو پشوودان تێکەلاّو مەکە).

٨- ئەو هەوالانەی پێوەندییان بە خۆ کوژی و هەوڵدان بۆ خۆکوشتن هەیە بۆ ڕێز لێنان لە خزم و کەس و کاری کابرا، لە ڕۆژنامەکەتدا بلاّوی مەکەوە.

٩- لە کاتی نووسیندا ڕێزی زۆر بەرامبەر ئەو کەسانەی تاوانیان کردووە نیشان بدە، تا دەکرێ ڕەسمی تاوانبار لەگەڵ ناوی بلاّومەکەرەوە، بۆ خاتری خزم و کەسی کابرا.

١٠- ڕەگەزی کابرا، نەتەوەی ، دیانەتی، پیشەی، سەر بە چ پارتێکی سیاسییە... هتد بلاّومەکەوە.

١١- بیر بکەوە کە ئەو کەسە تاوانبارەی تۆ لەسەریت نووسیوە، لە ڕوانگەی یاساوە کابرا تەنیا لەو کاتەدا تاوانبارە، پاش ئەوەی حاکم حوکمی لە سەر دەدا.

ئەوانەی سەرەوە لەسەر ئەخلاقی ڕۆژنامەنووسان خالی بنەڕەتی بوون. نووسەران چەند خالێکی تریشیان لە کتێبەکەیان لە لاپەڕە ٢٣٢- ٢٣٣ کە بە زمانی سویدیە نووسیوە. بەلاّم من بە پێویستم نەزانی ئەوانیش بۆ خوێنەرانی کورد لەو کتێبە بنووسمەوە.

لەسەر پیشەی ڕۆژنامەنووسیش بەڕای نووسەرانی سەرەوە، ڕۆژنامەنووس باشە ئەو خالانەی خوارەوە پەیڕەو بکا:

١- بە داواکاری یەکێك لە دەرەوەی دەستەی نووسەرانی ڕۆژنامەکەت، دەست بە نووسینی گوتار مەکە.

٢- لە لایەن خەڵکی دەرەوەی ڕۆژنامەکە نابێ بە هیچ شێوەیەك دیاری، بانگ کردن بۆ شوێنی تایبەتی یان بەرتیل وەربگیرێ. ئەو خاڵانەی سەرەوە گومان دەخەنە سەر ئازادی ڕۆژنامەنووسی.

٣- پیشەی خۆت بۆ کاری تایبەتیت، بۆ بەرژەوەندی خۆت یان کەسانی تر دوور لە کاری ڕۆژنامەنووسی، بۆ خەڵك پێ ترساندن بە کارمەهێنە.

٤- بۆ بەرژەوەندی خۆت، یان کەسی تر و هەواڵی سیاسی یان ئابووری بڵاونەکراوە بەکارمەهێنە.

٥- ڕێز لەو کەسەی ئینتەرڤیوی لێ وەردەگری بگرە.

٦- ناوەرۆکی ئینتەرڤیو یان دەکۆمێنت مەشێوێنە و تەزویر مەکە.

ئەوانەی سەرەوە بەندە گرنگەکانی یاسا و ئەخلاقی ڕۆژنامەنووسی بوون. هەر چەندە ئەو خاڵانەی سەرەوە بۆ ڕۆژنامەنووسانی سویدی نووسراون، بەڵام باوەڕ ناکەم، بۆ ڕۆژنامەنووسانی کورد بێ سوود بن. ئێمە ئەگەر چی خەڵکی دەوڵەتی جیاین، یان ئایینی جیامان هەیە، وەك ئادەمیزاد، لە هەموو شوێنێك هەست هەیە و هەموومان بە چەند ڕووداوێك دەگرین و بە چەندی تریش پێدەکەنین. بە تایبەتی بە هۆی تەلەفۆن وئینتەرنێت کەناڵە زیندووەکانی تەلەفزیۆن، پێوەندی نێوان ئادەمیزاد قەت وەك ئەمڕۆ لە یەکتر نزیك نەبووە.

کە ئێمە باس لە ئەخلاقی ڕۆژنامەنووسی دەکەین، مەبەستمان ئەوەیە لەکوێندەر سنوور دابنێین، لەنێوان کار و ژیانی تایبەتی. ئەوەی پێوەندی بەکارەوە هەیە، هەموو کاتێك دەکرێ بڵاو بکرێتەوە. بەڵام ئەوەی پەیوەندی بە ژیانی تایبەتییەوە هەیە، تەنیا لەکاتی زۆر پێویست دەکرێ بڵاو بکرێتەوە. بەڵام ئەمەش شایەنی لێکۆڵینەوەیە.

ڕۆژنامە و ڕادیۆ لەگەڵ تەلەفزیۆن، ڕۆڵی زۆر گرنگ لە کۆمەڵدا دەگێڕن. پێشکەوتن یان گەڕانەوەی دواوەی پارتە سیاسییەکان لە دەوڵەتانی ئازاد و دیموکراتدا، ڕاستەوخۆ بەندە بەوەی کە چۆن پرسیارەکان لە دەزگاکانی ڕاگەیاندن بەرز دەکرێنەوە. بۆیەش دەزگاکانی ڕاگەیاندن ڕەنگدانەوەی ژیانی ڕۆژانەی گەلیشن.

وێنەکانی تراژێدیای هەڵەبجە، سەدان ملیۆن کەسی لە دەرەوەی کوردستان غەمبار کردووە. وێنەکانی سەردەمی شەڕی ڤێتنام و یوگسلاڤیاش بە هەمان شێوە. جگە لەو خاڵانەی لە سەرەوە ناومان هێنان، هەموو نووسینێك پەیوەندی بە نووسەر خۆیەوە هەیە، کە چەند دەتوانێ لە کاتی نووسین بیر لە ئەخلاقی ڕۆژنامەنووسی بکاتەوە.



## هەڵسەنگاندن

ڕیسێنسیۆ Resensio وشەیەکی لاتینییەو بەکوردی دەکاتە: هەڵسەنگاندن، سەیرکردنەوە، گەیاندن، پلەدانان، نووسین لەسەر شتێك.

دەتوانین هەڵسەنگاندن وەك ژانرێك کە ناوەرۆکەکەی لەسەر بەرهەمێکی ئەدەبی، هونەری، بەرنامەی تەلەفزیۆن، فیلمی سینەمایی...هتد بنووسین.

ریسێنسیۆ بەرهەمێك یان دوو بەرهەم سەیر دەکاو لەسەر ئەوان ناوەرۆکەکە هەڵدەسەنگێنێ[1].

ڕۆژنامەنووس ئەگەر زۆر بەوردی چووە ناو بابەتەکە و بەدرێژی باسی لێوەکرد، لەوکاتە نووسینەکەی لە هەڵسەنگاندن دەبێتە گوتارێکی ڕەخنەگرانە.

هەڵسەنگاندن دەبێ ڕاست و ڕەوان بێ بۆ خوێنەر، بینەر، گوێگر.

کاری گرنگی هەڵسەنگاندن ئەوەیە کە ئەو لایەنە نیشان بدا کە لە لایەن خوێنەران روون و ئاشکرا نییە. ئەو هەڵسەنگاندنەش لە ڕاستیدا زۆر گرانە ئەگەر ڕۆژنامەنووس شارەزای تەواوی بابەتەکەی نەبێت.

هەرچەندە ڕۆژنامەنووس بەتوانا و پسپۆربێت لە بوارەکەی خۆیدا، نووسینەکەی ئەوەندەی تر باش دەردەچێ.

ئامانجی سەرەکی ریسێنسیۆ ئەوەیە کە وا لەخوێنەر بکات کە کتێبی ناوبراو دەهێنێ بخوێنرێتەوە، یانی یارمەتی خوێنەر دەدات کە چاکتر لە کتێبەکە بگات. وەك دەزانین نووسین

1. А.А.Тертычный, Жанры периодической печати. М., 2000-С.142..

بەگشتی بۆ خوێنەری تایبەت دەنووسرێ وەك: گەنج، پیر، منداڵ...هتد. هەر بۆیە لەکاتی نووسین دەبێ ڕۆژنامەنووس زۆر مەوزوعییانە نووسینەکەی بنووسێ. ئەوەش دەستنیشان بکا کە چ شتێك لەم کتێبە نوێیە و چ شتێکیش گرنگترین بابەتی کتێبەکەن. بەم دوایانەو لە ڕاگەیاندنەکاندا زیاتر یەك لایەنی نووسینەکان باس دەکرێن، ئەوەش وەك: تەنیا باسی نووسەرەکە دەکا، یان باس لە ڕێژیسۆرەکە...هتد. ئەگەر نووسینەکە، فیلمەکە باش بێت، دەڵێت باشە لەبەر ئەوەی ئەو کتێبە باس لەو بابەتە دەکات، ئەگەر کتێبەکەش خراپ بێت دەڵێت خراپە لەبەر ئەوەی باس لەوە... ناکات. هەڵسەنگاندن لەسەر فیلم، باس لە ناوەرۆکی فیلمەکە دەکات و لێرەش ئەگەر فیلمەکە باش و سەرنج ڕاکێش بێت، نووسەر بۆ ڕۆژنامە و گۆڤار دەینووسێ و بۆ بەرنامەی رادیۆ تەلەفزیۆن باس دەکا و دەڵێ فیلمەکە باشە لەبەر ئەوەی... ئەگەر فیلمەکەش خراپ بێت، دەڵێ فیلمەکە خراپە لەبەر ئەوەی... لێرە باس لە هۆکانی دەکات.



## پوختە

ژانری پوختە لە ڕۆژنامەنووسی یانی: باسکردن، سەرەنجامی باسەکان، نووسینەکان یان باسەکان دەگرێتەوە. کە باس لە پوختەی ڕاگەیاندن دەکەین مەبەست لە باسکردن لەسەر ئەو بلاوکراوانەیە وەك: ئەدەبی، بلاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخش، یان بەرنامەکانی رادیۆ یان تەلەفزیۆن. ئامانج لە نووسینی ئەو ژانرە ئەوەیە کە جەماوەر لە ناوەرۆکی بەرنامەکان یان ڕۆژنامەکان ئاگادار دەکرێتەوە[1].

بەشێوەیەکی مێژوویی ئەم ژانرە لە سەرەتادا هی چاپەمەنییەکان بوو، بەزۆربوونی ڕۆژنامەو گۆڤار، نووسینی ئەو ژانرە بووە ڕۆتینێکی پێویست بۆ خوێنەران بۆ ئەوەی بزانن لەسەر چ بابەتێك دەنووسن و بۆ چیش دەنووسن. لەو نووسینانەش خوێنەران لە ناوەرۆکی ڕۆژنامە ئاگادار بکەنەوە. لە سەردەمی یەکێتی سۆڤێت ژانری ناوبراو بایەخی زۆری پێدەدرا. ڕۆژنامەنووسەکان لە ڕوانگەی سیاسەتی حیزبەوە دەیانڕوانییە ناوەرۆکی ڕۆژنامەو گۆڤارەکان. لەو کاتە ژانری پوختە یارمەتی حیزب دەدا کە چۆن چارەسەرێك بۆ فلانە کێشە دۆزراوەتەوە. نووسەری ژانری ناوبراو دەبوایە سەیری نووسینەکان لە ڕوانگەی سیاسەتی حیزبەوە بکات. چاپەمەنی باس لە ناوەرۆکی رادیۆ و تەلەفزیۆن دەکا و رادیۆ و تەلەفزیۆنیش باس لە ناوەرۆکی ڕۆژنامەو گۆڤارەکان دەکات.

---

١. هەمان سەرچاوەی پێشوو. ل١٨٥.

# ژانری لێکۆڵینەوە

لەساڵی ١٩٩٤ لەسەر داواکاری کریستینا یوتتێسترێم Christina Jutterström بەشێکی نوێ بەناوی (ڕۆژنامەنووسی لێکۆڵینەوە) لە ڕۆژنامەی داگینس نیهێتەری سویدی دامەزرا[1].

مەبەست لە کردنەوەی ئەو بەشە، لێکۆڵینەوە و ڕاوەستان لەسەر بابەتێك، نووسین بەتێری لەسەر بابەتی دیارکراو، ئاشکرا کردنی شتی شاراوە.

ئەنجامی کاری ئەو، ئاشکرابوونی کاری سیگڤارد ماریاسینسSigvard Marjansins بوو. لە مانگی شوباتی ١٩٩٦ لە ڕۆژنامەی داگینس نیهێتەر، گوتارێکی لەسەر گەشت و پارە خەرجکردنی پارێزگاری پێشتر، سیگڤارد ماریاسینس بلاّو کردەوە[2].

لەناو گوتارە بلاّوکراوەکە، هەندێك ناوەڕۆکی پسوولەکان بڕدرابوون. ئەوەش بووە هۆی ئەوەی کە لێژنەی تایبەتی هەڵسا بەلێکۆڵینەوەی گەشتەکەی پارێزگار. لەئەنجامدا، لێژنەی ناوبراو ڕەخنەی توندی لەپارێزگار گرت. تا هاوین چەند گوتارێکی تر لە ڕادیۆ و تەلەفزیۆن و ڕۆژنامەکان بلاّوکرانەوە. سیگڤارد ماریاسینس بۆ ماوەی چەند مانگێك بووە گەورەترین هەواڵ لە ڕاگەیاندنەکانی هەموو سوید. لە باسکردنەکاندا کەس پشتگیری لە سیگڤارد ماریاسینس نەدەکرد. کابرا ڕاکێشرایە دادگا، بەلاّم لەوێ ئازاد کرا. یاسازان و دادوەرەکان، لە وبڕوایە

1. Stig Hadenius, Lennart Weibull, Massmedier. Falun, 2003.p.362..

٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو. ل.٣٦٢.

دابوون کە دەزگاکانی ڕاگەیاندن، کابرایان تاوانبار کردووە، بێ ئەوەی بەسەر یاساکان زاڵبن و باش لێی بزانن. ئەوان لەو بڕوایەدا بوون کە ئەخلاق و یاسا دوو شتی جیان.

سیگڤارد ماریاسینس یەك لەو کەسانە بوو کە ڕۆژنامەنووسان لێکۆڵینەوەیان لەسەر کرد، چونکە لەساڵی ١٩٩٠ یاسای تایبەت بۆ گەشت و گوزاری پارێزگارەکان لە سوید دەرچوو. ئەم یاسایە باس لەوە دەکات کە چۆن لە گەشت و گوزاردا پارەی دەوڵەت خەرج بکرێت.

ئەم جۆرە گوتارانە لە سەرەتادا زیاتر لە شارە گەورەکان و ڕۆژنامەکانیان دەکرا. دواتر بۆ ڕاگەیاندنی شارۆچکەکانیش پەرەی سەند.

ئاشکرا کردنی دەستەلاتدارانی میری لە شارۆچکەی مۆتالا نموونەی زەقی شاری بچکۆلەن. بەڕێوەبەرانی شارەوانی شاری مۆتالا، بەپارەی دەوڵەت چەند گەشتێکیان کردبوو. لەو گەشتانەدا پارەی زۆرتریان، لەوەی کەدەبوایە خەرج بکەن، خەرج کردبوو. بەئاشکرا کردنی، ئەم گەشتانەیان، هەموو بەڕێوەبەرانی شارەوانی، دەستیان لە کار کێشایەوە. هەر ئەوانیش بەدادگا دران و سزای خۆیان وەرگرت.

ڕۆژنامەنووس و سەرنووسەرانی دەنگوباسەکان، زیاتر وەك بێلایەنێك کار دەکەن، ئەگەرچی ڕۆژنامەکانیان، سەر بە پارتە سیاسییەکانن.

ڕۆژنامەنووس دەبێ بزانێ چ بابەتێك بەرز بکاتەوە. زۆرکەس لەو بڕوایەدان، کە ڕۆژنامەنووسان، کەمتر ڕای خۆیان لە ڕاگەیاندنەکان دەردەبڕن. ئەوەش زیاتر لەبەر ئەوەی کە هەواڵ زۆرتر و زووتر دەگەنە دەزگاکان.



## نامە

نامە وەك ژانرێکی ڕۆژنامەنووسی لە ئەنجامی پێویستی تاك، پێوەندی نێوان تاك و ڕۆژنامەنووس پەیدا بوو. بلاوکردنەوەی نامە لە ڕۆژنامە ناکاتە گۆڕینەوەی نامە لەنێوان دوو کەس. ئەوەش لەبەر ئەوەی بلاوکردنەوەی نامە دەکاتە گەیاندنی نامە بۆ کۆمەڵێکی زۆر لەخوێنەران. هەندێك جار ژمارەی خوێنەران دەگاتە چەندین هەزار و هەندێك جاریش ژمارەیان زۆر لەوە زیاترە. بۆیە لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکان تەنیا ئەو نامانە بلاودەکرێنەوە کە ناوەرۆکەکەی بۆ زۆر کەس گرنگە.

بلاوکراوەکانی وەك نامە زۆرجار بەناوی ئێپیستۆلە Epistola کە بەکوردی دەکاتە "گەیاندن" بەناوبانگن. بۆیەش زۆرجار ئەم ژانرە بە گەیاندنی ئێپیستۆلیش بەناوبانگە[1].

زۆرجار لە ڕۆژنامە و گۆڤار بەناوی نامەی خوێنەران لاپەڕەی تایبەت هەیە. ئەوەش ئەوە دەگەیەنێت کە نووسەری نامە لە ڕۆژنامە کار ناکات، بەڵکو نامەکە بەڕێگای پۆستەوە یان بەدەست گەێنراوەتە دەستەی نووسەرانی ڕۆژنامە یان گۆڤار.

نامە زۆرجار بۆ کەس دەنووسرێت، خوێنەر، بینەر، گوێگر لە ناوەرۆکی نامە داوا لە کەسی بەرامبەری دەکا کە کارەکان، گرفتەکان چارەسەر بکات، یانیش لە پرسیاری دیارکراو دەیەوێ سەرکردەکان ئاگادار بکاتەوە.

نامە باشترین سەرچاوەی نووسینە بۆ ڕۆژنامەو ڕۆژنامەنووس. لە نامەی خوێنەران، ڕۆژنامەنووس بابەتی پێویستی بۆ نووسینەکەی خۆی دەست دەکەوێت، ئەوەش دەکاتە

1. A.A.Тертычный, Жанры периодической печати. М., 2000-С.212.

پەیوەندی بەهێز لەنێوان ڕۆژنامە و جەماوەر. نامەی خوێنەران سەرچاوەیەکی گرنگن بۆ بەرەوپێشڤە بردنی دیموکراتیەت لە ولاّتدا.

هەموو نامەیەك دەکومێنتێکی مرۆڤە. دەنگی کەسێکە یان دەنگی چەند کەسانێکن، بۆیەش کارکردن لەگەڵ نامە، کار کردن نییە لەگەڵ کاغەز، بەڵکو کارکردنە لەگەڵ مرۆڤ[1]. بۆ ڕۆژنامەنووس و خەڵکی هونەرمەند نامە سەرچاوەی گرنگن بۆ لەدایك بوونی بیری نوێ.

بەهۆی نامەوە دەستەی نووسەران زۆر باشتر شارەزای کۆمەڵ دەبن. لە ڕادیۆ و بەرنامەکانی تەلەفزیۆن ئێستا رۆڵی نامە کەمترە، (باس لە نامەی ئەلیکترۆنی ناکەین) زۆرتر بینەران و بیسەران بەتەلەفۆن بیر و ڕایان لەسەر پرسیاری دیارکراو دەردەبڕن. ئەو ڕادەربڕینە، جگە لەوەی بنەمای دیموکراتیەت بەهێز دەکا، زۆربەی جار بەرنامەکانیش زۆر زیندووتر دەکات، بەتایبەتیش ئەگەر ئەو کەسەی بەرنامەکە بەڕێوە دەبا، ڕۆژنامەنووسی چاك بێ.

1. С.М.Гуревича, Работа с письмами в редакции. М., 1991- С.7.



## فلیتۆن

فلیتۆن وشەیەکی فەرەنسییە و پێی دەڵێن فێیولیێ Feuille بەکوردی دەکاتە پەڕ، لاپەڕە، ئەوەش لەوەوە هات کە لە سەدەی هەژدە هەندێك جار لاپەڕەی زیادیان دەخستە ناو ڕۆژنامە. بە کوردی دەڵێین "پاشکۆ". ئەو پاشکۆیانەش لە ئەوروپا لە سەدەی هەژدەوە دەست پێدەکات[1].

(بە زمانی روسی بە فلیتۆن دەڵێن "فێللیێتۆن". ئەم شێوە نووسینە بەزمانی کوردی گران دێتە سەر زار، بۆیە من نە روسیەکە و نە فەرەنسیەکەم بەکار نەهێناوە. وەك دەڵێن کلاّوێکی کوردیم لەسەر ناوە و پێی دەڵێم فلیتۆن). کاری نووسەری فلیتۆن لەوە دەست پێدەکات کە بەوردی بیر لە بابەتەکە بکاتەوە و چاك لە فاکتەکان بکۆڵێتەوە، چونکە لێکۆڵینەوە لەسەر فاکتەکان تەنیا پێداچوونەوە بەسەر بابەتەکە نییە، بەڵکو قسەکردن لەگەڵ خەڵکی پسپۆر و لێکۆڵینەوە لەسەر دەکومێنتەکان، دەکاتە قووڵ بوونەوە لەسەر بابەتەکە، ئەوەش دەکاتە چاکتر شارەزا بوون لەسەر پرسیاری دیارکراو، بەم شێوەیە پرۆسێسی نووسینەکە بۆ ڕۆژنامەنووس ئاسانتر دەبێت.

بیری قووڵ، بابەتی ڕوون، باشتر بیرکردنەوە لەسەر هەڵبژاردنی بابەتەکە، نووسینەکە بەهێزتر دەکەن. ئەوانەی سەرەوەش یارمەتی نووسەر دەدەن بۆ ئەوەی نووسینێکی چاك لەدایك ببێت.

لە چاپەمەنی و ڕاگەیاندنی ئێستا فلیتۆن تەنیا باس لەیەك ژانر دەکات، ئەویش بە ژانری فلیتۆن بەناوبانگە. سەڵتیکۆڤ شیدرین نووسەری روس یەك لەو کەسانەبوو کە لە سەدەی نۆزدە

1. А.А.Тертычный, Жанры периодической печати. М., 2000-С.258

بایەخی زۆری بەو ژانرە دا. ئەم ژانـرە چـاپەمەنی سـۆڤێتیش بایـەخی زۆری پێـدا، بـەلاّم لـە سەردەمی ریفۆرم دەتوانرێ بگوترێ کە ئەم ژانرە تەواو پشتگوێ خـرا، ژانـری فلیتـۆن دەکاتـە **پێکەنین بە شتی خراپ**.

لە سەردەمێك کە دەیان کـەس لەسـەر دەسـتەلاّت خـەبات دەکـەن، ئـەم ژانـرە نـاتوانرێ بەگوێرەی پێویست سوودی لێوەربگیرێ. بۆیە لە سەردەمی ئاشتی و ئاسایش، ئەم ژانرە شوێنی لە ڕاگەیاندنەکان باشتر دەبێتەوە. لەکاتی نووسینی فلیتۆن، فاکت زۆر گرنگە، لەسـەر ڕووداوی تراژێدی نابێت فلیتۆن بنووسرێت، فلیتۆن تەنیا لەسەر یەك فاکت نانووسـرێت، بـەڵکو لەسـەر هەموو کێشەکە[1].

کارکردن لەسەر ژانری فلیتۆن، پێویستی بە پسپۆری زۆر بەتوانا هەیـە. ئـەم ژانـرە کـە ژانرێکـی ئەدەبی- ڕاگەیاندنە، زمـان شـوێنی تایبـەتی خـۆی هەیـە. بۆیـە لەنووسـینی فلیتـۆن، هەڵـەی زمانەوانی بەهیچ شێوەیەك جێگای نابێتەوە. بچووکترین هەڵـەی زمانـەوانی، دەبێتـە تێکـدان و سەقەت بوونی هەموو نووسینەکە. ئەگەر بەزمانێکی ڕاست و ڕەوان بنووسرێت، خوێنەر بەباشـی هەستی پێدەکا و تامی زۆرتر لە خوێندنەوەی دەکا.

---

١. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل.٢٥٨.



# بەشی دووەم

# راگەیاندن

# راگەیاندن

بەگوێرەی ڕێکخراوی یونسکۆ، ئۆرگانی نەتەوە یەکگرتووەکان، هەر ڕۆژنامەیەك هەفتەی چوار جار دەربچێ ڕۆژنامەی ڕۆژانەی پێ دەگوترێ.

لە سەردەمی ڕۆمەکان جەماوەر زۆر پێویستی بەزانینی هەواڵ و دەنگوباس هەبوو. ئەوەش زیاتر بۆئەوەی مرۆڤ بەئاسانتر ئاگاداری تەواوی ڕووداوەکانی ناو ئیمپراتۆریەت بێت. هەربۆیەش پێش دوو هەزار ساڵ کارگەی نووسین هەبوون. (سەیری بەشی سەرهەڵدانی ئەلف و بێ بکە). لەو کارگانەش یەکێك نووسینەکانی دەخوێندەوە و بەند و عەبدەکانیش دەیان نووسییەوە. ئەو کۆیلانە کاریان نووسینەوەی هەواڵ و ڕووداوە گرنگەکان بوو. خەڵکی ناودار و بەناوبانگی ناو ئیمپراتۆریەت، ئەو هەواڵانەیان دەکڕین[1].

زۆری نەخایاند بەوەی کە بلاْوکردنەوەی هەواڵ و دەنگوباس وەك ڕۆژنامە سەیر بکرێ. بۆیەش ناونران ئەکتە دیورنە Acta Diurna کە بەکوردی دەکاتە هەواڵی ڕۆژانە. لە سەدەکانی ناوەڕاست، بلاْوکردنەوەی لەم جۆرە هەواڵانە لەلایەن کەنیسەی کاسۆلیکەکان دەردەچوون.

لە سەرەتای ١٦٠٠ بلاْوکراوەی ڕێك و پێك و بەردەوام کە لە ڕۆژنامەیان دەکرد چاپدەکران و بۆیەش لەو کاتە زەمینەی سیاسی و ئابووری بۆ دەرکردنی ڕۆژنامە لەبار بوو.

شەڕی سی ساڵەی ١٦١٨-١٦٤٨ زیاتر کاری کردە سەر پێشکەوتنی ڕۆژنامە. ئەوەش لەبەر ئەوەی کە مرۆڤ پێویستی بە هەواڵ و دەنگوباسی شەڕ هەبوو. ڕۆژنامەکانی ئەو کاتە

---

1. Stig Hadenius, Lennart Weibull, Massmedier. Falun, 2003.p.40.

پەیامنێریان نەبوون و خەڵكیان دانەدەمەزراند بۆ كاركردن و ڕۆژنامە بەڕێوەبردن. گوتارەكـان و نووسینەكان لەلایەن سەرنووسەر لەگەڵ هەندێك نووسەری لابەلا دەنووسران.

یەكـەم ڕۆژنامــە لــە ســوید بــەناوی ئۆردینــاری پۆســت تیدێنــدەر Ordinari Post Tijdender دواتر پۆست-ئۆك ئینریكس تیدنینگـەر Post-och Inrikes Tidningar لـە ساڵی ١٦٤٥ دەرچوون. لەوكاتە سەركردەی سویدی Axel Oxenstierna بینی كـاتی ئـەوە هاتووە، پڕوپاگەندەی خۆی بەچڕی بكـات. ئـەو دەیویـست بۆچـوونی خـۆی لەسـەر شـەڕەكە ڕوونبكاتەوە و ڕای خۆشی لەسەر شەڕەكە دەربڕێت[1].

ڕۆژنامەی ئۆردیناری پۆست تیدێندەر هەفتەی جارێك دەردەچوو. ئابۆنـەی سـالآنەش دوو داڵ و هەشت ئۆرەبوو. زۆركەس ئەو پارەیەی نەبوو كە ڕۆژنامەكە بكڕێ.

بلاّوبوونەوەی مەكینەی چاپ، بووە هـۆی دەرچـوونی ڕۆژنامــەی زۆر، نـەك بەرزبوونـەوەی تیراژی زۆر. ئەوەش زیاتر لەبەر ئەوەی چونكە لەوكاتە بەربەستی زۆر دەخرانـە بـەر دەرچـوونی ڕۆژنامە. سیاسییەكان و دەستەلاّتدارانی ئەوكاتە لە بلاّوبوونەوەی دەنگوباس زۆر دەترسان كـە كاری نێگەتیڤ و خراپ بكاتە سەر جەماوەر. جگە لەوەی باسمان كرد، نرخی ڕۆژنامەكان بـەرز بوون و خەڵكیش ئەوەندە خوێندەوار نەبوون. بەكورتی بازاڕی ڕۆژنامەكان ئەوەندە گەرم نەبوو.

لەگەڵ پەیدابوونی پرینسیپەكانی ئازادی ڕۆژنامە لە سەدەی حەڤـدە، ڕۆژنامــەكان باشـتر و ئاسانتر بلاّو دەكرانەوە، بەلاّم دیسان تیراژیان هەر كەم بوو.

بە پەرەسەندنی شۆڕشی پیشەسازی، دەركردنی ڕۆژنامە بووە كارێكی پێویست. دەركردنـی ڕۆژنامەكان بوونە كارێكی ڕۆتینی و خوێندنەوەشـی بــووە پێویـستییەك بـۆ زۆر لەوانــەی كـە ئارەزوویان بوو بزانن چ لـە ولاّتـانی دەرەوە ڕوو دەدات. پێـشكەوتنی پیـشەسازی، ڕاسـتەوخۆ كاری كردە سەر بەرزبوونەوەی تیراژی ڕۆژنامەكان.

١. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل.٤١.



**ژمارەی فرۆشتنی ڕۆژنامە لە هەزار كەس ساڵی ٢٠٠١**




**سەرچاوە:** Word Press Trends 2002 Edition **لەكتێبی مەسسمێدیام وەرگرتووە**

یەکەم ئامێری خێرای چاپ، لە ڕۆژنامەی The Times لە لەندەن ساڵی ١٨١٤بەکار هات. دامەزراندنی ئامێری نوێ لەلایەن کرێکارەکانەوە زۆر بەتوندی دژایەتی دەکرا[١].

ئەوان دەترسان کە زۆر لە کرێکارەکان کار لەدەست بدەن. تا ئەو کاتە وەك سەردەمی یوهان کوتنبێرگ پیت ڕێکخستن بەدەست بوو. پەیدابوونی ئەو جۆرە ئامێرانە کاری دەرکردنی ڕۆژنامەی زۆر خێراتر و ئاسانتر کرد. لە هەمان کاتدا، پەیدابوونی کاغەزیش ئاسانتر و هەرزانتر دەست دەکەوت.

بە دروستبوونی شەمەندەفەر، دۆزینەوەی تەلەفۆن، کاری چاپ و بڵاوکردنەوەی هەواڵ و دەنگوباس خێراتر بوو.

لە ساڵی ١٨٣٣ لە شاری نیۆیۆرك ١٩ هەزار دانە ڕۆژنامە لە ڕۆژێکدا دەفرۆشرا[٢].

ڕۆژنامەکانی ئەوکاتە قەبارەیان تەنیا چوار لاپەڕە بوو و بەناوەرۆکێکی زۆر ڕژد. هەواڵ لە ڕۆژنامەکان لاواز بوون و زیاتر گوتاری سیاسی و گوتار لەسەر ئابووری وڵات دەنووسران. ڕۆژنامە بەناوەرۆکی جددی و نرخی گران، کاری کردە سەر بەرز نەبوونەوەی تیراژی ڕۆژنامەکان.

بە پەیدابوونی ڕۆژنامەی The Sun لە ساڵی ١٨٣٣ لەلایەن بنیامین هـ. دەی Benjamin H. Day، بازاڕی ڕۆژنامە تەواو گۆڕدرا. ڕۆژنامەی ناوبراو لەبەر نرخ هەرزانی کە تەنیا یەك پێنی بوو، بووە یەکەمین ڕۆژنامەی جەماوەری، کە خەڵکی زۆر دەیانخوێندەوە. ستایلی (شێوەی) نووسینی ئەم ڕۆژنامەیە بەبەراورد لەگەڵ ڕۆژنامەکانی سەردەمی خۆی ئاسان و ڕوون بوو. ئامانجی بنیامین لەم شێوە نووسینە ئەوەبوو کە زۆربەی هەرە زۆری جەماوەر لەخوێندنەوەی تێبگا. ئەم شێوە بەڕێوەبردنەی ڕۆژنامە و دەرکردنی، تا ئەمڕۆش لە زۆربەی دەوڵەتانی جیهان پەیڕەو دەکرێ. ڕۆژنامەی ز سەن لە ساڵی ١٨٣٦ تیراژی گەیشتە ٣٠ هەزار دانە.

دوای دەرکردنی ڕۆژنامەی ز سەن، لە شاری نیۆیۆرك ڕۆژنامەی دووەم بەناوی ز نیۆیۆرك هێراڵد The New York Herald دەرچوو. ئەم ڕۆژنامەیە زیاتر لەسەر کێشە

١. هەمان سەرچاوەی پێشوو. ل.٤٦.

٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل.٤٧.



کۆمەڵایەتییەکان و دەنگوباسی زەق وەك: نووسینی ڕیپۆرتاژ لەسەر تاوان، سێکس، لەگەڵ نووسینی گوتار لەسەر خەڵکی بەناوبانگی ئەوکاتە، ڕۆژنامەی زیاتر بەناوبانگ کرد[١].

ڕۆژنامەی ز نیۆیۆرك هێراڵد لەلایەن جێمس گۆردان بێنێتس James Gordon Bennetts دەردەچوو. ئەو بایەخی بە ژانری (جۆری نووسین) ئینتەرڤیو دا و وەك ژانرێکی سەربەخۆی ڕۆژنامەنووسی بۆ یەکەم جار لە مێژووی ڕۆژنامەگەری جیهان بەکاری هێنا.

ئەو ڕۆژنامانەی لە سەدەی نۆزدە دەردەچوون، زیاتر ڕەنگدانەوەو کارتێکی پارتە سیاسییەکانیان پێوە دیار بوو.

ئەگەر باس لە ڕۆژنامەی پارتە سیاسییەکانی ئەوکاتە بکەین، ئەوا پارتی سۆسیال دیموکراتی سویدی کە لە ١٨٨٩ دامەزرا، سەرەتای سەدەی بیست، خاوەنی نزیکەی بیست ڕۆژنامە بوو. ئەوان جگە لە دەرکردنی ڕۆژنامە لە شارە گەورەکان، لە شارە بچووکەکانیش، بڵاوکراوە و ئۆرگانی خۆیان هەبوو. ڕۆژنامەکانی ئەوکاتەی دەوڵەتی سویدیش ناوەرۆکیان زۆرتر سیاسی بوون، لەناو ئەوان، ڕۆژنامەی داگینس نیهێتەر، وەك ڕۆژنامەکانی ئەمریکی و دانمارکی بایەخی زۆر بەوێنە و سەردێر دا.

لە ساڵی ١٩٢٠ ژمارەی ئەو ڕۆژنامانەی بەلای کەم هەفتەی سێ ژمارەیان لێدەردەچوو لە سوید، ١٨٩ دانە بوون و لە ساڵی ١٩٩٨ ژمارەیان کەمی کردەوە بۆ ١٠٧ ڕۆژنامە.

لە وڵاتی نەرویج بۆ هەر هەزار کەس، ٧٠٦ دانە ڕۆژنامە بڵاودەکرێتەوە، لە سوید و فینلەندا، بۆ هەر هەزار کەس ٥٥٠ ڕۆژنامە بڵاو دەکرێتەوە. (سەیری وێنەی ژمارە١ بکە)[٢].

لە ئەمریکا و بەریتانیا، زوو بایەخ بەدەرکردنی ڕۆژنامەی باش و بەناوەرۆك دەوڵەمەند درا. ئەوەش بووە هۆی لاوازبوونی چەندین ڕۆژنامە و زۆریش فرۆشران و لەلایەن کۆمپانیا گەورەکان دەکڕدران.

**زنجیرە گەورەکانی ڕۆژنامەکانی ئەمریکا، ئەو کۆمپانیایانەی خوارەوەن:**

نایت-ڕایدەر Knight-Ridder تایم-میرۆر Time-Mirror لەگەڵ گانێت نیوسپەیپەرس Gannett Newspapers . گانێت نیوسپەیپەرس، لەکۆتایی ١٩٩٤ سەد

١. هەمان سەرچاوەی پێشوو. ل.٤٧.

٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل.٦٨.

رۆژنامەی هەبوو. هەرئەویش خاوەنی رۆژنامەی USA Today بوو. رۆژنامەی ناوبراو لە ساڵی ١٩٨٢ لە ٢٤ شوێنی جیا جیای ئەمریکا چاپ دەکرا.

لەساڵی ٢٠٠٢ لە ئەمریکا ١٥٠٠ رۆژنامەی رۆژانە دەردەچوون. تیراژی هەموویان دەگەیشتە نزیکەی ٥٥ ملیۆن دانە. زۆربەی رۆژنامەکان ئێواران و دوای نیوەڕۆیان دەکەونە بازاڕ. رۆژنامەی یو س ئەی تودەی گەورەترین رۆژنامەی ئەمریکایە تیراژی رۆژانەی دەگاتە نزیکەی ٢،٢ ملیۆن دانە. رۆژنامەی ئابووری وۆڵ ستریت جورنال Wall Street Journal تیراژی ١،٨ ملیۆن دانەیە، رۆژنامەی نیویۆرك تایمس ١،١ ملیۆن دانەیە و رژنامەی لۆس ئەنجلس تایمس Los Angeles Times یەك ملیۆن دانەیە، لەگەڵ رۆژنامەی واشینتۆن پۆست Washington Post کە ٧٥٠ هەزار دانەیە.

نزیکەی ٪٨٠ داهاتی رۆژنامە ئەمەریکییەکان لە رێکلامەوە بەدەستیان دەگات. دەوڵەتەکانی تری جیهان، جگە لە ئەمریکا و ئەوروپا و یابان، چین، ئوستراليا، کەنەدا و کۆریای باشور، رۆژنامەوانییان تێدا کزە[1].

لە یابان نزیکەی ١٠٠ رۆژنامەی رۆژانە دەردەچێ کە تیراژی هەموویان دەگاتە ٧٠ ملیۆن دانە. زۆر لەو رۆژنامانەی کە ماڵەکان ئابۆنەیان تێیدا هەیە، رۆژانە دوو جار دەردەچن. گەورەترین رۆژنامەکانی رۆژانەی یابان ساڵی ٢٠٠٠ ئەوانەی خوارەوەن: رۆژنامەی یومایوری شیمبون Yomiuri Shimbun تیراژی نزیکەی ١٤ ملیۆن دانەیە. رۆژنامەی ئەسابی شیمبون Asabi Shimbun تیراژی نزیکەی ١٢ ملیۆن دانەیە. ماینیچی شیمبون Mainichi Shimbun تیراژی نزیکەی ٦ ملیۆن دانەیە.

لە ولاّتی چین، وەك یابان رۆژنامە بەتیراژی زۆر بەرز هەن. رۆژنامەی رێنمین ریباو Renmin Ribao (بەکوردی دەکاتە: رۆژنامەی جەماوەر) تیراژی نزیکەی دوو ملیۆن دانەیە. رۆژنامەی ناوبراو زۆرتر هەواڵ و دەنگوباسی دەوڵەتی تێدا بلاّودەکرێتەوە.

لە ساڵی ٢٠٠١ نزیکەی ٩٠٠ رۆژنامەی رۆژانە لە ولاّتی چین هەبوون. ئەوەش ژمارەیەکی زۆرە بە بەراورد لەگەڵ ئەوەی کە لە ساڵی ١٩٨٠ لەهەمان ولاّت تەنیا ٢٠٠ رۆژنامە دەردەچوون. لەنێوان ساڵی ١٩٩٦-٢٠٠١ لەرۆژنامەکانی چین، ریکلام دووجار زیادی کردییە.

١. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل.٧٨.



گەورەترین رۆژنامەی چین بەناوی کایکەو خیاوخی Caikao Xiaoxiیە تیراژی نزیکەی ٢،٧ ملیۆن دانەیە لەرۆژێکدا. ئاژانسی میللی خینهوا خاوەنی ئەم رۆژنامەیە.

ولاّتی هیندستان لە ریزی ئەو ولاّتانەیە کە لە دەرکرنی رۆژنامە بەناوبانگن. لەوێش نزیکەی ٩٠٠ رۆژنامەی رۆژانە بەتیراژی نزیکەی ٣٠ ملیۆن دەردەچێت. لە ولاّتی هیند، هەر هەزار کەس ٥٠ دانە رۆژنامەیان بەردەکەوێت. هەندێك لەو رۆژنامانەی هیندستان بەزمانی ئینگلیزی و ئەوانی تریش بەزمانی ناوچەکان دەردەچن.

گەورەترین دە رۆژنامەی هیند تیراژیان لەنێوان ٥٠٠ هەزار و ٧٥٠ هەزار دانەیە. ز تایمس ئۆف ئینديا The Times of India تیراژی ١،٩ ملیۆنە و دەینیك بشکەر Dainik Bhaskar تیراژی ١،٣ ملیۆنە و مەلایەلا مانۆراما Malayala Manorama تیراژی نزیکەی ١،٢ ملیۆن دانەیە. زۆر لەو رۆژنامە ناوچەییەکان بۆیەکەم جار لە سەردەمی خەباتیان دژی داگیرکەری بەریتانیا دەرچوون[1].

لە دەوڵەتانی وەك: کێنیا، ئۆگەندا، کامیرۆن، بۆ هەر هەزار کەس ١-١٥ دانە رۆژنامەیان بەردەکەوێت.

لە زۆر لە دەوڵەتانی ئەوروپا تیراژی رۆژنامەکان رووەو دابەزین چوون. لەساڵی ١٩٦٣ پاش داخستنی رۆژنامەی نی تید Ny Tid "کاتی نوێ" ی سۆسیال دیموکراتەکان بۆیەکەم جار دەستکرا بەلێکۆڵینەوە لەسەر هۆی داخستنی رۆژنامەی ناوبراو. هەر لەو کاتەدا چواریەکی رۆژنامەکان لەبەر گرفتی ئابووری هەڕەشەی داخستنیان لێدەکرا. بۆیە لەساڵی ١٩٦٥ پەرلەمانی سویدی بریاری یارمەتیدانی ئابووری پارتە سیاسییەکانی ولاّتی دا، پارتە سیاسییەکانیش بەرێگای خۆیان یارمەتی رۆژنامەکانیان دەدا. دیارە ئەو جۆرە یارمەتییە چارەسەرێکی کاتی بوو. لەساڵی ١٩٧١ حکومەتی سۆسیال دیموکرات بەرێگای پەرلەمانەوە، لەسەر بناغەی لێکۆڵینەوەی نوێ، بریاری دا کە دەوڵەت ئەمجارەیان راستەوخۆ یارمەتی رۆژنامە لاوازەکان بدا و لەهەمان کاتیش زەریبە بەرێژەی ٪٦ خرایە سەر رێکلام. ئەوەش بۆ هۆی ئەوە کە رۆژنامە دەوڵەمەندەکان یارمەتی رۆژنامە کز و لاوازەکان بدەن. یارمەتی ساڵی یەکەم بۆ رۆژنامەکان گەیشتە ٣٠ ملیۆ کرۆنی سویدی. ئەو یارمەتییە لە ساڵی ٢٠٠١ بۆ ٤١٨ ملیۆن کرۆن بەرزکرایەوە.

١. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل.٧٩.

ئێستا ڕۆژنامەکان بەڕێژەی ٣٪ لە سەرجەم خەرجی ڕۆژنامەکانیان وەردەگرن و هەندێك ڕۆژنامەش وەك: ڤێستەربیگدن لەساڵی ٢٠٠١ نزیکەی ٦٠٪ خەرجی ڕۆژنامەکەی لە دەوڵەت وەرگرت.

ڕۆژنامەی سڤێنسکە داگبلادێت لە ساڵی ١٩٩٥ لە ڕێکلام ٥٠٠ ملیۆن و لە دەوڵەتیش ٥٠ ملیۆن کرۆنی وەرگرت.

لەنێوان ١٩٦٠-١٩٨٠ ڕۆژنامەگەری لە سوید گۆڕانکاری زۆری بەسەردا هات. هیچ سەردەمێکی تر ئەوەندەی لە رادیۆ و تەلەفزیۆن لەسەر نەنووسراوە و باس نەکراوە لێرەدا زۆرتر باس لە سیاسەت و ئابووری دەکرا و زۆرتر پرسیاری کۆمەڵایەتی پشتگوێ دەخران. یەك لە ئەرکە گرنگەکانی ڕۆژنامەنووسان، ئاشکرا کردنی سیاسییەکان، لە بەکارهێنانی دەستەڵات بۆ بەرژەوەندی خۆیان بوو. لەگەڵ لێکۆڵینەوە لەسەر لایەنەکانی تری کۆمەڵ. جگە لەوانەی سەرەوە، ڕۆژنامەگەری بەشێوەیەکی تر سەیری جەماوەری دەکرد.

ڕۆژنامەگەری ئایدیای ئەوەبوو کە ببێتە دادگایەکی جەماوەری. لەکاتی هەڵبژاردن سیاسەییەکان ڕێگایان پێنەدەدرا تەنیا پرسیارەکانی خۆیان بەرز بکەنەوە، بەڵکو ڕۆژنامەنووس وەك نوێنەری جەماوەر، دەبووایە پرسیاری ڕەخنەگرانەیان ئاراستە بکات.

ڕۆژنامەنووسە لێکۆڵەرەوەکان، وەك ڕۆژنامەنووسی پسپۆری سەیر دەکران. بەپسپۆڕکردنی ڕۆژنامەگەریش بریتی بوو لە پرۆسێس و کارتێکردنی فەرهەنگی ڕۆژنامەنووس لەلایەن ڕۆژنامەکانی ئێواران و رادیۆ و تەلەفزیۆن.

## ڕۆژنامەی بەخۆڕا

لە ساڵی ١٩٩٥ ڕۆژنامەیەکی بەخۆڕا لە شاری ستۆکهۆڵم بەناوی میترۆ دەرچوو. لە سەرەتا پێنج جار لە هەفتەیەك، دواتر هەفتەی شەش جار دەردەچوو. لەگەڵ ئەوەی لە سوید ٢٥٠ ڕۆژنامەی بەخۆڕا دابەش دەکرێن کە سەرمایەیان دەگاتە ٩٠٠ ملۆن کرۆن لە ساڵێکدا، زۆر لەڕۆژنامەکان دژی دەرچوونی میترۆ بوون. ئەوەش لەبەر ئەوەی کە میترۆ ڕاستەوخۆ لەبەرژەوەندی ئابووری ئەوانی دەدا و داهاتی ریکلامی لەوان کەم دەکردەوە.

ئەو ڕۆژنامەیە لەلایەن ٢٣ ڕۆژنامەنووسەوە دەردەچێت، بەبەراورد لەگەڵ ڕۆژنامەی داگینس نیهێتەر کە ٤٣٠ کەس کاری تێدا دەکات. هەرچەندە ڕۆژنامەی داگینس نیهێتەر



بەلاپەڕە و ناوەڕۆك زۆر لە میترۆ دەوڵەمەند ترە، لەگەڵ ئەوەشدا جیاوازی زۆر لە ژمارەی کارمەندان هەیە. بۆیەش خەرجی دەرکردنی ڕۆژنامەی میترۆ زۆر کەمترە.

زۆر ڕۆژنامە سوودیان لە تۆڕی ئینتەرنێت وەرگرت. یەکەم ڕۆژنامەی سویدی کە دەتوانرا لە ڕێگای ئینتەرنێتەوە بخوێنرێتەوە، ڕۆژنامەی هێلسینگبۆریس داگبلادێت Helsingborgs Dagbladet لە ساڵی ١٩٩٥بوو. ئەوانیش دوای نیوەڕۆ ڕۆژنامەکەیان دەخستە سەر سایتەکەیان، بۆ ئەوەی کار لە فرۆشتنی ڕۆژنامەکە نەکاتن. لەساڵی ٢٠٠١ هەموو ڕۆژنامەکانی سویدی بەشێوەی ئەلیکترۆنی سایتیان لە ئینتەرنێت هەبوو. لە پایزی ٢٠٠١ زۆربەی ڕۆژنامەکان سەیرکردنی لاپەڕی ئینتەرنێتی ڕۆژنامەکەیان کردە پارە. ئینتەرنێت بۆ زۆر ڕۆژنامە پارەی زۆر دەکەوێت و بۆ هەندێکیش سەرچاوەی چاکە بۆ پارە پەیداکردن.

لە سوید نزیکەی ٢٦ هەزار کەس لە ڕۆژنامە ڕۆژانەییەکان کار دەکەن، لەوانە نزیکەی ٥٥٠٠ کەس ڕۆژنامەنووسن. ڕۆژنامە و گۆڤاری تایبەتی لە سوید بایەخیان زۆر پێدەدرێ. لە ساڵی ١٩٩٥ تیراژی هەموویان گەیشتە ٦٠ ملیۆن دانە.

# رادیۆ و تەلەفزیۆن

ناردنی شەپۆلەکانی ڕادیۆ وەك پرۆڤ لەساڵی ١٩١٠ دەستی پێکرد. لەوکاتە مۆسیقایان لەسەر قەوان بۆ سەربازەکانی بەرەی ڕۆژئاوای جەنگی جیهانی یەکەم لێدەدا.

لە سەرەتادا رادیۆ لەلایەن بەشداربووەکانی شەڕ وەك ئامێرێکی پڕوپاگەندە بەکار دەهات. پاش تەواوبوونی شەڕی جیهانی یەکەم توانرا وەك پێویست سوودی لێ وەربگیرێ. هەرچەندە ئەم ئامێرە نوێیە لە نیۆیۆرك وەك پرۆڤ لە ساڵی ١٩١٣ وە بەکار دەهێنرا، بەڵاّم لە مانگی ١١ ی ١٩٢٠ لە پیتسبۆرگ Pittsburgh لە ئەمریکا بۆ یەکەم جار رادیۆ پەخشی بڵاّوکردەوە. هەواڵی یەکەمی رادیۆش بریتی بوو لە گەیاندنی ئەنجامی هەڵبژاردنی سەرۆك کۆمار[1].

لە سەرەتای بیستەکانی سەدەی رابردوو رادیۆ لە زۆربەی وڵاّتە پیشەسازییەکان بەکارهێنراو سوودی لێ وەر گیرا.

لە سوید لە ساڵی ١٩٢١ رادیۆ بەرنامەکانی خۆی لە نێوان شاری بودن بۆ لولیۆ پەخش کرد. لەسەری ساڵی ١٩٢٥ بەشێوەیەکی ڕێکوپێك رادیۆی سویدی بەرنامەکانی خۆی پەخش کرد.

دە ساڵ پاش پەخشکردنی ڕادیۆ بەشێوەیەکی بەرفراوان، شۆڕشێکی تری تەکنۆلۆژیا سەری هەڵدا. ئەوانەی ئەم تەکنۆلۆژیا نوێیەیان دۆزییەوە، نەیاندەزانی، بەماوەیەکی کەم لەپەنجەرەی ئەو سندوقە مرۆڤ دەتوانی سەیری هەموو جیهان بکات، یانی هێنانە ماڵەوەی هەموو جیهان.

---

1. Stig Hadenius، Lennart Weibull، Massmedier. Falun،2003.p.160.

له بەرلین، پاریس لەگەڵ لەندەن، ساڵی ١٩٣٥ دەستکرا بە پەخشکردنی بەرنامەی تەلەفزیۆنی. ئەم پەخشکردنە دەنگ و فیلم بوون، بەلاّم تەلەفزیۆن چاکتر لە سەردەمی ئۆلۆمپیاتی ١٩٣٦ توانی ڕۆڵی خۆی ببینێت.

له ئەمریکا کۆمپانیایەکی ئەهلی لە ساڵی ١٩٤١ بەرنامەی تەلەفزیۆنیان بۆیەکەم جار پەخش کرد. لەبەر هۆی شەڕی دووەمی جیهانی، لە پەنجاکان پەخشی تەلەفزیۆن توانرا بەشێوەیەکی بەرفراوان سوودی لیَ وەربگیریَ.

له وڵاتی سوید لە ساڵی ١٩٥٦ بەبڕیاری پەرلەمان ستۆدیۆی تەلەفزیۆن دروستکرا. هەر لەکاتی پەیدابوونی ڕادیۆوە، بیرکرایەوە کە کیَ بڕیار لەسەر ناوەرۆکی بەرنامەکان بدات؟ لە سەرەتا بڕیاردرا کە کۆمپانیاکان هەمان مافی پەخشیان هەبێت کە ڕۆژنامەکان هەیانە. بۆیە لە کۆتایی ساڵ، ٥٥٠ کۆمپانیا مافی پەخشکردنی بەرنامەی ڕادیۆیان پێدرا. لە ساڵی ١٩٢٧ بنەمای فیدراڵی بۆ پەخشکردنی ڕادیۆ دەرچوو.

له وڵاتی بەریتانیا تەنیا بی.بی.سی'BBC' British Broadcasting Corporation مافی پەخشکردنی رادیۆی پێدرا. بی بی سی دەبووایە وەك کۆمپانیایەك خزمەتی جەماوەر بکات و نەشدەبووایە لە کۆمپانیای خۆی قازانجی پارەی دەست بکەوێت. بەپارەی زەریبە ئەم رادیۆیە بەڕێوە دەچوو.

له وڵاتی یەکێتی سۆڤێت، لە ساڵی ١٩١٨ پەخشی رادیۆ لە تاقیگا دەستی پێکرد. یەکەمین پەخشی بلاّویان لە ساڵی ١٩٢٢ بوو. ڕادیۆ لەخزمەتی دەوڵەتی ناوەندی بوو، خوتبەی یەکەمی لێنینیش لە ڕادیۆ لە کۆتایی هەمان ساڵ پەخشکرا.

له ناوەڕاستی ١٩٧٠ بۆیەکەم جار ئێزگەی ناوچەیی کەسەر بە ئێزگەی ناوەندی بوون بەرنامەکانیان پەخش کرد. پەخشی ناوچەییش یەکەم جار لە وڵاتانی بەریتانیا، دانمارك و سوید بوو.

له ئەوروپای ڕۆژئاوا، لە ساڵی ١٩٥٥ بۆ هەر هەزار کەس تەنیا ١٤ تەلەفزیۆن هەبوو. لە ساڵی ١٩٧٥ ئەم ڕێژەیە بەرزبووەوە بۆ ٢٥٠ تەلەفزیۆن و لە ساڵی ١٩٨٠ گەیشتە نزیکەی ٣٠٠ دانە. ئەوەش دەکاتە هەر ماڵەو بەلای کەم یەك تەلەفزیۆن. ئەو ژمارانەی دەوڵەتانی ئەوروپای ڕۆژئاوا، زۆر کەمترن لە ژمارەکانی ئەمریکا. لە ئەمریکا ٦٠٠ دانە تەلەفزیۆن بۆ هەر هەزار کەس هەیە. لە دەوڵەتانی جیهانی سێش تەلەفزیۆن زۆر بەرەو پێش چووە.



له سوید لە ساڵی ١٩٥٤ بۆیەکەم جار بەرنامەی تەلەفزیۆن بەشێوەی ڕێکوپێك پەخش کرا. لە سەردەمی یاری ئۆلۆمپیات لە ساڵی ١٩٦٠ نزیکەی ٨٠٠ هەزار دانە تەلەفزیۆن لە سوید هەبوو. ساڵێك دوای ئەوە ژمارەیان گەیشتە ١،٥ ملیۆن[١].

لەگەڵ پەیدابوونی تەلەفزیۆنی ڕەنگا و ڕەنگ، لە ساڵی ١٩٦٨ بە بڕیاری پەرلەمانی سویدی، هەموو کەسێك کە تەلەفزیۆنی هەبوو لە ماڵ، دەبووایە پارە بەدەوڵەت بدات. ئەوەش یارمەتییەکی چاك بوو بۆ باشکردنی بەرنامەکان و مووچەی ڕۆژنامەنووس و فەرمانبەران. ئەو پارەدانە تا ئێستاش لە سوید هەر بەردەوامە. ئێستا مانگانە نزیکەی ٢٠ دۆلاری ئەمەریکی بە کۆمپانیای ڕادیۆ و تەلەفزیۆن دەدریَ.

له سەرەتای ١٩٧٠ ڤیدیۆ پەیدا بوو. لە سەرەتادا وەك مێدیا سەیر دەکرا. لە سوید و زۆر لە دەوڵەتانی تر ڤیدیۆ وەك ڕادیۆ و تەلەفزیۆن بەخێرایی بۆ پێشەوە نەچوو. ئەوەش زیاتر لەبەرئەوەی کە لەو کاتەدا فیلمی ڤیدیۆ ئەوەندە لەبازاڕ زۆر نەبوون، کە مرۆڤ بتوانێت هەڵیانبژێریَ و سەیریان بکا[٢].

لەو دەمەدا خەڵکی زۆر دەترسان لەوەی کە مرۆڤ دەتوانیَ فیلمی خۆی بەڤیدیۆ ئامادە بکا و بەناو جەماوەر بلاّوی بکاتەوە. ئەوەش دەبووە هەڕکی بەهێز لەگەڵ تەلەفزیۆن. زوو دەستکرا بەلێکۆڵینەوە لەسەر ئەوەی کە ڕێکلام لە ڤیدیۆ قەدەغە بکەن. زۆر لەکۆمپانیا گەورەکان دەستیان کرد بەفیلم گرتنی ریکلام بۆ ڤیدیۆ. کۆمپانیاکان لەو بڕوایە دابوون کە ڤیدیۆ بەناو خەڵك بلاّودەبێتەوە. تەلەفزیۆنی سویدی لەو بڕوایە دابوون کە بازاڕێکی گەورە بۆ بەربەرەکیَ کردنیان لەڕێگای ڤیدیۆوە بۆ پەیدا بووە.

ئەو بۆچوونانەی سەرەوە هەموویان هەڵە بوون. بەڵکو ڤیدیۆ زۆر بۆ تۆمارکردنی فیلمی کۆن و هەندێك جاریش بۆ بەرنامە تۆمارکردن لەتەلەفزیۆنەوە بەکار دەهێنرا. بەهۆی پەیدابوونی کەناڵەکانی ئاسمانی، بازاڕی ڤیدیۆ کاری زۆر کرایە سەر و نەیتوانی بەربەرەکانێی تەلەفزیۆن بکا.

---

١. هەمان سەرچاوەی پێشوو. ل. ١٧٧.

٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو. ل.١٨٩.

بۆ زۆر دەوڵەتی ئەورووپای ڕۆژئاوا و ئەمریکا، شێوەی سیستێمی ڕادیۆ و تەلەفزیۆن لە ١٩٧٠ وە تەواو گۆڕاوە. تا سەرەتای ١٩٧٥ ڕادیۆ و تەلەفزیۆنی نەتەوەیی زۆر سەرکەوتوو بوون. بەرنامەکانیان زۆرتر بەزمانی نەتەوەیی خۆیان بوون. وەك گوتمان بە پەیدا بوونی کەناڵە ئاسمانییەکان، پێشبڕکێ بۆ کەناڵە ناوخۆییەکان دروست بوو. ئەوەش چ کەناڵی دەنگوباسەکان، چ کەناڵەکانی تر.

ساڵی ٢٠٠٢ لە ئەمریکا چوار کەناڵی ئاسمانی کاریان تەنیا پەخشکردنی دەنگوباس بوو. ئەوانەش وەك: سی ئێن ئێن.CNN سی ئێن ئێن هێدلاین نیوس CNN Headline News فۆکس نیوس چەناڵ Fox News Channel ئێم ئێس ئێن بی سی.MSNBC سی ئێن ئێن دەگەیشتە ٨٥ ملیۆن ماڵ. فۆکس دەگەیشتە ٧٦ ملیۆن ماڵ و ئێم ئێس ئێن بی سی دەگەیشتە ٧١ ملیۆن ماڵ[1].

دەربارەی ڕادیۆش سێ کۆمپانیای گەورە هەبوو وەك: ئەی بی سی.ABC سی بی ئێس CBS لەگەڵ ئێن بی سی.NBC لەو سێ کۆمپانیا ئەی بی سی لەوانی تر گەورەترە. ئەو نزیکەی ٤٥٠٠ ئێزگەی هەیە. ڕادیۆکانی ئەمەریکی زۆربەی ناوچەیین و بەهەموویان ژمارەیان دەگاتە ٧ هەزار ئێزگە.

زۆربەی ئەو ئێزگانە بەهۆی ڕیکلامەوە دەژین. جگە لەو ئێزگانە، ئێزگەیەك بەناوی ناشیۆنال پۆبلیك ڕادیۆ National Public Radio 'NPR' هەیە. بودجەی ئەو ئێزگەیە لەلایەن دەوڵەت لەگەڵ سپۆنسۆر (یارمەتیدانی ماددی) لەلایەن هەندێك کۆمپانیاوە دەکرێت.

کەناڵەکانی تەلەفزیۆن زۆرتر سەربەکۆمپانیای گەورەن. ئەوان ئێزگەی ڕادیۆ و ڕۆژنامە و گۆڤاریشیان هەن وەك: ئەی بی سی بەشێکە لە دیسنی کەپیتال سیتێس Disney Capital Cities، سی بی ئێس سەربە وێستینگ هاوس Westinghouse، ئێن بی سی یش سەربە ئەی ئۆ ئێل تایم-وۆرنەر AOL Time-Warner. یاساکانی کارتێلی ئەمەریکی سنووری داناوە بۆ هەر کۆمپانیایەکی گەورە کە چەند دەزگای ڕاگەیاندنی هەبێت.

لەبەریتانیا بی بی سی بریتیش برۆودکاستینگ کۆرپەرێشن BBC لە سەرەتای ١٩٢٠ دامەزراوە.

١. هەمان سەچاوەی پێشوو. ل.١٩٥.



ڕادیۆ لەئەڵمانیا لەناوەڕاستی ١٩٢٠ لەسەر بناغەی ناوچەیی (لۆکاڵ) دامەزرا. کە نازییەکان لە ١٩٣٣ بەڕێگای هەڵبژاردنەوە دەستەلاتیان گرتە دەست، یوسف گۆیبێڵس Joseph Goebbels ی وەزیری پڕوپاگەندەی هیتلەر، زانی کە ڕادیۆ دەتوانرێ سوودی زۆری بۆ پڕوپاگەندە لێوە بکرێ. لە ئەڵمانیا، لە ساڵی ١٩٣٣ ڕادیۆ نزیکەی ٤ ملیۆن گوێگری هەبوو، لە ساڵی ١٩٣٩ ژمارەی گوێگران گەیشتە ٩٧ ملیۆن کەس. هەموو بەرنامەکانی ئەوکاتە زۆر بەوردی نەخشەیان بۆ دادەنرا و بۆ مەبەستی پڕوپاگەندە بەڕێوە دەچوون و سوودیان لێ وەردەگیرا[1].

لە ئەورووپای ڕۆژهەلاَت بەگشتی و لە دەوڵەتی سۆڤێت بەتایبەتی، ڕادیۆیان بۆ بەرژەوەندی حیزب و چەسپاندنی سیستێمی سۆسیالیزم بەکار هێنا. یوسف ستالین لە بیستەکانەوە سوودی لەڕادیۆ بۆ مەبەستی پڕوپاگەندە وەرگرت.

دوای ئەورووپا و ئەمریکا، دەوڵەتی یابان بۆ پێشکەوتنی لە ڕادیۆ و تەلەفزیۆن دێت. یابانییەکان بەهۆی پێشکەوتن و بوونی تەکنۆلۆژیای بەرز، تاڕادیەکی زۆر توانیویانە کار لەناوەرۆکی بەرنامەکانی ئەورووپا و ئەمریکاش بکەن.

ڕادیۆی نەتەوەیی یابان لەگەڵ تەلەفزیۆن، لەساڵی ١٩٢٥ وە بەسەر بازاڕی ناوەوە زاڵە. ڕادیۆی یابان سەربەکۆمپانیای نیپۆن هۆسۆ کیۆکای Nippon Hoso Kyokai 'NHK' یە. هەمان کۆمپانیا لەساڵی ١٩٥٢ بۆیەکەم جار بەرنامەی تەلەفزیۆنیان پەخش کرد. ئێن هۆ کەی کەوتۆتە پێشبڕکێیەك لەگەڵ سەدان ڕادیۆ و تەلەفزیۆنی لۆکاڵ لە یابان. خەرجی زۆری ڕادیۆی ناوبراو لە مۆڵەتدانی ئێزگە و کەناڵەکانی تەلەفزیۆنەوە دەست دەکەوێت.

کەناڵە پریڤاتەکانیش (ئەهلییەکان) خەرجی بەڕێوەبردنیان لە ڕێگای ڕیکلامەوە دەست دەکەوێت.

لە دەوڵەتی چین، دەزگاکانی ڕاگەیاندنیان وەك دەوڵەتی کۆنی یەکێتی سۆڤێت تەواو لەژێر دەستەلاَتی حکومەتدایە. تەلەفزیۆن ناوەندی چین، سی سی تی ڤی CCTV، لە شاری پەکین بەرنامەکانی بۆ پێنج کەناڵی میللی و ناوچەیی لەگەڵ بۆ چەندین کەناڵی لۆکالیش بەرنامەکانی پەخش دەکات.

١. هەمان سەرچاوەی پێشوو. ل. ١٩٧.

رادیۆ چوار بەرنامە پەخش دەکات. کەناڵێك بۆ دەنگوباس، یەك بۆ فەرهەنگی، یەك بۆ کەمە نەتەوایەتییەکان و ئەوەیتریش پەخشی تایبەت بوو بۆ تایوان. یەك لەسەر چواری گەلانی چین کابل تی ڤی یان سەتەلایتیان هەیە. کەناڵی ستار-تیڤی Star-TV لەزۆربەی شوێنەکانی وڵاتی چین دەبینرێت.

لە دەوڵەتانی دواکەوتو و دیکتاتۆری، دەزگاکانی ڕاگەیاندن، ڕاستەوخۆ لەژێر دەستەڵاتی وەزارەتی ڕۆشنبیرین. ئامانجیشیان زۆرتر بۆ توندکردنی دەستەڵات و پڕوپاگەندە بۆ حیزبە.

ئەمڕۆ کەناڵە ئاسمانییەکان بازاڕێکی نوێیان بۆ تەلەفزیۆن پەیدا کردووە. لە ئەمریکا کەناڵی تایبەت دامەزراون. ئەو کەناڵانەش وەك: وەرزش، کەناڵی منداڵان، کەناڵی تایبەت بە مۆسیقا...هتد. کەناڵی ئێم تی ڤی MTV کەناڵێکی مۆسیقا و گۆرانییە، زۆرتر ئاڕاستەی گەنجان دەکرێ. لە ساڵی ١٩٩٨ کەناڵی ناوبراو دەگەیشتە ٦٠٠ ملیۆن ماڵ.

بەپەیدابوونی کەناڵە ئاسمانییەکان، کەناڵە میللییەکان ڕاستەوخۆ کاری کرا سەر شێوەی بەڕێوەبردنی بەرنامەکانی. کە پێشتر زۆرتر میللی بوون. هەندێك بەرنامە هەن، لە وڵاتێك ئامادە دەکرێن، کەچی لەزۆربەی وڵاتانی تر دەکڕدرێن و پیشان دەدرێنەوە. ئەوەش وەك بەرنامەکانی: ٦٠ مینیتس (٦٠ دەقیقە)، ئۆپێرا، ڕیکی، دکتۆر فیل...هتد. کڕین و لێدانەوەی ئەو بەرنامانە کە لە سەرەتادا لە ئەمریکا دەهێنرێنە بەرهەم، زۆرتر لەبەر ئەوەیە کە ئەوان ئەو پرسیارانەی لە بەرنامەکانی خۆیان بەرزی دەکەنەوە، هەمان کێشە و گرفتیش لە دەوڵەتانی تر هەن. لەلایەکی تریش، کڕینی ئەو بەرنامانە، بۆ پڕکردنەوەی بەرنامەکانی تەلەفزیۆن هەرزانتر دەوەستێت، لەوەی کە خۆیان ئامادەی بکەن. بۆیەش سەیر نییە کە ئەو شاشە بچووکە بۆتە ئاوێنەیەك بۆ بینینی هەموو جیهان. ئەمڕۆ قوتابخانەیەك لە کوردستان، بەهۆی بوونی تۆڕی ئینتەرنێتەوە، دەتوانێت هەمان زانیاری بەدەست بهێنێت کە قوتابییەکی فەرەنسی دەتوانێت. سنوورەکان تەسك دەبنەوە و جیاوازی بۆ وەرگرتنی دەنگوباس لەنێوان هەژار و دەوڵەمەند نەماوە.

ئێم تی ڤی MTV لە ساڵی ١٩٨٧ لە ئەوروپا پەیدا بوو. لەوکاتە بەرنامەی تایبەتی بۆ بەریتانیا، ئەڵمانیا و دەوڵەتانی سکەندەناڤی هەبوو. لە ساڵی ١٩٩٨ کەنالی ئیم تی ڤی بۆ دەوڵەتی روسیا دامەزرا.



زۆرترین کەناڵی ئێم تی ڤی MTV بۆ هەندێك دەوڵەتانی ئەمریکای لاتینی وەك: بەرازیل و دەوڵەتانی تری ئەمریکای باشوور، ئوسترالیا و یابان و ئاسیا دامەزران.

کەناڵی تەلەفزیۆنی سوید لە ساڵی ١٩٧٨ وە تێکستی خستە سەر شاشەکەی. ئەوەش زیاتر بۆ خەڵکی وڵاتەکە بوو کە بتوانن بەرنامەکانی تەلەفزیۆن بخوێننەوە. لەکۆتایی ١٩٨٠ تێکست تی ڤی هەموو لایەنەکانی تێدابوو وەك: دەنگوباس، ئابووری، وەرزش، گەشت و گوزار، بەرنامەکانی ڕادیۆ...هتد. کەناڵی "سڤێرێس تەلەفزیۆن" Sveriges Television" لە ساڵی ٢٠٠٢ لەسەر لاپەڕەی تێکستەکەی خۆی ٧٤٥ لاپەڕەی کە زۆربەی لایەنەکانی ژیانی دەگرتەوە هەبوو. ئەو لاپەرەیەش وەك ڕۆژنامەیەکی تەلەفزیۆن کە تەنیا لەسەر شاشە دەخوێنرایەوە. کەنالی تەلەفزیۆنی چواری سوید، ڕێکلامیشی خستە سەر لاپەڕەکانی و بەمەش پارەی زۆری دەستکەوت[1].

ئەمڕۆ زۆربەی کەناڵە زیندووەکانی جیهان، تێکستیان لەسەرە. بۆ ئەوەی لە تەلەفزیۆن تێکستەکەی کار بکات، دەبێت تەلەفزیۆن خۆی جیهازی تێکستی لەناو هەبێت.

لە سەرەتادا هەموو تەلەفزیۆنەکانی سوید و دەوڵەتانی ئەوروپای ڕۆژئاوا، تێکست تیڤیان تێدا نەبوو، بەلاّم ئەوە نەدەبووە گرفت، بەڵکو بەپارەیەکی کەم ئامێری تایبەتی دەخرا سەر تەلەفزیۆن. هەر لەسەرەتای ١٩٩٠ دەتوانرێ بگوترێ کە هەموو ئەو تەلەفزیۆنانەی بۆ دەوڵەتانی ڕۆژئاوا دروست دەکران، تێکستیان تێدا بوو. بۆیەش کە بازاڕ پەیدا بوو، ئەو گرفتە لە کۆمپانیاوە چارەسەر کرا. هەمان لاپەڕە بەهۆی پێشکەوتنی تەکنیك و پەیدابوونی ئینتەرنێت، بووە سەرچاوەیەکی باشی هەواڵ گەیاندن.

لە ساڵی ١٩٩٥ نزیکەی ٢٠ ملیۆن کەس لە جیهاندا دەیتوانی سوود لە ئینتەرنێت وەربگرێت. لە ساڵی ١٩٩٧ ئەم ژمارەیە گەیشتە ١٥٠ ملیۆن لە ساڵی ٢٠٠٢ گەیشتە ٨٠٠ ملیۆن، لە ساڵی ٢٠٠٥ لە ملیاردێك ڕەتی کرد. ئەمڕۆ ژمارەی ئەو کەسانەی کە سوود لە تۆڕی ئینتەرنێت وەردەگرن، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لەزیاد بووندایە.

لە سەرەتای ساڵی ٢٠٠٣ لە وڵاتی سوید نزیکەی ٧٠٪ ی ماڵەکان کەمپیوتەری تێدابوو. ئەو کەسانەی کەمپیوتەر بەکار ناهێنن، ئەوا زیاتر خەڵکی خانەنشینن. ئەوان لەبەر پیری و تەمەن درێژی خۆیان نایانەوێت کەمپیوتر و ئینتەرنێت بەکار بهێنن، ئەگینا لەبەر نرخ گرانی نییە.

---

١. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل. ٢٦١.

زمانی ئینتەرنێت بەگشتی زمانی ئینگلیزییە. لە ساڵی ٢٠٠٠، ٧٠٪ی سایتەکان، بە زمانی ئینگلیزی بوون.

ئێستا تەلەفزیۆن وەك بۆکس (سندوق)ە کەونەکە نەماوە، بەڵکو زۆرگۆڕاوە و ڕۆژانەش بەرەو پێشەوە دەچێت. بەگوێرەی بڕیارێکی دەوڵەتی سوید، ساڵی ٢٠٠٧ دەبێت هەموو تەلەفزیۆنەکان بە سیستێمی **دیجیتاڵ** بگۆڕدرێن.

**تەلەفزیۆنی دیجیتاڵ:** مەبەست لە تەلەفزیۆنی دیجیتاڵ ئەوەیە، کە بینەر دەتوانێت هەرکاتێك بیەوێ سەیری هەر بەرنامەیەك بکات، ئەوا دەتوانێت. لە تەلەفزیۆنی **دیجیتاڵ** هەموو بەرنامەکانی تەلەفزیۆن وەك لاپەڕەی ئینتەرنێت دەپارێزرێن. بەم جۆرە بینەر لەو کاتە دەیەوێت سەیری بەرنامەی کە خۆی مەبەستی بێت دەیکات. بەم جۆرە مرۆ بەخەستتر سەیری تەلەفزیۆن دەکا و بەدوور نازانرێت کەمتریش سەیر بکات. بەم تەکنیکە نوێیەوە، وەك گوتمان پێویست ناکات بەرنامەی باش، لەسەر ڤیدیۆ تۆمار بکەن.

سوودی تری تەلەفزیۆنی **دیجیتاڵ** ئەوەیە کە لە ناوەندی تەلەفزیۆنەکان دەزانرێ چەند کەس سەیری هەر بەرنامەیەك دەکاتن. بەم شێوەیە ئەگەر بەرنامەی دیارکراو بینەری کەم بێت، ئەوا دوای پەخشی بەرنامە پسپۆران لێی دەکۆڵنەوە و چارەیەکی بۆ دەدۆزنەوە. لەلایەکی تر وەك لەپێشتر باسمان کرد، لە ئەوروپای ڕۆژئاوا، مرۆ دەبێت ئابۆنەی تەلەفزیۆن بەمیری یان بە کۆمپانیاکان بدات، ئەگەر ئێستا بینەر نەیەوێت پارەکە بدات، ناتوانن هیچی لێبکەن، بەڵام پاش پەیڕەو کردنی سیستێمی **دیجیتاڵ**، ئەگەر ئابۆنەی مانگانە نەدات، تەلەفزیۆنەکەی دەکوژێننەوە. بێگومان سوودی تریشی زۆرە، بەڵام ئەوانەی سەرەوە گرنگترینیان بوون.

که باس لە ڕاگەیاندن دەکرێ، ئەوەمان بیردەکەوێتەوە، کە چەند کەسێك هەن خاوەنی زۆربەی کۆمپانیا گەورەکانی جیهانن. ئەوان وەك پاشای ڕاگەیاندن بەناوبانگن.

١- ئوسترالیا، بەریتانیا لەگەڵ ئەمریکا ناوی ڕوپێرت **موردۆخ** Rupert Murdoch.

٢- ڕۆبێرت هێرسانت Robert Hersant لە فەرەنسا، ئەکسل سپرینگەر Axel Springer لە ئەڵمانیا. جگە لەو ناوانەی سەرەوە، کۆمپانیای گەورە وەك: ئەی ئۆ ئێل تایم-وۆرنەر AOL Time-Warner لە ئەمریکا، بێرتێلسمان Bertelsmann لە ئەڵمانیا. بەناوبانگترین کەس لە ئەوروپا، سیلڤیۆ بێرلوچۆنی Silvio Berlusconi لە ئیتاڵیا. وەك دەزانین سیلڤیۆ بێرلوچۆنی پۆستی سەرۆك وەزیرانی لە دەوڵەتی ئیتالیاش



هەیە. لە ئەمریکا سەتەلایت و کابل تی ڤی بە تێد تۆرنەر Ted Turnerی خاوەنی سی ئێن ئێن CNN دەبەسترێتەوە.

لە نەوەتەکانی سەدەی ڕابردوو، زۆربەی کەناڵەکان بوون بە جیهانی و لەهەمان کاتدا بایەخی زۆریان بە ئینتەرنێت دا.

لە سەرەتای ساڵی ٢٠٠٠ پێنج کۆمپانیای گەورەی جیهان هەبوون.

١- ئەی ئۆ ئێل، تایم-وۆرنەر لە ئەمریکا. ئەم کۆمپانییە خەریکی کتێب چاپکردن و فیلمی سینەما و ئینتەرنێت بوون. لەساڵی ٢٠٠١ سەرمایەی ٣٨ ملیارد دۆلار بوو.

٢- ڤیاکۆم ئای ئێن سی Viacom Inc لەئەمریکا کاری ڕاگەیاندنی تەلەفزیۆن، فیلم دروستکردن دەکات. ئەم کۆمپانیایە لەساڵی ٢٠٠١ نزیکەی ٢٣ ملیارد دۆلاری هەبوو.

٣- ڤیڤێندی یونیڤێرسال Vivendi Universal لە فەرەنسا. ئەم کۆمپانیایە لەسەرەتادا تایبەت بەئاو پاککردنەوە بوو، بەڵام دواتر چەند کەناڵێکی تەلەفزیۆن یەکیان گرت و بووە خاوەنیان. لەساڵی ٢٠٠١ سەرمایەی ١٨ ملیارد دۆلار بوو.

٤- ز وۆڵت دیسنی کۆمپەنی The Walt Disney Company لە ئەمریکا. ئەو کۆمپانییە لەسەرەتادا خەریکی فیلم و تەلەفزیۆن بوو. ئەمڕۆ خەریکی ڕۆژنامە دەرکردن و ڕادیۆ بەڕێوەبردنیشە. لەساڵی ٢٠٠١ سەرمایەی ٢٥ ملیارد دۆلار بوو.

٥- بێرتلسمان Bertelsmann لە ئەڵمانیا. لە سەرەتادا خەریکی کتێب چاپکردن و ڕۆژنامە دەرکردن بوو. لەساڵی ٢٠٠١ سەرمایەی گەیشتە ١٥ ملیارد دۆلار.

٦- نیوس کۆرپەرەیشن News Corporation لەگەڵ ڕوپەرت موردۆش کە خاوەنی سەرەکی کۆمپانیا بوو، لەساڵی ٢٠٠١ سەرمایەیان بە ١٣ ملیارد دۆلار دەخەملێنرا. ئەو کۆمپانیا گەورانە وەك دیارە کۆنتۆڕیان لە ئەمریکا یان لە ئەوروپا هەیە[1].

لە ڕۆژنامە هەواڵییەکانی سوید سەرەتای سەدەی بیست پەیوەندییەکی زۆر پتەو لەنێوان سیاسییەکان و ڕۆژنامەکان هەبوو. ڕۆژنامەکانی ئەوکاتەی سوید تەواو مۆرکی حیزبایەتیان پێوە دیار بوو.

لەساڵی ١٩٢٩ حکومەتی ئەوکاتەی سوید تووشی تەنگژەیەکی گەورە هات. نیلس وۆهلین Nils Wohlin وەزیری ئابووری حکومەتی ڕاستەکانی ئەو کاتە بوو. وەزیری ناوبراو ناچارکرا

١. هەمان سەرچاوەی پێشوو. ل. ٢٨١.

واز لەكار بهێنێت، پاش ئەوەی فرۆشتنی بانقی كشتوكاڵی لەپێش وەختدا ئاشكرا بوو. لە پەرلەمان وەزیری ناوبراو رەخنەی زۆر توندی لەلایەن ئەندامانی پەرلەمانی سۆسیال دیموكراتەكان لێ گیرا. بەدوای ئەندام پەرلەمانانیش، نۆرەی رۆژنامەنووسان هات. گوتارەكانی رۆژنامەكان، بووە هۆی لادانی وەزیر لە كارەكەی خۆی.

بۆ چاكردنی رۆژنامە سویدییەكان و گۆڕینی شێوەی نووسینی لە ساڵی ١٩٠٩ دوو لە سەرنووسەرانی رۆژنامەی دی ئێن Dagens Nyheter ئەنتۆن كارلگرێنAnton Karlgren لەگەڵ ئۆسكار هیمبێری Hemberg Oscar پاش سەردانیان بۆ ئەمریكا، زۆر لە ناوەرۆكی رۆژنامەیان گۆڕی. بۆیە ئەو گۆڕانكارییانە ناونران بە ئەمریكی كردنی رۆژنامە. ئەنجامەكەشی ئەوەبوو كە خوێنەر ئاسانتر لە رۆژنامە بگات. ئەوەش دەكاتە بەكارهێنانی زمانی ئاسان لە رۆژنامە. بۆ هەمان مەبەست كارلگرێن كتێبێكی نووسی، تیایدا باسی كرد كە چۆن دەبێت رۆژنامەنووسی بەرێوە ببرێت. لە بەشی سەرگوتار نموونەی هێناوەتەوە وەك: شەمەندەفەر ژنێكی پانكردەوە. ئەو دەڵێ دەبووایە بنووسرابا: بەرەو مردن دەچێ بۆ ئەوەی سەگەكەی رزگار بكات. دواتر ئەو لەو بڕوایە دابوو كە هەموو گوتارێك دەبێت بە ئینگرێس (لید - پوختەی نووسین) دەست پێبكات. لەساڵی ١٩١٠ رۆژنامەی دی ئێن رۆژنامەنووسی تایبەت بە وەرزش دامەزراند. لەساڵی ١٩٢٠ لاپەڕەیەكی تایبەت بەوەرزش تەرخانكرا.

تا سەرەتای سەدەی بیست، ژن نەیاندەتوانی رۆڵی باش لە رۆژنامەگەری ببینن. تەنیا لەسەردەمی شەڕی یەكەمی جیهانی ژنی رۆژنامەنووس توانییان رۆڵی چاكتر لەم بوارەدا بگێڕن. چەند ژنێكی ئەكادیمی داوای كاریان لە رۆژنامەی ستۆكهۆلم كرد. ئەوانەش وەك: ئێلین براندێل Brandell Elin، ئێلین ریدلیوس Rydelius Ellen، ئێستەر بلێندە Ester Blenda و چەند ژنێكی تریش. ئێستەر بلێندە یەك لەو رۆژنامەنووسانە بوو كە بۆ یەكەم جار خەریكی نووسینی گوتاری لێكۆڵینەوە، هەڵكەندراو بوون[1].

١. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل. ٣٠٢.



## ئاژانسەكان

ئاژانسە گەورەكانی جیهان هەزاران كەس كاریان تێدا دەكات و كۆمپانیاكان دەیان ملیارد دۆلاریان لەم بوارەدا خستۆتە گەڕ. ئەمەش بۆتە پەیدابوونی پێشبڕكێی توند لەسەر بازاڕ، وەك: كامە ئاژانس بەخێراترین و كەمترین كات رووداوەكان دەگەیێنێتە خوێنەر، بینەر، بیسەر.

تا ئێستا سیاسییەكان، بازرگانەكان، كۆمەڵەو رێكخراوە جەماوەرییەكان. سەرچاوەی هەواڵن بۆ ئاژانسەكان هەر ئەوانەی سەرەوەشن كەبەخەستی كاردەكەن بۆ ئەوەی زاڵبن بەسەر بلاوكردنەوەی هەواڵەكان و لەزۆر كاتیشدا بڕیار لەسەر ناوەرۆكی هەواڵەكان بدەن.

وەك ئاشكرایە هەواڵ هەموو كاتێك دوو مەبەستی هەبووە:

١- پەیداكردنی پارە.

٢- ئامانجی سیاسی.

رۆژنامەكانی سەرەتایی كە لە سەردەمی شەڕی ١٦١٨ — ١٦٤٨ (سی ساڵە) پەیدابوون. هەر لایەنەو دەیویست بیرو بۆچوونی خۆی لەسەر شەڕەكە بگەیێنێتە جەماوەر. چونكە وەك دەزانین، لە سەردەمی شەڕ و قەیرانەكان هەواڵ و دەنگوباس گرنگییەكی تایبەتییان هەیە. نموونەی تازەش شەڕی كەنداو ١٩٩٠ شەڕی ئەفگانستان ٢٠٠١ شەڕی ئێراق ٢٠٠٣. ئەوەی ئێمە ناوی دەنێین هەواڵ ئەوا بەدوو قۆناغ تێپەڕ دەبێ.

١- چۆن هەواڵ هەڵدەبژێردرێت. وەك چ هەواڵێك بگەیێنێتە جەماوەر.

٢- چۆن هەواڵەكە دابڕێژرێت و پێشكەش بكرێت.

خاڵی یەكەم پەیوەندی بە ئاژانسەكان و سەرچاوەی هەواڵەكانەوە هەیە، دووەمیش پەیوەندی بە رۆژنامەنووس خۆی هەیە.

هەواڵ لە ڕووداوەوە بۆ خوێنەر و بینەر و بیسەر دەکرێ زۆر کورت و ئاسان بێت وەك لەکاتی بەستنی کۆنگرەی ڕۆژنامەنووسی، سەرۆك وەزیران ڕاستەوخۆ بەڕێگای کەناڵی تەلەفزیۆنەوە قسەکانی خۆی دەگەێنێتە بینەران و بیسەران. ڕووش دەدات کە هەواڵ تا دەگاتە خوێنەران ڕێگایەکی زۆر دوور و درێژ دەبڕێت و کاتی زۆر دەوێت تا جەماوەری لێ ئاگادار دەکرێتەوە. ئەگەر وەك نموونە باس لە هەواڵەکانی ئیٚ یو "EU" بکەین، ئەوا زۆربەی ڕاگەیاندنەکان پشت بەو ئاژانسانە دەبەستن کە کۆنتۆری (نووسینگەی) لە بڕوکسل هەیە. ڕۆژنامە گەورەکانیش هەواڵیان لە ڕێگای پەیامنێرەکانی خۆیانەوە بەدەست دەگات. دەشکرێ بەڕێگای ئاژانسی جیا جیا لەگەڵ ئاژانسی شاری بڕوکسل بگەێنرێتە جەماوەر.

بۆ هەموو هەواڵەکان لە هەموو قۆناغەکاندا سەرنووسەر هەن کە هەرکاتێك بیانەوێت، هەواڵەکە دەوەستێنن یان زیاتر بەرزی دەکەنەوە. هەر خۆشیان دەتوانن سەرلەنوێ هەواڵەکە دابڕێژنەوە لەسەر ئەو مەتریالەی کە لای خۆیان دەست دەکەوێت. هەر ئەو سەرنووسەرانەشن کە بڕیار لەسەر درێژی یان کورتی بابەتەکە دەدەن.

پێشتر هەواڵ بەتەلەگراف، تەلەفۆن، تێلی پرینتەر دەگەیشتە دەزگاکانی ڕاگەیاندن، بۆیە تا هەواڵەکە چا دەکرا و سەرلەنوێ دادەڕێژرایەوە و دەگەێنرایە جەماوەر، کاتی زۆری دەویست. ئەمڕۆ هەواڵەکان لە ڕێگای پەیامنێر و ئاژانسەکانەوە ڕاستەوخۆ دەگەنە سەر شاشەی ناوەندی (مەرکەزی) کۆمپیوتەرەکان. جگە لەوەش ڕۆژنامەنووسان لە دەزگاکانی راگەیاندنی خۆیان، بەهۆی ئینتەرنێتەوە دەتوانن بەدوای هەواڵ بگەڕێن. ئەوجۆرە زیاتر بۆ هەواڵەکانی ناوەوەیە، بەلاٚم تا رادەك بۆ هەواڵی دەرەوەش سوودی لێ وەردەگیرێ. بۆیە ئەگەر پەیامنێرێك لە شاری بروکسل و ناو خانووی EU بەرامبەر شاشەی کۆمپیوتەری خۆی، دابنیشێ و سەیر بکا چ لە پایتەختی ناو ئیٚ یو ڕوودەدا. ئەو بەهۆی ئینتەرنێتەوە هەر لەهەمان ژوور و بەرامبەر هەمان شاشە، بۆ نموونە دەچێتە ناو سایتی ( لاپەڕە) EU لە سوید. یانی لەڕێگای دەوڵەتی سوید، کە یاساکانی ئەویٚ ڕێگای بلاٚوکردنەوەی زۆرتری لەسەر ڕێکخراوەکان تێدایە، لەسەر هەمان بابەت و لەناو هەمان خانوو زانیاری زۆرتری دەست دەکەوێت.

دەزگاکانی ڕاگەیاندنی هەواڵەکان هەر باس لەوە ناکەن کە چ لەدەرەوەی ولاٚت ڕوو دەدات، بەڵکو باس لە کێشەکانی ناوەوەی ولاٚتیش دەکەن. زۆرجار بابەت و کێشە زەقەکانیش لەسەر شاشەی تەلەفزیۆن ڕاستەوخۆ نیشان دەدرێن. لێرەش دەستەی نووسەران بڕیار دەدەن کە چ



هەواڵێك بەرزبێتەوە و جەماوەری تێدا لە ڕێگای ئەوانەوە ئاگادار بکرێتەوە و چ هەواڵێکیش لەنیوەی ڕێگا بووەستێندرێت.

وۆڵتەر لیپمان Walter Lippmann ڕۆژنامەنووسی ئەمەریکی لە ساڵی ١٩٢٤ بۆی ڕوون بووەوە کە ڕۆژنامەنووس دەبێت هەست بکات کە جەماوەر تێنووی زانینی ئەو زانیاریەیە. بەڕای وۆڵتەر مەرجی هەواڵ بەلای ئەو، کە مرۆڤی یەکەم دەبێت لای مرۆڤی دووەم هەست ببزوێنێت..[١].

**بۆنموونە:** وەرگەڕانی شەمەندەفەرێك لە فینلەندا، هەست لای سویدییەکان زۆرتر دەبزوێنیٚ، تا لەلای هیندییەکان لە هیندستان. لەهەمان کاتیشدا، تراگیدیای گەورە هەست لای زۆرکەس دەبزوێنیٚ.

لە هەوڵێك بۆ ئەوەی چاکتر لە هەواڵ بگەین، ئەوا هێنك پراککیٚ Henk Prakke بۆمان ڕوون دەکاتەوە. بەڕای ئەو سیٚ فاکتەر هەن کە پلەی گرنگی هەواڵ دەردەخەن. "کات، فەرهەنگ لەگەڵ شوێن". هەرچەند دوورتربین لەو سیٚ خاڵە، هەواڵەکە کەمتر بایەخی بۆمان دەبێت. کە کەمیش بایەخی هەبیٚ، ئەوا کەمتر هەواڵە. کە دوورتر بێت، بایەخی هەواڵی خۆی کەمتر دەبێتەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا ڕۆژنامەنووسان وەك گروپ، کاریگەری زۆریان هەیە لەوەی کەچ هەواڵێك دەستەی نووسەران هەڵدەبژێرن.

ڕۆژنامەنووسان شانسی زۆریان هەیە کە خۆیان ئەو هەوالاٚنە هەڵبژێرن لەو ڕووداوانەی کە ڕۆژانە ڕوو دەدەن.

### سەرچاوەکانی هەواڵ:

لە ١٩٥٠-١٩٦٠ ی سەدەی ڕابردوو، زۆر کات بەوە دەڕۆیی کە لە هەواڵەکان بکۆڵدرێتەوە و بچنەوە سەر سەرچاوەکانی بۆ ڕاستی ڕوودانی ڕووداوەکە. ئایا هەواڵی ناوبراو بلاٚوبکرێتەوە یان نا؟ ئەمڕۆ لەم بوارەدا گۆڕانکاری زۆر ڕوویداوە.

پسپۆری لەبواری ڕۆژنامەوانی ئەوە دەگەێنێت کە ئەمڕۆ داوا لە لێکۆڵینەوەو دوودڵی بابەتەکە دەکا. ئەوەش دەکاتە ئەوەی کە سەرچاوەکانی هەواڵ زیاتر خۆیان لە گەیاندنی

1. Stig Hadenius, Lennart Weibull, Massmedier. Falun, 2003.p.345

هەواڵەکان چالاك کردووە. کۆمپانیا و ڕێکخراوەکان و کۆمەڵەکان، زیاتر دەیانەوێ هەواڵەکانیان وەك چۆن خۆیان دەیانەوێت بگاتە جەماوەر. هەربۆیەش بۆ سوود و بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان تا بۆیان بکرێ هەواڵە خراپەکان بلاّوناکەنەوە و لە چاکەکانیش دریغی ناکەن.

ئەوانەی زانیاری و هەواڵەکانی کۆمپانیا و دەزگاکان دەگەیێنن، ئەرکیان نوێنەرایەتی ئەو شوێنەیە کە کاری تێدا دەکەن. ئەو شوێنەش دەکرێ دەزگای میری بێت یان ڕێکخراو و کۆمەڵە جەماوەرییەکان. ئەوان ئامانجیان گەیاندنی ئەو هەوالانەیە کە خۆیان دەیانەوێت. لێرەدا کاری ڕۆژنامەنووسیش ئەوەیە کە هەواڵەکان بەچاوی ڕەخنە و گومانەوە سەیر بکات.

ڕۆژنامەنووسانی دەوڵەتی سوید، وەك بێلایەن خۆیان لەقەڵەم دەدەن. هەر ئەو بێلایەنیەش بوو کە لە ساڵی ١٩٩٢ هەواڵ گەیێنەرەکانیان لە سەندیکای خۆیان وەرنەگرت. چونکە هەواڵ گەیێنەرەکان لەکاتی گەیاندنی هەواڵەکان نوێنەرایەتی کۆمپانیاکانی خۆیان دەکرد. (نموونە: کۆمپانیای ئێرکسۆن یان ڤۆلڤۆ، ئەگەر بیانەوێ هەواڵێك بگەیێننە جەماوەر، بەدوو ڕێگا یان زیاتر هەواڵی مەبەست دەگەیێنن.

**یەك:** بەهۆی کۆنگرەی ڕۆژنامەنووسی. لێرەدا خەڵکی پسپۆر کۆنگرەکە بەڕێوە دەبات. ئەوان زۆر باش ڕاهێنراون لەسەر ئەوەی چۆن لەگەڵ ڕۆژنامەنووسان قسە بکەن و چۆنیش وەلاّمی پرسیارەکانی ئەوان بدەنەوە. لەزۆر کاتدا خۆشیان ماوەیەکی زۆر وەك ڕۆژنامەنووس کاریان کردووە.

**دوو:** بەهۆی بلاّوکردنەوەی هەواڵەکە لەسەر سایتی خۆیان.

دەکرێ بەهۆی چاوپێکەوتن لەگەڵ ڕۆژنامەنووسێك هەواڵی مەبەست بۆ جەماوەر بگەیێنرێت. بۆ کۆمپانیای ڤۆلڤۆش بەهەمان ڕێگا و شێوە هەواڵەکانیان بەڕێگای هەواڵگەیێنەرانی خۆیان دەگەیێنن. ئەوەش دەکاتە ئەوەی کە ئەوان لە گەیاندنی هەواڵی مەبەست، بێلایەن نەبوون.

سەلمێنراوە کە گەیاندنی هەواڵ بەڕێگای باش و سەرکەوتوو، لەلایەن جەماوەرەوە چاکتر پێشوازی لێدەکرێت و بەهۆی تەکنۆلۆژیای نوێشەوە، مرۆ دەتوانێ سوود لە کەناڵی جیا جیا بۆ وەرگرتن و گەیاندنی هەواڵ وەربگرێ.

ئەمڕۆ وەك پێش، پێویست ناکات جەماوەر تەنیا بەڕێگای کەناڵەکانی ڕاگەیاندنەوە هەواڵ و دەنگوباس وەربگرێ. بەهۆی ئینتەرنێتەوە، هەموو کەس دەتوانێت ڕاستەوخۆ بچێتە سەر



سەرچاوەکانی هەواڵ. لەگەڵ ئەو هەمموو توانایەشدا، تا ئێستا کەناڵەکانی میدیا بەشێوەی کلاسیك سەرچاوەی هەواڵن. بۆیە سەیرنییە کە هەردوو شێوەی باسمان کرد، تا ڕادەیەك جۆرە پێشبڕکێیەکیان لەنێواندا پەیدا ببێت لەسەر ئەوەی کامە زووتر هەواڵەکان بلاّو بکەنەوە.

**ئاژانسەکان:**

بەهۆی پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیای نوێ، ڕۆژنامە و ڕادیۆ و کەناڵە گەورەکانی تەلەفزیۆن، دەزگا گەورەکانی ڕاگەیاندن لەزۆر شوێندا پەیامنێری خۆیان هەیە. ئەوەش دەکاتە ئەوەی کە کەمتر پشت بەئاژانسە گەورەکان ببەستن. بەڵکو بەهۆی پەیامنێرەکانی خۆیانەوە، وەك ئاژانسی گەیاندنی هەواڵەکان ڕۆڵ دەبینن. لەگەڵ ئەوەشدا، بۆ زۆربەی ڕۆژنامە و گۆڤارەکان، ڕادیۆ و تەلەفزیۆن، هەواڵ نێرەکان ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ، کاردەکەنە سەر دەزگاکانیان.

**دروستکردنی ئاژانسەکان:**

دوو ئاژانس، ڕۆیتەرس Reuters ی بەریتانی (١٨٥١)، هاڤاس Havas ی فەرەنسی (١٨٣٥) دامەزراون. ئەوانەش لە سەرەتادا زیاتر بۆ گەیاندنی هەواڵی بازرگانی دامەزران.

لە ئەنجامی پێشبڕکێی توند، لەسەر گەیاندنی هەواڵ، دوو ئاژانس لە ئەمەریکا دروست بوون. یو پی ئای United Press International و ئای ن س International News Service.

لە سەردەمی هەردوو شەڕی جیهانی لە ئەوروپا سێ ئاژانس ڕۆڵی زۆر بەرزیان هەبوو. هاڤاس لە پاریس، ڕۆیتەرس لە لەندەن، وۆلفس Wolffs لە بەرلین.

پاش تەواوبوونی جەنگی جیهانی دووەم، شەش ئاژانسی هەواڵ بەسەر زۆربەی گەیاندنی هەواڵەکانی جیهان زاڵبوون. ئەوان پەیامنێریان لە زۆربەی دەوڵەتان هەبوو و لەزۆربەی دەوڵەتانی جیهانیش کڕیاریان هەبوو.

ئەی پی AP لەگەڵ یوپی ئای UPI بەیەکەوە لە ساڵی ١٩٥٨ لە ئەنجامی یەکگرتنی UP +ئای ئێن ئێس INS دروست بوون. لەگەڵ ڕۆیتەرس و ئەی ئێف پی AFP ی فەرەنسی چوار ئاژانسی گەورە بوون. لە ڕیزی ئاژانسە گەورەکان، دی پی ئەی DPA لەگەڵ تاسی TASS سۆڤێتی بوون. یو پی ئای لە ئەمریکا چەندین جار خاوەنی گۆڕدراوە و تاسی سۆڤێتیش، لە ئەنجامی پرسترۆیکا و گلاسنۆست، ئالوگۆڕی زۆری بەسەرداهات.

### ئاژانسی ئەسوشەیت پرێس Associated Press

گەورەترین ئاژانسی جیهانییە بۆ گەیاندنی هەواڵ، ئەم ئاژانسە لە مانگی ٥ ساڵی ١٨٤٨ دامەزراوە. ئاژانسی ناوبراو لە ساڵی ١٩٩٨ تەنیا لە ئەمریکا ١٥٠ کۆنتۆر (نووسینگە) ی هەبوو. لە دەرەوەی ئەمریکاش نزیکەی ٩٠ نووسینگەی هەبوو. لەم ئاژانسە ٣٥٠٠ کەس کاری تێدا دەکرد. هەر تەنیا لە ئەمریکا ١٧٠٠ ڕۆژنامە و گۆڤار لەگەڵ ٦٠٠٠ ئێزگەی ڕادیۆ و کەناڵی (ت.ڤ) ئابۆنەیان لەلای ئەم ئاژانسە هەبوو. جگە لەوانەی سەرەوەش ٨٥٠٠ کڕیاریان لە ١١٠ دەوڵەتی جیای جیهاندا هەبووە. بۆ ئەی پی لەگەڵ هەموو ئاژانسەکانی تری هەواڵ ئامێرەکانی ئەلیکترۆن ڕۆڵی بەرچاو دەگێڕن و ڕۆژ لە دوای ڕۆژیش بایەخیان زۆرتر پێ دەدرێت.

(ئەی پی ) سەر بە کۆمپانیای ( کۆپەڕاتیڤ)ی ڕۆژنامە ئەمریکییەکانە کە بە خۆشیان سوودی لێ وەردەگرن. (ئەی پی ) لە ناوەوەی ئەمریکا وەك ئاژانسی میللی ڕۆڵی خۆی دەبینێت، ئەم ئاژانسە لەگەڵ هەموو بەرزی و نزمی کە بەسەر ئابووری دەزگاکانی ڕاگەیاندن دێت، توانیویەتی لە گرفتەکان خۆی ڕزگار بکات و تەواو بەسەریان زاڵ بێت. UPI "United Press International"ماوەیەکی زۆر لەگەڵ AP لە پێشبڕکێ دابوو لەسەر گەورەیی و زۆری کۆنتۆر لەجیهاندا. جیاوازی UPI لەگەڵ AP ئەوە بوو کە یەکەم سەر بەکەرتی تایبەت بوو کە بەسترابۆوە بەگروپی ڕۆژنامەکان بەناوی سکریپس-هۆوارد Scripps-Howard. UPI هەر لە حەفتاکانەوە تووشی گرفتی ئابووری گەورەبوو، بۆیە لە هەواڵەکانی جیهان زیاتر نەیتوانی پێشبڕکێ لەگەڵ APبکا. وەك گوتمان لە ساڵەکانی دوایی چەندین جار خاوەنی گۆڕاون، نموونە UPI لە دەوڵەتەکانی سکەندەناڤی هیچ پەیامنێرێکی نەمابوو کەچی **AP** دەیان پەیامنێری هەبوو.

### ڕۆیتەرس Reuters

ئاژانسی ڕۆیتەرس لە ساڵی ١٨٥١ لە لەندەن دامەزراوە. لە ئەوروپا دوو ئاژانسی گەورە هەن، ڕۆیتەرس لە لەندەن و فڕانس- پرێس لە پاریس. ڕۆیتەرس لە ٧٠- ٨٠ کانی سەدەی ڕابردوو سەرمایەی زۆری لە کۆمپانیای خۆی خستە کار.

لەساڵی ١٩٩٧ ڕۆیتەرس ٢١٧ کۆنتۆری هەبوو. لە هەموو کۆنتۆرەکان ١٥ هەزار کەس لە ١٦١ دەوڵەت کاری تێدا دەکرد. ئاژانسی ڕۆیتەرس بۆ زۆربەی دەزگاکانی راگەیاندن، بڕبڕەی پشتی هەواڵ و دەنگوباسەکانیانە. هەربۆیەش لە ساڵی ١٩٩٥، ٦٠٪ ئەو پارەی لە ئاژانسدا خرابووە گەڕ لە ئەوروپا بوو. ئەوەش بەبەراورد بە ١٥٪ ی باکوور و باشووری ئەمریکا.



کە هەواڵە گشتییەکانی ڕۆیتەرس گرنگی زۆریان پێدەدرێ، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە لە هەشتاکانی سەدەی ڕابردوو ئاژانسی ناوبراو پێشکەوتنی زۆری بەخۆیەوە دی. ئەوەش زیاتر لەبەر ئەوەی لەو کاتدا، بایەخی زۆرتری بەهەواڵە ئابووریەکان دا.

ئەمڕۆ ئاژانسی ڕۆیتەرس هەواڵ بە: بانقەکان، کۆمپانیاکان لەگەڵ ڤالوتە (پارە، دۆلار، یۆرۆ)، گواستنەوەی دەریایی- ئاسن و خام دەدات.

خزمەتگوزارییەکی تایبەتی ڕۆیتەرس بەناوی Reuters Monitoring Service سەرکەوتنی زۆری لە گەیاندنی هەواڵەکانی ئابووری بەدەست هێنا. چەندین دەوڵەت داوای بەشداربوونی ئابۆنەی لێکرد.

لە ساڵی ١٩٩٧ هەواڵ و دەنگوباسەکانی ئەم ئاژانسە تەنیا ٥٪ی کۆمپانیا بوو. سەرمایەی ئەو پێنج ڕێژەش دەیکردە ٢،٨ ملیارد پاوەنی بەریتانی[١].

بەر لەچەند ساڵێك ڕۆیتەرس تووشی گرفتی گەورەی ئابووری هات. ساڵی ٢٠٠٣ ئاژانسی ناوبراو گەورەترین زیانی ئابووری لە مێژووی ١٥١ ساڵەی خۆی لێکەوت. زیانەکەش گەیشتە ٣٩٤ ملیۆن پاوەن. ئەو زیانە بووە هۆی دەرکردنی خەڵکێکی زۆری کۆمپانیای ناوبراو. سەرەڕای ئەوەش ئەو ٢٥٠٠ ڕۆژنامەنووسەی کە کاریان تێدا دەکرد دەستیان لێنەدراو کەسیان دەرنەکران.

### فرانس پرێس Agence France-Presse

ئاژانسی فرانس پرێس AFP لەسەر بناغەی ئاژانسی کۆن هاڤاس دروست بوو. هاڤاس لە سەردەمی نێوان شەڕەکان زۆر لە دەستەلاتداران نزیك بوو. لە سەردەمی داگیرکردنی فەرەنسا لەلایەن ئەڵمانیاوە، لە نازییەکان نزیك بوو. AFP دەزگایەکی ئەهلییەو سەر بەمیدیای فەرەنسییە.

لە ئەنجومەنەکەی جگە لە نوێنەرانی رادیۆ و ڕۆژنامە و **TV** ئەندامێك کە نوێنەرایەتی حکومەتی فەرەنسی دەکا، لەگەڵ چەند حاکمێك لە ئەنجومەنی ناوبراو ئەندامن.

فرانس-پرێس بۆ ماوەیەکی درێژ لەسەر بازاڕ لەگەڵ ڕۆیتەرس لەململانێ دابوو، بۆ ئەوەی زۆرترین بازاڕ بکەوێتە ژێردەستی ئەو. بەڵام لەبەر گرفتی ئابووری، دەکرێ بگوترێ کە فرانس پرێس بەجێما و بەدوا کەوت.

---

١. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل.٣٢٩.

**دی پی ئەی Deutsche Presse-Agentur**

نووسینگەی ئەم ئاژانسە لە هامبۆرگە، بەلام وەك هاڤاسی فەرەنسی پاش شەڕی دووەمی جیهانی نەما. پێشتر ئەم ئاژانسە لەژێر ناوی "DNB"DeutschesNachrichten-Bureau كاری دەكرد. پاش ڕووخانی نازییەكان لە ساڵی ١٩٤٥، زۆر ئاژانسی بچووك بچووك پەیدا بوو بوون. ئەو ئاژانسە بچوكانە لەژێر دەسەلاتی دەوڵەتانی رۆژئاوا بوون، لە ساڵی ١٩٤٩ یەكیان گرت و بەهەموویان Deutsche Presse-Agentur یان دروست كرد.

ئەم ئاژانسە لە ساڵی ١٩٩٧ هەزاركەس كاری تێدەكرد و پەیامنێری لە نزیكەی ٥٠ دەوڵەت هەبوو.

**ئاژانسی تاس TASS**

لە سەردەمی یەكێتی سۆڤێت تاس پەیامنێری لەنزیكەی ١٠٠ دەوڵەت هەبوو. تاس سەربە حكومەتی مەركەزی یەكێتی سۆڤێت بوو. كۆمیتەی تایبەتی سەرپەرشتی كارەكانی ئاژانسی تاسی دەكرد.

لە كاتی گۆڕانكارییەكانی ناو یەكێتی سۆڤێت، تاس شێوەی كاركردنی گۆڕا، لەوكاتە شێوەی نووسینی لە ئاژانسەكانی دەوڵەتانی ئەوروپای ڕۆژئاوای دەكرد. پاش رووخانی یەكێتی سۆڤێت زۆر حیزب و لایەن دەیانویست كۆنترۆڵی تاس بكەن.

ئێستا ئاژانسی تاس لەژێر ناوی ئیتار-تاس Itar-Tass كار دەكات. ئەمڕۆ ئاژانسی ئیتار-تاس لەگەڵ ئاژانسی ئینتەرفاكس Interfax تووشی پێشبڕكێیەكی توند بووە. ئینتەرفاكس لە مانگی نۆی ١٩٨٩ لە مۆسكۆ دامەزرا. لەناو روسیای فیدرالی ئاژانسێكی تر بەناوی ریا-نۆڤۆستی RIA-Novosti هەیە كە زیاتر تایبەتە بە گەیاندنی هەواڵەكانی نێو روسیا.

**كورتەیەك لە مێژووی دروستبوونی ئاژانسی تاس**

لە ١-٩-١٩٠٤ بۆ یەكەم جار لە ئیمپڕاتۆریەتی روسیا ئاژانسێك بەناوی س پ تی ئەی SPTA سانكت-پێتربورگسكۆی تێلێگرامنۆی ئەگێنستڤا "ئاژانسی تەلەگرامی سانكت-پێتربورگ" دەستی بەكار كرد.

سێ وەزارەت بۆ دروستكردنی ئاژانسی SPTA هاوكاریان كرد.

**یەك:** وەزارەتی دارایی.



**دوو:** وەزارەتی ناوخۆ.

**سێ:** وەزارەتی دەرەوە.

لە ٢٦-٣-١٩٠٤ لە نامەیەكی وەزیری دارایی ڤ.ن. كۆكۆڤچۆڤ بۆ وەزیری دەرەوە، پێشنیازی دروستكردنی ئاژانسێكی هەواڵی بەپێویست و گرنگ زانی. ئەویش لەبەر ئەوەی لەو كاتە ئاژانسە بیانییەكان لەسەر بلاوكردنەوەی هەواڵ لە ناو ڕوسیا، زاڵ بوون. لە نامەكەی دەنووسێ: (بلاوكردنەوەی هەواڵی درۆ لەسەر باری ئابووری روسیا). ناوەرۆكی ئەم نامەیە بووە هۆی لەدایك بوونی ئاژانسی SPTA.

بەهەموو لایەكیان بڕیاریان دا، ئاژانسی س پ تی ئەی باس لە هەواڵەكانی ناوەخۆ و دەرەوە لەسەر بابەتەكانی: سیاسی، ئابووری، دارایی، بازرگانی...هتد بكات. ئەم پڕۆژەیە لە ٢١-٧-١٩٠٤ لەلایەن ئیمپراتۆر نیكۆلای دوو ئیمزا كرا.

لە ساڵی ١٩١٤ لەگەڵ گۆڕینی ناوی شاری "سانكت-پێتربورگ" بۆ پێترۆگراد، ناوی ئاژانسیش بە پ ت ئەی PTA پێترۆگرادسكۆی تەلەگرامنۆی ئەگێنستڤا دەگۆڕدرێت.

لە ١-١٢-١٩١٧ ئاژانسی پ.تی ئەی دەكەوێتە ژێر دەسەلاتی سۆڤێتیەكان.

لە ساڵی ١٩١٨ ئاژانسی ناوبراو گوازرایەوە شاری مۆسكۆ. لە ساڵی ١٩١٨-١٩٣٥ بەناوی "ڕۆستە" ROSTA رەسیسكۆی تەلەگرافنۆی ئەگێنستفا لەكاركردن بەردەوام بوو. لە ١٠-٧-١٩٢٥ بەگوێرەی بڕیارێك لەلایەن كۆمیتەی ناوەندی حیزبی شیوعی بڕیاردرا كە ئاژانسێك بەناوی تاس TASS "تەلەگرامنۆی ئەگێنستڤا سەڤێتسكۆڤە سایوزە" دابمەزرێنن. لە هەمان بڕیار نووسرایە كە ئاژانسی TASS زۆربەی كارەكانی ر ت ئەی بكات.

ئاژانسی تاس هەر لە دامەزراندنیەوە، مافی بلاوكردنەوەی هەموو هەواڵەكانی ناوەوە و دەرەوەی بەخۆی دا. لەم ئاژانسە ٤٠٠٠ ڕۆژنامە و ئێزگەی رادیۆ و كەناڵی تەلەفزیۆن لەگەڵ ١٠٠٠ دەزگای ڕاگەیاندنی جیهانی سوودیان لێوەردەگرت. تاس لە ئاژانسە گەورەكانی جیهان بوو. ئاژانسی ناوبراو ٦٨٢ نووسینگەی لە ناوەوەی ولات و لە ٩٤ ولات پەیامنێری هەبوو. نزیكەی ٢٠٠٠ ڕۆژنامەنووس و فۆتۆگراف لە ئاژانسی تاس كاریان دەكرد.

لە كانونی دووەمی ١٩٩٢ تاس ناوی بە ئیتار-تاس گۆڕدرا. ئەوەش پاش هەڵوەشاندنەوەی دەوڵەتی یەكێتی سۆڤێت بوو. ئەمڕۆ ئاژانسی ئیتار-تاس یەك لەو پێنج ئاژانسەی جیهانە و

رۆڵی ناوەندی خۆی لە گەیاندنی هەواڵ وەك پێشتر لەدەست نەداوە. ئاژانسی ئیتار-تاس نووسینگەی زیاد لە ١٣٠ شوێنی روسیا و دەوڵەتانی دەرەوە هەیە.

جگە لەو ئاژانسانەی سەرەوە، چەند ئاژانسێکی تر هەن کە چەندین دەوڵەت پشتیان پێدەبەستێت. ئەو ئاژانسانە وەك ئاژانسی نێودەوڵەتی بەناوبانگ نین، لەگەڵ ئەوەشدا، تا رادەیەك رۆڵی نێودەوڵەتی دەبینن. ئەو دەوڵەتانەی پشت بەو جۆرە ئاژانسانە دەبەستن، زیاتر زمان دەوری تەواوی خۆی تێدا دەگێرێ. ئاژانسی مێنا MENA لە دەوڵەتی میسر، رۆڵی ئاژانسی نێودەوڵەتی لەنێو دەوڵەتە عەرەبەکان دەگێرێ.

ئەنسا ANSA لە ئیتالیا و ئێفێ Efe لە ئیسپانیا، رۆڵی گەورە لە دەوڵەتانی ئەمریکای لاتین دەگێڕن.

ئاژانسی کیۆدۆ Kyodo ی یابانی رۆڵی زۆر گرنگ لە گەیاندنی هەواڵ لە باشووری رۆژهەلاتی ئاسیا دەگێرێ. ئاژانسی خینهوا Xinhua لە دەوڵەتی چین لەژێر دەستەلاتی حکومەتی مەرکەزی چینە و ئەوانیش بەرێگای لێژنەی ناوەندی حیزب، بڕیار لەسەر ناوەرۆکی هەواڵەکان و شێوەی دارشتنی دەدەن و خینهوا زمانی رەسمی حکومەتی چینە. دەتوانین بڵێین کە پرینسیپی هاوبەشیان  لەگەڵ ئاژانسی تاس ی یەکێتی سۆڤێتی کۆن زۆر بوو.

ئەمرۆ لەسایەی پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیا، زۆر لە رۆژنامەکانی جیهان نووسین لەیەکتر دەکرن. لە ئەمریکا چەندین رۆژنامەی ناوچەیی ئابۆنەی گوتاریان لە رۆژنامە گەورەکان وەك: نیۆیۆرك تایمس، واشنتۆن پۆست هەیە و نووسینیان دەکرن. ئەو خزمەتگوزارییە وەك نێودەوڵەتیش کار دەکات و سوودی لێ وەردەگیرێت.

**وێنە و فیلم**

ئاژانسەکان لە سەرەتادا تەنیا کاری نووسینیان دەکرد، بەلام بەهۆی پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیا، وێنەش بۆ دەزگاکانی راگەیاندن رەوانە کرا و بازاری بۆ پەیدا بوو. وەك دەزانین سەرەتا وێنەی رەش و سپی دواتر رەنگی. گەورەترین ئاژانس لە جیهان بۆ وێنە ئەوا ئاژانسی (ئەی پی)یە AP.  زیاد لە ٢٠٠٠ ئابۆنەی هەیە.

بۆ تەلەفزیۆن وێنە و فیلم زۆر گرنگە، بەلام وەك ئاشکرایە مرۆڤ بۆ TV زیاتر ئارەزوویەتی سەیری فیلم بکات. بە تایبەتی ئەوانەی زۆر سەرنج راکێشن و دەتوانن سۆزی بینەر بجوولێنن. (رۆیتەرس تی ڤی نیوز Reuters TV News گەورەترین ئاژانسی



جیهانە لە فیلم گرتن و گەیاندنی بۆ دەزگاکانی راگەیاندن. ئەو کۆمپانیایە پێشتر ناوی ڤیسنیوز Visnews بوو. کەناڵی ناوبراو لە ئەنجامی هاوکاری نێوان کەناڵەکانی بەریتانیا دروست بوو. رۆیتەرس تی ڤی نیوس لە راستیدا پەیوەندی لەگەڵ هەموو تەلەفزیۆنەکانی جیهان هەیە. ئەوان فیلم بۆ ١٧٠ کەناڵی TV لە نزیکەی ١٠٠ ولات رەوانە دەکەن. جگە لە رۆیتەرس ئەمرۆ APTN ئەی پی تی ئێن کە دەکاتە ئەسۆشێیت پرێس تی ڤی نیوس Associated Press Television News 83 نووسینگەی لە ٦٧ ولات هەیە. ئەوان هەواڵ و دەنگوباسەکان بەفیلم بەرێگای سەتەلایتەوە رەوانە دەکەن و پەیوەندییان لەگەڵ نزیکەی ٣٥٠ کەناڵی TV لە جیهان هەیە.

لە ئەوروپا، لە پەیدابوونی تەلەفزیۆنەوە، بەردەوام ئالوگۆری لەنێوانیان کراوە. ئەمرۆ زۆر لە کەناڵە گەورەکانی جیهان، رۆڵی بلاوکردنەوەی هەواڵ بۆ کەناڵەکانی تر وەردەگرن. لەوانەش بەناوبانگترینیان کەنالی "CNN" Cable News Network ئەو کەناڵە ئەمەریکییە و مرۆڤ بەهۆی بوونی سەتەلایتەوە، دەتوانێ لە هەموو کونجێکی جیهان سەیری بکات.

وەك دەزانین سەدان کەناڵی تەلەفزیۆنی جیهانی سوود لە خزمەتگوزاری کەناڵی ناوبراو وەردەگرن. گەورەترین رووداو کە کەناڵی CNN کە توانی رۆڵی سەرەکی تێدا ببینێت، ئەوا شەری کەنداو لەساڵی  ١٩٩٠ بوو.

جگە لە کەناڵی ئاسمانی CNN چەندین کەناڵی تری ئاسمانی تایبەت بە بلاوکردنەوەی هەواڵ هەن. ئەوانەش وەك: سکای نیوس Sky News لەگەڵ BBC World کە هەردووکیان بەریتانین، لەگەڵ کەناڵی ن-تی ڤی N-TV ئەڵمانی و فۆکس نیوس Fox News و م س ن ب س MSNBC باکووری ئەمەریکان. ئەو کەناڵە ئاسمانییانە وەك رووبار هەواڵەکانی جیهان دەرژێننە ناو کەناڵەکانی تری تەلەفزیۆن و فیلمەکانی ئەوانیش لە زۆربەی کەناڵەکانی تەلەفزیۆنی جیهان نیشان دەدرێن.

لە سەرەتای ساڵی ٢٠٠٠ بەهۆی پێشچوونی تۆری ئینتەرنێت Internet، لەسەر لاپەری (سایتی) ئاژانسەکان مرۆڤ دەتوانێ وێنەی رووداوەکانیش ببینێ.

پەیامنێر بەهۆی کامیرایەکی بچووك و کۆمپیوتەرێك، یان تەلەفۆنێك کە بتوانێ فیلم بگرێ، دەتوانێ راستەوخۆ پەیوەندی بەدەزگای خۆیەوە بکات و وێنە و نووسین و فیلمی جوولێنەر بگەیەنێت.

ئەمڕۆ لەو هەموو هەواڵانەی کە بەدەست ئاژانسەکان دەگات، تەنیا سوود لە ١٠٪ی وەردەگیرێت. هەواڵ پێش ئەوەی بگاتە جەماوەر، لە چەندین بێژینگ و سەرەد و هێرەگ دەدرێت. بۆیە بەگوێرەی دوور و نزیکی ڕووداو لە ئێمە، ئێمە بایەخ بە هەواڵ دەدەین. لەزۆر کاتیشدا، ڕووداو و هەواڵەکانی دەوڵەتانی پیشەسازی و پێشکەوتوو بە هەواڵی گرنگی هەموو جیهان دادەنرێن. هەر بۆیەش نزیکەی ٦٠٪ ی ڕۆژنامەنووسانی هەواڵی هەموو جیهان لە ئەوروپا و ڕۆژئاوای ئەمریکا هەن.



## میترۆ

ڕۆژنامەی میترۆ بۆ یەکەم جار لە ڕێکەوتی **١٣-٢-١٩٩٥** لە شاری ستۆکهۆڵم لە وڵاتی سوید دەرچوو. دیزاین و سەرپەرشتی کردنی لەلایەن پێللێ ئەندرسۆنەوە بوو: ("لەڕاستیدا بیری دەرکردنی ڕۆژنامەی میترۆ لەساڵی **١٩٧٣** دەستی پێکرد. لەوکاتە پێللێ تازە لە بەشی ڕاگەیاندنی زانکۆی ستۆکهۆڵم وەرگیرا بوو. پێللێ ئەوەندە ئارەزووی لە موحازەرەکان نەدەکرد چونکە ژیانی هەرە زۆری گەنجەکانی ئەوکاتەی هەموو ئەوروپا پێك هاتبوو لەیەك پارچە خەبات دژ بە سەرمایەداری. پێللێش یەك لەو کەسە چەپانە بوو، کە دەیویست کۆمەڵگا بگۆڕێت. بۆیە خوێندن بەلای ئەو ئەوەندە گرنگ نەبوو، بەتایبەتی کە ئەو تەواو لە پرۆگرامی خوێندنی زانکۆ ناڕازی بوو.

ڕۆژێك لە وانەی ئابووری ڕۆژنامە مامۆستا پرسیارێك لە خوێندکاران دەکا: سەرچاوەی پارەی ڕۆژنامە لەکوێوە دێت؟ خوێندکارەکان لەوەڵامدا گوتیان لە ئابۆنەی خوێنەرانەوە دێت! مامۆستاکە گوتی **٣٠٪** سەرچاوەی ڕۆژنامە لە ئابۆنەی خوێنەرانەوە، بەڵام ئەوەی تر لەکوێوە دێت؟ هەموویان بێدەنگ دەبن، لەناکاو یەك لە خوێندکاران دەڵێت: لەوانەیە لە ڕێکلامەوە بێت! دیارە خوێندکارەکە ڕاستی دەکرد. لەوکاتە یەك لە خوێندکاران پرسیاری تری کرد: ئەگەر **٧٠٪** پارەی ڕۆژنامە لە ڕێکلامەوە بێت، بۆ ڕۆژنامە بەبێ پارە نەدەین بەخەڵك؟ مامۆستا هیچ وەڵامی نەبوو، بەڵام بیری دەرکردنی ڕۆژنامەی بەخۆڕا لەلایەن پێللێ لەدایك بوو. چونکە زۆربەی ئەوانەی کە ئابۆنەی ڕۆژنامەیان هەبوو کە ئابۆنەی خۆیان نوێ نەدەکردەوە لەبەر دوو هۆ بوو **یەك:** دەیانگوت پارەمان نییە. **دوو:** دەیانگوت کاتمان نییە ڕۆژنامەکەتان

بخوێنینەوە. ئەوەش وای کرد کە ڕۆژنامەیەك دەربکرێت تەواو لە ناوەڕۆك و دیزاین "تەسمیم" لە هەموو ڕۆژنامەکانی تر جیا بێت.

ئەو بیرانەی سەرەوە بوونە هۆی لەدایکبوونی ڕۆژنامەیەکی نوێ کە لە ماوەیەکی کەم توانی ببێتە یەك لەو بیست ڕۆژنامە گەورانەی کە ئێستا لە جیهان هەن. گرنگی بیری پێللێ لێرەدا ئەوە بوو کە دەیزانی خەڵك دەیەوێت چ جۆرە ڕۆژنامەیەك بخوێنێتەوە. (پێللێ لەبەر ناخۆشی بابەتەکانی بەشی ڕۆژنامەنووسی تەواو نەکرد، سەرەتا لە چاپخانە کاری کردو دواتر بۆ ماوەی نۆ ساڵ لە ڕۆژنامەی داگینس نیهێتەر وەك دیزاین و سەرپەرشتی ناوەڕۆکی ڕۆژنامەی کرد). ئەوەش دەکاتە ئەوەی کە کار و پراکتیك ئەم پیاوەی فێری ڕۆژنامەگەری کرد").

ڕۆژنامەی میترۆ زوو شوێنی خۆی لەنێو خوێنەران کردەوە و بۆیەش بوو بەیەك لە ڕۆژنامە گەورەکانی شار. ئەو ڕۆژنامەیە بەخۆڕا لە وێستگاکانی میترۆی ستۆکهۆڵم دابەش دەکرێ. لەسەرەتادا خەڵك لەپێش وێستگاکانی میترۆ دابەشیان دەکرد و دواتر شوێنی تایبەتییان لەناو وێستگاکان بۆ ڕۆژنامە دروست کرد. بەزۆربوونی ژمارەی خوێنەران شوێنی تایبەت بۆ فڕێدانی ڕۆژنامەی میترۆش دروستکرا. بەم شێوەیە مرۆڤ کە دەچێتە ناو وێستگا دانەیەك لەو ڕۆژنامە بەیانییە هەڵدەگرێ و کە دەگاتە شوێنی مەبەستیش، ئەگەر بیەوێ فڕەی بدات، ئەوا وەك گوتمان ڕۆژنامەکە دەخرێتە ناو بەرمیلێکی سەوزی گەورە. ئەمەش بۆ ئەوەی ڕۆژنامەی میترۆ ناو وێستگاکان پیس نەکات.

ئەمڕۆ میترۆ لە سوید ڕۆژانە یەك ملیۆن و ٩٤ هەزار کەس دەیخوێنێتەوە. لە هەموو جیهانیش ژمارەی خوێنەرانی گەیشتۆتە ١٤ملیۆن و پێنج سەد هەزار خوێنەر.

پاش سەرکەوتن و بەرەو پێشچوونی میترۆ، بیرکرایەوە کە هەمان ڕۆژنامە لە شوێن و وڵاتی تر دەربکەن. پاش دە ساڵ بەسەر دەرچوونی ژمارەی یەکەمی، ڕۆژنامەی میترۆ بەیەك لە بیست ڕۆژنامە گەورەکانی جیهان دەژمێردرێت. دەستەی نووسەران پلانیان هەیە کە لەماوەیەکی نزیکی داهاتوو میترۆ ببێتە یەك لە سێ یان چوار ڕۆژنامەی گەورەی جیهان. ڕۆژنامەی میترۆ لەلایەن میترۆ ئینترناشیۆنال دەردەچێت و سەر بەهیچ پارتێکی سیاسی نییە. جگە لە خوێندنەوە لەسەر سیاسەت، باس لە وەرزش، فەرهەنگ، ئاو و هەوا، کرۆنیکا "درێژە پێدان و باسکردنی ڕووداو لە کاتی خۆی" لەگەڵ بەرنامەکانی ڕادیۆ و تەلەفزیۆنیشی تێدان. لەبەر گرنگی ڕۆژنامەی میترۆ، وا لەخوارەوە ڕۆژی دەرچوونی لە شار و دەوڵەتان دەنووسین.



**١- میترۆ ستۆکهۆڵم Metro Stockholm**: لە ١٣-٢-١٩٩٥ ڕۆژنامەی میترۆ بۆ یەکەم جار لە ستۆکهۆڵم دەرچوو. ئێستا میترۆ پاش ڕۆژنامەی داگینس-نیهێتەر بە گەورەترین ڕۆژنامەی بەیانیانی ستۆکهۆڵم لەقەڵەم دەدرێت.

**٢- میترۆ پراگ Metro Prag**: ژمارەی یەکی لە هاوینی ١٩٩٧ لە شاری پراگ پایتەختی چیك دەرچوو. ئێستا ڕۆژنامەی میترۆ گەورەترین ڕۆژنامەی وڵاتی چیکە.

**٣- میترۆ یەتەبۆری Metro Göteborg**: ژمارە یەکی لە ١٦-٢-١٩٩٨ لە شاری یەتەبۆری دەرچوو. ئێستا پاش ڕۆژنامەی یەتەبۆری پۆستن بە گەورەترین ڕۆژنامەی بەیانیانی شار دەژمێردرێت.

**٤- میترۆ بوداپێشت Metro Budapest**: ژمارە یەکی لە ٧-٩-١٩٩٨ لەشاری بوداپێشتی پایتەختی هەنگاریا دەرچوو. ڕۆژنامەی میترۆ ئێستا گەورەترین ڕۆژنامەی بوداپێشت و هەنگاریایە و لە نیسانی ٢٠٠١ یشەوە لە هەموو شارە گەورەکانی هەنگاریا بڵاودەکرێتەوە.

**٥- میترۆ هۆڵەند Metro Holland**: ژمارە یەکی لە٢١-٦-١٩٩٩ بە تیراژی ٢٥٠ هەزار دانە دەرچوو. ئێستا ڕۆژنامەی میترۆ لە ١٦٢ وێستگای میترۆ و شەمەندەفەر بڵاو دەکرێتەوە و دەستەی نووسەرانی لە شاری ئەمستردام دادەنیشن. میترۆ هۆڵەند بووە پێنجەم ڕۆژنامەی هۆڵەندا و لە ١٣-٩-١٩٩٩ لە ٤٢ وێستگای میترۆی شاری ڕۆتەردامیش بڵاودەکرێتەوە.

**٦- میترۆ ئەورووپا Metro Europa**: ئەم ڕۆژنامەیە لە شاری هێلسینکی لە سەردەمی هەڵبژاردن بۆ سەرۆك کۆمار و بۆ پەرلەمانی ئەورووپا لە نێوان مانگی حەوت و دوانزە دەرچوو. میترۆ زیاتر لە ئوتێل و فڕۆکەخانەکان بڵاودەکرایەوە.

**٧- میترۆ هێلسینکی Metro Helsingfors**: لە ٧-٩-١٩٩٩ ژمارەی یەکی بە تیراژی ١٤٠ هەزار دانە دەرچوو. ئەو ڕۆژنامەیە لە ١٥٠٠ شوێنی جیای هێلسینکی دەست دەکەوێت. ئەو شوێنانەش وەك وێستگای میترۆ، شەمەندەفەر، پاس لەگەڵ سوپەرمارکێتە گەورەکان.

**٨- میترۆ سکۆنە Metro Skåne**: ژمارە یەکی لە ١٣-٩-١٩٩٩ دەرچوو. ئەم ڕۆژنامەیە زیاتر تایبەتە بە باشووری دەوڵەتی سوید. لە سەنتەری شارە گەورەکان لەگەڵ سوپەرمارکێتەکان و وێستگای پاس و شەمەندەفەرەکان دەست دەکەوێت.

**٩- میترۆ سانتیاگۆ Metro Santiago**: لە وڵاتی شیلیّ ژمارەی یەکەمی لە ١٤-١-٢٠٠٠ دەرچوو. دادگای بەرزی وڵات بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەی میترۆی لە وێستگاکانی شەمەندەفەر و میترۆ قەدەغە کرد، بەڵام میترۆ بە یارمەتی و پشتیوانی دانیشتوانی سانتیاگۆ بەردەوام دەردەچێت.

**١٠- میترۆ فیلەدەلفیا Metro Philadelphia**: ژمارەی یەکی لە ٢١-١-٢٠٠٠ دەرچوو. ڕۆژنامە هەر لەدەرچوونی ژمارە یەکەوە، لەلایەن خاوەن ئیمتیازانی ڕۆژنامەکان و ڕۆژنامەی نیۆ یۆرك تایمس درا بەدادگا. بەڵام ڕۆژنامە بەرێکوپێکی لە دەرچوون هەر بەردەوامە.

**١١- میترۆ زویرخ Metro Zurich**: لە سویسرا ڕۆژنامەی میترۆ لەژێر ناوی میترۆپۆل لە ٣١-١-٢٠٠٠ دەردەچێت. کۆمپانیای شەمەندەفەری حکومی مافی دەرکردنی ئەو ڕۆژنامەیەی بەخۆی دا و لە ١٧٢ شوێن بڵاوی دەکردەوە. ڕۆژنامە لە ١٣-٢-٢٠٠٢ لەبەر دەستنەکەوتنی قازانج لە دەرچوون وەستا.

**١٢- میترۆ تۆرێنتۆ Metro Torento**: دەرچوونی ئەم ڕۆژنامەیە لە کەنەدا ڕۆژنامەنووسانی تووشی گرفتێکی گەورە کرد، چونکە لە هەمان هەفتە دوو ڕۆژنامەی بەخۆڕایی تر لە هەمان شار دەرچوون. میترۆ لە کیۆسك (کۆشك) و شەمەندەفەری نێو شار بڵاو دەکرێتەوە. هەر لە سەرەتاوە ئەم ڕۆژنامەیە بە تیراژی ١٥٠-٢٠٠ هەزار دانە دەرچوو.

**١٣- میترۆ ڕۆم Metro Rom**: ژمارە یەکی لە ٣-٧-٢٠٠٠ دەرچوو. ئەم ڕۆژنامەیە لە وێستگاکانی میترۆ، شەمەندەفەر لە دەوروبەری شاری ڕۆما بڵاو دەکرێتەوە.

**١٤- میترۆ بوێنوس ئایرێس Metro Buenos Aires**: بۆ یەکەم جار لە ئەرگەنتینا لە ٩-١٠-٢٠٠٠ بە تیراژی ٣٠٠ هەزار دەرچوو. پاش ڕۆژنامەی کلارین میترۆ بە دووەم ڕۆژنامەی وڵات دەژمێردرێت.

**١٥- میترۆ میلانۆ Metro Milano**: ژمارە یەکی میترۆ لە میلانۆ لە ٣٠-١٠-٢٠٠٠ دەرچوو. میترۆ لە میلانۆ لەلایەن خەڵکەوە لەپێش وێستگاکانی میترۆ و سەنتەری شار بە تیراژی ٢٠٠ هەزار دانە بڵاوەکرایەوە. میترۆ پاش ڕۆژنامەی کۆرییرا دێلا سێرا بە گەورەترین ڕۆژنامەی شار دەژمێردرێت. ئەگەر میترۆ میلانۆ لەگەڵ میترۆی ڕۆم بەیەکەوە بژمێردرێن، ئەوا تیراژیان دەگاتە ٤٠٠ هەزار دانە بەم جۆرە میترۆ دەبێتە سێیەم ڕۆژنامەی گەورەی ڕۆژانەی ئیتالیا.



**١٦- میترۆ وارشۆ Metro Warszawa**: لە پایتەختی پۆڵۆنیا لە ٦-١١-٢٠٠٠ لەژێر ناوی میترۆپۆل وارشۆ دەردەچێت. ژمارە یەکی بەتیراژی ٢٠٠ هەزاردانە دەرچوو. لە وارشۆ لە پێش وێستگای میترۆ و شەمەندەفەر بڵاو دەکرێتەوە. میترۆ بەتیراژ گەورەترین ڕۆژنامەی شاری وارشۆیە.

**١٧- میترۆ ئەسینا Metro Aten**: لە گرێکلاند بەناوی میترۆ ڕامە ژمارە یەکی لە ١٣-١١-٢٠٠٠ دەرچوو. هەر لە سەرەتای دەرچوونیەوە بووە گەورەترین ڕۆژنامەی ئەسینا. میترۆ ڕامە لە پێش وێستگای میترۆ و شەمەندەفەر و خانوو سۆپەرمارکێتە گەورەکان بڵاودەکرێتەوە.

**١٨- میترۆ مۆنتریال Metro Montreal** : میترۆ بۆ جاری دووەم لە وڵاتی کەنەدا دەرچوو. وەك لەسەرەوە نووسیمان جاری یەکەم لە تۆرێنتۆ دەرچوو. میترۆ مۆنتریال بە زمانی فەرەنسی دەردەچێت. لە سەرەتادا تیراژی ١٠٠ هەزار دانەبوو. ڕۆژنامەی میترۆ بەدەست لەگەڵ شوێنی تایبەت کە بۆی کراوە بڵاو دەکرێتەوە. میترۆ گەورەترین ڕۆژنامەی مۆنتریالە و ڕۆژانە ٣٥٠ هەزار کەس بە میترۆ هاتوچۆ دەکات.

**١٩- میترۆ بەرشەلۆنە Metro Barcelona**: ژمارە یەکی لە ٥-٣-٢٠٠١ دەرچوو. ناوی ڕەسمی میترۆ لە شاری بەرشەلۆنە بە ناوی میترۆ دیرێکتۆیە. ئەم ڕۆژنامەیە بە تیراژی ٢٠٠ هەزار دانە بەدەست بڵاو دەکرێتەوە. ئەوەش دەکاتە دووەمین ڕۆژنامەی گەورەی شار.(بەدەست بڵاودەکرێتەوە یانی چەند کەسێك لەسەر شەقام وەستاون و هەریەکەو هەمبێزێك ڕۆژنامەی پێیە و هەرکەسەی بەلایان تێپەڕ ببێت، دانەیەکی پێدەدەن).

**٢٠- میترۆ بۆستۆن Metro Boston**: بووە دووەمین ڕۆژنامەی میترۆ لە ئەمەریکا، کە ژمارەی یەکی لە ٣-٥-٢٠٠١ دەرچوو. تیراژی میترۆ لە بۆستۆن ١٧٥ هەزارە و جگە لە میترۆ و پاس و شوێنە گرنگەکانی شار، لە زانکۆش بڵاودەکرێتەوە.

**٢١- میترۆ ئەوروپا Metro Europa**: لە شاری یەتەبۆری وڵاتی سوید دەرچوو. ئەم جارەیان تەنیا بۆ ماوەی سێ ڕۆژ و بەبۆنەی کۆبوونەوەی گەورەی دەوڵەتانی بازاڕی هاوبەشی ئەوروپا کە لە ١٤-١٦/٦-٢٠٠١ لە شاری یەتەبۆری "سوید" گێڕدرا و ڕۆژنامەی میترۆ دەرچوو. وەك دەزانین لەو کاتە هەزاران ڕۆژنامەنووس بۆ گەیاندنی هەواڵەکانی کۆبوونەوە بۆ یەتەبۆری هاتبوون.

**٢٢- میترۆ مەدرید Metro Madrid**: بەناوی میترۆ دیرێکتۆ لە شاری مەدریدی پایتەختی ئیسپانیا لە ٢٧-٨-٢٠٠١ بۆیەکەم جار دەرچوو. ڕۆژنامەی میترۆ گەورەترین ڕۆژنامەی مەدرید و بەرشەلۆنەیە. بەدەرچوونی ژمارەی مەدرید، میترۆ بووە یەك لەو پێنج ڕۆژنامە گەورانەی کە بەزمانی ئیسپانی دەردەچن. میترۆ بەدەست لە وێستگاکانی میترۆ و شەمەندەفەر و پاسەکان لەگەڵ سەنتەری شار بلاّو دەکرێتەوە.

**٢٣- میترۆ کۆپنهاگن Metro Köpenhamn**: ژمارەی یەکی لە ٣١-٨-٢٠٠١ لە شاری کۆپنهاگنی پایتەختی دانمارك دەرچوو. بەدەرچوونی لە شاری کۆپنهاگن، ژمارەی خوێنەرانی ڕۆژانە لە نۆ ملیۆن ڕەتی کرد و بووە بیست و یەکەمین ڕۆژنامەی جیهان. لە کۆپنهاگن لەژێر ناوی میترۆ ئێکسپرێس و بە تیراژی ١٣٠ هەزار دەردەچێت.

**٢٤- میترۆ هۆنگ کۆنگ Metro Hong Kong**: لە بەهاری ٢٠٠٢ بە تیراژی ٤٠٠ هەزار دانە دەرچوو. ڕۆژنامەی میترۆ ڕۆژانە هەواڵ و دەنگوباسی نوێ دەداتە خوێنەرانی شاری هۆنگ کۆنگ.

باسکردنی ڕۆژنامەی بەخۆڕا (بێ پارە) ی میترۆم بۆ خوێنەرانی کورد پێگرنگ بوو تاکو ئاگاداریان لە کار و پێشخستنی ڕۆژنامەی سەردەم هەبێت. لەلایەکی تریش ئەگەر کورد لەداهاتوو بیانەوێ هەمان ڕۆژنامەیان، بەهەمان ناو بەلاّم بەناوەڕۆکی جیا، لە شارەکانی تری کوردستانی گەورە هەبێت، دەتوانن سەربور و سوود لە ڕۆژنامەی میترۆ وەربگرن. چونکە ئەم ڕۆژنامەیە بەوە ناوەستێت کە هەر بە بیست و یەکەمین ڕۆژنامەی جیهان بمێنێتەوە، بەڵکو وەك لە سەرەوەش باسمان کرد، دەستەی نووسەران خەبات دەکەن کە بەماوەیەکی نزیك ببن بە سێیەم یان چوارەم ڕۆژنامە لە جیهان. ئەگەر ئەوان ئەوەندە بەرەو پێشیش نەچن، بێگومان زۆر گەورەتر دەبن لەوەی کە ئەمڕۆ هەن.

ئەوەی ئەم ڕۆژنامەیەی وا بەرەو پێش برد، پێش هەموو شتێك دیزاینی تایبەتی ڕۆژنامەیە لەگەڵ ناوەڕۆك و بابەتەکانە. ڕۆژنامەی میترۆ لە سوید، زۆربەی هەرە زۆری هەواڵەکانی لە ئاژانسی دەنگوباسی سویدی بەناوی ت ت (تیدنینگەرناس تەلەگرام بیرۆ) وەردەگرێت. بەمەش خەرجی ڕۆژنامەکە زۆر کەمتر دەبێت. لەوەش گرنگتر هەواڵەکان بەکورتی بلاّودەکاتەوە و خوێنەر بەماوەیەکی کەم پێڕا دەگات زۆر هەواڵ بخوێنێتەوە. وەرگرتنی هەواڵەکان لە ئاژانسەکان، دەبێتە هۆی ژمارەی کەمی کارگێڕانی ڕۆژنامەکە،



ئەوەش دەکاتە کەمی خەرجی ڕۆژنامە. بۆیە دەستەی نووسەرانی میترۆ، ئاسانتر بەسەر کێشە ئابوورییەکانیان زاڵ دەبن. وەك دەزانین، هەموو داهاتی ڕۆژنامەی میترۆ تەنیا لە ڕێگای ڕێکلامەوەیە، بۆیە هەموو ئەو شارانەی پێشکەوتوون و ئابوورییان چاکەو ڕێکلام شوێنی خۆی لە دەزگاکانی ڕاگەیاندن هەیە، بەدوور نازانرێت دەستەی نووسەرانی ڕۆژنامەی میترۆ لەدەرگایان بدەن و ڕۆژی داهاتوو شارەکە ڕۆژنامەیەکی نوێی بۆ زیاد بێت.

کە باس لە دیزاینی ڕۆژنامەی میترۆ دەکەین، باس لە هەموو ژمارەکانی دەکەین، کە هەر هەموویان بەیەك دیزاین، بەلاّم بەناوەڕۆکی جیا و زمانی جیا جیا دەردەچن. ئەوەش گرنگە بزانین کە ڕۆژنامەی میترۆ لە هەر شوێنێك دەربچێت، بەزمانی ئەو شوێنە و گرفت و پرسیارەکانی ئەو شوێنەش لەسەر لاپەڕەکانی خۆی بەرز دەکاتەوە.

## سەرهەڵدانی ئەلف و بیٚ و

## کاغەز دروستکردن

نازانین کەی مرۆڤ دەستی بەچاندن و بەکارهێنانی زەوی کرد و ئاژەڵی لە ماڵـەوە ڕاگـرت و بەخێوی کرد. دوور نییە لەو کاتە ئەوان زمانێکی ئاسانتریان بۆ قسەکردن بـەکار هێنـابیٚ، کـە مرۆڤ فێری چاندن بوو، ژمارەیان پتری کردو ژیانیشیان خۆشتر بوو.

گۆڕانکاری لە نیگار بۆ سیمبۆل لە سیمبۆل بۆ پیت دیار نییە لـە چ سـەردەمێك بووبێـت، بەلاٚم ئەوەی تا ئەمڕۆ لای زانایان ئاشـکرایە، یەکـەم جـار نووسـین لەلایـەن سـۆمەرییەکانەوە بەکارهاتووە. ئەوەش ٥٥٠٠ ساڵ لەمەوبەر بووە.

زمانی میسماری سۆمەرییەکان ئەوەندە پێش کەوتبوو کە لەلایـەن بابلییـەکانیش لـە سـاڵی ١٧٢٠ پ.ز بەکاریان هێناوەو هەمان زمان لەو کاتە لە هەموو رۆژهەلاٚتی ناوەڕاست بلاٚوبۆتەوە[1].

ئەوان نووسینەکانیان لەسەر تـابلۆی قـوڕاوی دەنووسـی و دواتـر وشـکیان دەکـردەوە، تـا ئەمڕۆش هەندێك لەو تابلۆیانە ماون، نووسینی سەر تابلۆکان نیشانی دەدەن کە سـۆمەرییەکان لەو سەردەم ژیانێکی ئارامیان هەبووە. تەنیا لە شاری بچووکی (لەگش) لە یەك کۆبوونـەوەی دینی، دیارە کە ٤٨ کەس نانیان دروستکردووە لەگەڵ چەندین کەسی تر خـەریکی کـاری تـری هەمان ئاهەنگ بووبن.

هاوکات لەگەڵ شارستانێتی سۆمەری و بابلییەکان، شارستانییەکی تریش لەسـەر رووبـاری نیل پێش ٣٥٠٠ ساڵ پ.ز هەبوو. ئەوانیش زۆر بایەخیان بەخوێندن دەدا، بۆیە لە نامەیەك کە

1. Donald Jackson، Skrivkonstens Historia. Hongkong، 1987.p.16

کابرایەکی گەورە بۆ کوڕەکەی دەنووسیٚ و دواتر لـە قوتابخانـەکان دەخوێنـدرا، بـەم شـێوەیەی خوارەوە ئامۆژگاری کوڕەکەی دەکرد: تیپەکانت خۆش بوێت، چۆن تـۆ دایکـت خـۆش دەوێـت، چونکە لەگەڵ ئەو زانیارییە، رزگارت دەبیٚ لە هەموو کارێکی گران و دەکرێی بە حاکم و خەڵك رێزی بۆت دەبیٚ[1].

میسرییەکان لە سۆمەرییەکان دوورتر رۆیشتن و توانییان ئەلف و بیٚ دابنێن. ئەوان تـا ٢٤ نیشانە هاتن. کە تیپەکانی بزوێنیشی تێدا بووە. هەر چەندە هەردوو شارسـتانییەکە لـە یـەك سەردەم بووین، لەگەڵ ئەوەش هەر یەکەو بەشێوەیەك نووسینی کردووە.

ئەوەش بەزمانی یۆنانی پێی دەڵێن هیێرۆگلیفی Hieroglyphi کە دەکاتـە (نووسـینی هەڵکەنراوی پیرۆز). یۆنانییەکان ٢٠٠٠ ساڵ دواتر بۆ یەکـەم جـار ئـەو جـۆرە نووسـینەیان بینیبوو. لەبەر گرانی نووسینی تابلۆ قوڕەکان، سۆمەری و دواتر گەلانی تری ناچـارکرد کـە شێوەیەکی تری ئاسان بۆ نووسین بدۆزنەوە. ئەوەبوو میسرییەکان بۆیەکەم جار قەڵـەمیان بـۆ نووسین بەکارهێنا. ئەوانیش پاپیرۆس و مەرەکەبیان دۆزییەوە کە تا ئەمڕۆش نووسین لەسـەر هەمان پرێنسیپ بەڕێوە دەچێت. میسرییەکان رەنگ و مەرەکەبی سووریان بـۆ سـەر دێـر و سەرەتای نووسین بەکاردەهێنا. **(سەیری وێنەی ژمارە ٢ بکە)**

یۆنانییەکان ئەلف و بێی خۆیان لە سەرەتادا لە فێنیقییەکان وەرگرتبوو. ئەوان لە راسـتەوە بۆ چەپ دەیاننووسی. لە سەدەی دووی

---

١. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل.١٨.






**وێنەی ژمارە (٢)**

پاپیرۆس بەم جۆرە دروست دەکریٚ:

١- بەچەقۆ پارچەی تەنك و یەکسان دەبڕدرێت.
٢- چەند دانەیەك لە تەنیشت یەکتر ڕیز دەکریٚ و دواتر ڕیزێکی تـری لەسـەر دادەنـریٚ، ئینجا دەهۆنرێتەوە.
٣- لەژێر شتێکی گران دادەندرێت تاکو ڕاست ببێتەوە. دوای وشك بوونـەوە، لەسـەرخۆ دەڕندرێت و بەرز و نزمیەکەی لادەبرێت و یەکسان دەکرێت.

پێش زایین شێوەی نووسینیان گۆڕی ئەم جارە لە چەپەوە بۆ ڕاستیان دەستپێکرد[١]، کۆنترین نووسینی یۆنانییەکان کە تا ئەمڕۆ مابێت، لەسەر بەرد هەڵکەنراوە.

وەك دەزانین لە میسر پاپیرۆس زۆر بۆ نووسین بە کاردەهات، ئەم بەکارهێنانەش لە هەموو ناوچەکە تەشەنەی سەندو بڵاو بۆوە. دروستکردنی پاپیرۆس ٣٠٠٠ ساڵ پ. ز مۆنۆپۆڵی پاشاکانی ئەوسای میسر بوو. هەر دەوڵەتێك پەیوەندی لەگەڵ میسر هەبوبێ ئەوا فێری بەکارهێنانی پاپیرۆس بووە. بەکارهێنانی پاپیرۆس ٤٠٠٠ ساڵ بەردەوام بوو. ٢٠٠ ساڵ پ. ز. ڕۆمەکان لەگەڵ یۆنانییەکان لەبەر پەرەسەندنی شارستانییەتیان پێویستیان زیاتر بەبەکارهێنانی پاپیرۆس بوو، ئەوەش بووە هۆی بەرزبوونەوەی نرخی پاپیرۆس. بەرزبوونەوەی نرخیش وای کرد کە بەدوای چارەسەرێك بگەڕێن بۆ ئەوەی نووسین لەسەر شتی تر بنووسن.

وەك دەزانین میسرییەکان جگە لە نووسین لەسەر پاپیرۆس، پێستەی ئاژەڵیشیان بەکار هێناوە. ئەوەش ٢٥٠٠ ساڵ پ. ز. بووە. بەگشتی پێستی مەڕ، گا، بزن بەکار دەهاتن، بەڵام کار دۆزراونەتەوە کە لەسەر پێستی مامز، ستراوس (وشترمرخ) نووسراون. ماوەیەکی زۆر تەنیا لەسەر یەك لای پێستە (لای بەمووەکە) دەتوانرا بنووسرێت و لاکەی تر سوودی لێ وەرنەدەگیرا.

پێرگەمێنت Pergament یان پێستی نووسیو. بەشێوەی ڕاست دوو سەدە پێش زایین توانرا باشتر سوودی لێ وەربگیرێ. ئەوەش بووە هۆی ئەوەی بۆ یەکەم جار نووسینەکان لەجیاتی وەك پاپیرۆس لوول بدرێن، وەك کتێبی ئەمڕۆ پان بوون. لەو کاتە پێستەیان بەو جۆرەی خوارەوە خۆش دەکرد:

لە سەرەتا پێستەکە لەناو ئاوی سارد دادەنرا، دواتر مووەکەی لێدەکرایەوە و ئینجا لە چوارچێوەیەك توند دەبەسترا و ڕەنگیشی پێدا دەکرا. ئەو ماددەیەش چەوری زیاد لە پێستەکە دەکاتەوە. دواتر پێستەکە بەچوارچێوەکەی خۆی وشك دەکرێتەوە و ئەوسا بەچەقۆیەکی تایبەت سەرلەنوێ دەڕندرێ و لەوکاتە پێستەکە لە چوارچێوەکە دەکرێتەوە و بەگوێرەی پێویست بۆ نووسین پارچە پارچە دەکرا. ئەگەر پێستەکە وەك ئەوەی لەسەرەوە باسمان کرد خۆشکرابا، دەتوانرا لەهەردوو لای بنووسرێت. هەڵگرتنی پێستە زۆر لە پاپیرۆس باشتر و چاکترە، لەگەڵ

١. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل.٣٥.



ئەوەشدا چەند سەد ساڵێکی خایاند تا پێرگەمێنت توانی لەئیمپراتۆریەتی ڕۆمەکان پێشبڕکێ لەگەڵ پاپیرۆس بکات. پێستە لە هەموو شوێنەکان بۆ نووسین بەکاردەهات، لەگەڵ ئەوەشدا پاپیرۆس بۆ کاری هەرزان و ڕۆژانە لە بەکارهێنان سوودی هەر لێ وەردەگیرا.

وەك دەزانین ڕۆمەکان لە سەرەتادا ئەلف و بێی یۆنانییان بەکار دەهێنا. ئەگەر ئەوان بیانوویستایە چەند دانەیەك لە نووسینێك کۆپی بکەن ئەوا چەند نووسەرێك لە ژوورێك کۆدەبوونەوە و یەکێ تێکستەکەی بۆ دەخوێندنەوە و ئەوانیش لەسەر بەرد دەیان تاشی. بۆ ئەوەی لەسەر تەختەکان شوێنی نووسینەکان بە جوانی بمێنێتەوە، ئەوا لە سەرەتادا ڕوویەکی بەردەکەیان جوان و لووس دەکرد و بە پاپیرۆس لەسەر ڕووی بەردەکە پێتەکەیان دەنووسی و ئەوەش وەك کۆپی لێدەهات، لەو کاتە لەسەر کۆپیەکە پێتەکەیان هەڵدەکۆڵی. لە ئیمپراتۆریەتی ڕۆمەکاندا هەرچەندە پیشە زۆر بووبن، بەڵام گرنگتر لە هەموویان خزمەتکردن لە لەشکر بوو. خزمەتکردن لە لەشکر بایەخی زۆری پێدراوەو جێی شانازی زۆر کەس بووە، بۆیە زۆر لە گەنجانی ئەو کاتە، ئەگەر بۆ ماوەیەکی کەمیش با، لە دەرەوەی وڵاتی خۆیان خزمەتی لەشکریان دەکرد. لێجۆن Legion پێك هاتبوو لە نزیکەی ٦٠٠٠ کەس، لەگەڵ سەرکردەو خەڵکی نا چەکدار وەك: هەواڵ نووسەران، نووسەران، قەشە، دکتۆر، ئەندازیار . . .هتد هەموو لەشکرەکە لە لایەن ئەفسەرێك کە دەسەڵاتی (پلەی سیناتۆری) هەبوو سەرپەرشتی دەکرا. لەو کاتە دەیکردە گەورەترین دەسەڵات لەناو ئیمپراتۆریەت. ئەوان هەموو ڕووداوەکانیان دەنووسی و جەماوەری خۆیان لە چالاکییەکان ئاگادار دەکردەوە.

ئەگەر باس لە کتێب بکەین، ئەوا یەکەم کتێب ئینجیلی سەدەی چوارەمی زایینییە، هەندێك لە کتێبی ڕۆمەکانیش ماون بەڵام بەتەواوی نەماون و بەش بەشن.

لەو کاتە دەوڵەتانی ڕۆژهەلاتی ئەوروپا ئەلف و بێی خۆیان بۆ نووسین جاری نەبوو، کرەواتییەکان ساڵی ٧٠٠ زایینی و پۆڵۆنییەکانیش ساڵی ٩٩٩ زایینی کاسۆلیکی ڕۆمایان قەبول کرد[١].

لە ڕێگای ئاینیشەوە ئەدەبیاتیان بۆ دەهات و ئەوەش بووە هۆی هەزمکردنی ئەلف و بێی لاتینی. بەڵام سێرپەکان و بولگار و ڕوسەکان ئەرتەدۆکسیان قەبوڵ کرد، ئەلف و بێی کریل لە سەدەی ٨٠٠ قەبوڵ کرا. لە سەدەی ١١ ڕۆڵی کەنیسە کەمتر بوو زیاتر کۆنترۆڵ لەسەر زانست

١. هەمان سەچاوەی پێشوو ل.٦٨.

نەما. ئەوەش بووە هۆی کردنەوەی قوتابخانەو زانکۆ لە پایتەختەکان کە پەیوەندییان لەگەڵ کەنیسەکان نەبوو. لە ئیتاڵیا قوتابخانەی یاسایی لە شاری (بۆلۆگنە Bologna) کرایەوە و قوتابخانەی مێدیسین لە شاری (سالێرنۆ Salerno) لەیەکەمەکان بوون کە کرانەوە. یەکەمین زانکۆی گەورە لە فەرەنسا لە سەدەی ١١ کرایەوە[١].

خوێندن لەو کاتە زۆرتر بەزمانی لاتینی بوو. خوێندکاری ئەو کاتە زۆر بەئاسانی دەیتوانی لەهەر شوێنێك بیەوێ بخوێنێ، بخوێنێ، بێ ئەوەی گرفتی زمانی خوێندنی بێتە پێش.

لە کۆتایی سەدەی ١١ زانکۆ لە زۆربەی شوێنەکانی ئەوروپا هەبوون، ئەوانەش بووبوونە سەنتەری زۆر مەزن بۆ خوێندنی تیۆلۆگی (خوێندنی دینی) و هونەر. پاش ئەوە چەندین زانکۆی تر وەك: ئۆکسفۆرد، نیێپال، پادوە Oxford, Neapel, Padua کرانەوە. لەزۆر کاتیشدا قەیسەرو پاشاکان دەیانپاراستن.

تا سەدەی ١١ بەرهەم هێنانی کتێب بەدوو ئاراستە دەڕۆیی (دوو بازاڕی هەبوو) یەکیان کتێبی زۆر باش بوون کە تەنیا بۆ پاشاکان و ئەوەی تریش کتێبی ئاینی بوون بۆ کەنیسەکان دەنووسرانەوە.

یەکەم جار ئەدەبی نەتەوەییی بایەخی پێدراو هەندێك نووسەر وەك : دانتێ Dante چاوسێر Chaucer بەزمانی نەتەوەی خۆیان دەستیان بەنووسین کرد[٢].

پاش گەشە سەندنی بازرگانی و دەوڵەمەند بوونیان لە شارە بچووك و گەورەکانی ئەوروپا، پێویستی نوێ بۆ ژیان پەیدابوون وەك: پیشەی دەستی، نووسەرەکان، کتێب بەرگ کەرەکان...هتد. بۆیەش ئێستا بازرگانێکی دەوڵەمەند دەیتوانی کتێبێك بۆخۆی لە کلاسی پاشا بەرادان بدات. ئەوەش لەسەر: ڕاو، کشتوکاڵ، لەدایك بوون، تەندروستی، ئاسمان ناسی، ڕۆمان...هتد بەهۆی نووسراوەکانی ئەودەم، دەزانرێ لەوکاتە ئەوان چۆن ژیاون. هەر لەرێگای ئەوانیشەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کەئەوان بەکۆمەڵ یان بەجووت کاریان کردووە. لە هەندێك کار دەنووسرا: نووسەرەکەی ئاڵانەو کاری بەرگتێگرتنیش خێزانەکەیتی. ئەوان بەپارەی دیارکراو کارەکانیان ئەنجام دەدا.

١. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل.٧٢-٧٣.

٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل.٧٦.



ریچاد دی بوری Richard de Bury کە قەشەی دورهام Durham بوو لە ناوەڕاستی ١٣٠٠ لە کتێبخانەی تایبەتی خۆی زیاد لە ١٥٠٠ کتێبی دەستنووسی هەبوو.

لە ساڵی ١٢٩٢ لە پاریس هەموو پیشە دەستیەکان دەبوایە باج بەدەوڵەت بدەن. لەو کاتە زیاتر لە ١٥٠٠٠ کەس لە پاریس زەریبەیان دەدا. لەوانە ٣٣ وێنەکێش، ٢٤ نیگارکەر، ١٣ خەریکی نەخشی کتێب و نووسینی بوون، ٣٥٠ پینەدۆز، ٣٥٠ بەرگدرو، ١٠٤ کەس خەریکی دروستکردنی نان و کێك بوون، ١٥٧ کەس چێشتخانەو باڕی هەبوو... هتد.

بەگوێرەی ئەو نووسینەی سەرەوە، دیارە بازاڕی پینەدۆز و بەرگدروو زۆر گەرمتر بووە لەبازاڕی کارکردن لەگەڵ کتێب. ئەوەش لەوانەیە لەبەر ئەوە بێت کە، کتێب لەو کاتە لەبەر کەمی و گرانی کاغەز و کاری زۆر لەسەری، کەم کەس لە توانای دابووە کتێب بۆخۆی بکڕێ و سوودی لێوەربگرێ. وەك پێشتر باسمان کرد، پێش دۆزینەوەی هونەری چاپ لەلایەن گوتنبێرگ، کتێب زۆرتر بۆ پاشا و میر و کەنیسەکان بەرادان دەدران.

# هەوڵەکانی دۆزینەوەی چاپ

لە کۆندا سوود لە دوو شێوەی چاپ وەردەگیرا. یەکیان بە ناوی مۆر ئەوەی تریش بە ناوی پەترۆن، لە مۆر تیپەکان یان نووسینەکە بەرز بوو. لە پەترۆنیش بە پێچەوانەوە شوێنی تیپەکان قووڵ دەکران. میسرییە کۆنەکان سوودیان لە پەترۆن وەردەگرت بۆ نووسینی سەر قەبر و کێلەکان. بەڵام تا چ ڕاددەیەك سوود لە هونەری پەترۆن وەرگیراوە بۆ داهێنانی چاپ، ئەوا جارێ لای کەس ئاشکرانییە.

لە زوودا قەیسەرەکان لە جیاتی مۆری خۆیان پەترۆنیان بەکاردەهێنا. ئەو بەکارهێنانەش لای کەس شاراوە نەبوو. بەڵام ئەگەر باس لە مۆر بکەین، ئەوا لە سەردەمی بابلیەکانەوە بەکارهاتووە. ئەوان مۆریان بۆ خشت دروستکردن بەکاردەهێنا.

ڕۆمەکان وشەیان بەپێچەوانە دەنووسی و لە کاتی چاپدا بە راستی دەردەکەوت و دەخوێنرایەوە بەم کارەشیان دەگوت تێسێرایێ سیگناتۆریا Tesserrae Signatoria.

یۆنانە کۆنەکانیش مۆریان بۆ کاروباری خۆیان بەکارهێناوە ئەو مۆرانە لە بەرد نەك لەدار دروست دەکران. (**سەیری وێنەی ژمارە ٤ بکە**).

ڕۆمەکان مۆریان بۆ زۆر شت بەکار دەهێنا وەك: بۆ نان، کتێبفرۆشەکانیش لەو کاتە مۆری خۆیان هەبوو. بەم جۆرە دەزانرا کتێبی ناوبراو لای کامە کتێبفرۆش نووسراوەتەوە یان ئامادەکراوە.



وێنەی ژمارە (٤)
**مۆر لە سەردەمی میسری کۆن**

یۆنانە کۆنەکان جارێکیان لە هونەری دۆزینەوەی چاپ زۆر نزیك بوون، ئەویش لە ڕێگای مۆرەوە بوو. نووسەری یۆنانی پلوتارکۆس Plutarkos ساڵی لەدایکبوونی نزیکەی ٥٠ ی زایینی و مردنی ساڵی ١٢٠ زایینی لە شاری بۆیۆتییێن Boiotien بۆمان دەگێڕێتەوە کە پاشایەك بەناوی ئەگێسیلاوس Agesilaus لەکاتی ئاهەنگی دانی پاداشت بە سەربازەکانی خۆی، وشەی نیکە NIKH یانی "سەرکەوتن" لە دەستی خۆی بەپێچەوانە دەنووسێ، بۆ ئاهەنگەکەش ئاژەڵێ دەکەن بەقوربانی، پاشا دەستی نووسراوی لەسەر جەرگی ئاژەڵەکە دادەنێ و چەند چرکەیەك لەگەڵ سەربازەکانی قسەدەکا و دەستیشی هەر لەسەر جەرگەکە ماوە، دواتر تۆقە لەگەڵ سەربازەکان دەکا و لەسەر دەستی ئەوان وشەی سەرکەوتن بەڕاستی چاپ دەبێت[1]. ئەوەی ئاشکرایە ئەو هەوڵە سوودی لێ وەرنەگیرا بۆ دۆزینەوەی هونەری چاپ و مۆر وەك مۆر مایەوە و نەبوو بەچاپ.

1. L.Chr. Nielsen, Boktryckerikonstens uppfinning. Malmö, 1900.p.34.



لەو کاتەی ئیسپانییەکان لە سەدەکانی ناوەڕاست چوون بۆ ئەمریکای لاتین، مەکسیکۆی ئێستا، بینیان دانیشتوانی ئەوێ جلیان لە پەمۆ دروستکراوە و پڕی بووە لە ڕەنگی جیا جیا و لەوەش سەیرتر ڕەنگەکان لەسەر جلەکانیان چاپکراون. کووك Cook لەکاتی گەڕانەوەی لە پۆلینێسییێن Polynesien دەڵێ دانیشتووانی ناوچە جلی سپییان لەبەردابوو کە وێنەی ڕەنگاو ڕەنگی زۆر لە ئاژەڵ و زیندەوەرانی لەسەر چاپکرابوو[1].

هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی هونەری چاپ لە ماوەی شەو و ڕۆژێك نەبووە، بەڵکو پرۆسێسێکی زۆر دوور و درێژ بووە. کتابفرۆشەکان بۆ ئەوەی پارەی زۆرتریان دەستکەوێت و دانەی زۆرتر لە کتابەکان بەشێوەیەکی ئاسانتر بنووسنەوە، ئەوا نووسینیان بەشێوەی نیگار بەکار هێناوە. لەسەر کۆپەر وێنەکان هەڵدەکۆڵدران و لەسەر داریش نووسینەکان بەرز بوون.

لەکۆتایی سەدەی دوانزە کتێب بەشێوەی سەرەوە دانەی لێ زیاد دەکرا. وەك دەزانین ناوەرۆکی زۆربەی کتێبەکان دینی بووین و دواتریش بەشەکانی تری ژیانی گرتۆتەوە. بەڵام ئەگەر بگەڕێینەوە سەر چاپکردن، ئەوا بۆ یەکەم جار، کارتی گەمە لە چین چاپکراین و دواتریش لە ڕێگای عەرەبەکانەوە گەێندراوەتە ئەوروپا. کارتەکان لەسەر کاغەزی پەمۆ چاپ دەکران. هونەری چاپکردنی کارتی گەمە لە کیشوەری ئەوروپا بۆ یەکەم جار لە وڵاتی ئیسپانیا بووە. ئەوەش لەساڵی ١٣٨٨ لەلایەن هونەرمەند و نیگارکێش یوهاشی یەکەمی کاستێل بوو. لە فەرەنسا لە ساڵی ١٣٩٢ لەلایەن هونەرمەند یاکوێمین گوینگونێوێر Jaquemin Guingoneur چاپکران. بەڵام چاپکردنی کارت بەشێوەی ئەمڕۆ بۆ یەکەم جار لە دەوڵەتی ئەڵمانیا بوو. ئەویش لەساڵی ١٤٣٣ لەلایەن کارت دروستکەر نورنبێرگەر بورگەربوچەر Nurnberger Burgerbucher بوو. لەشاری ڤینێسیاش لە ساڵی ١٤٤١ کارتی گەمە بۆ یەکەم جار چاپکرا.

لە سەرەتادا وێنەیان لە سەر دار و کۆپەر دەنەخشاند، دواتر نووسینیشیان تێکەڵاو کرد.

وەك دەزانین زۆر پێش پەیدابوونی هونەری چاپ، کتێب هەبوون، ئەوانەش بەشی هەرە زۆریان بە دەست نووسراون یانیش لە ڕێگای مۆرو پەترۆن چاپ کرابوون. ئەو کتێبانەی کە هەشبوون هەندێکیان لە زانکۆکان دەخوێنران و ئەوانی تریش زیاتر کتێب لەسەر دین لەگەڵ کتێبی فۆلکلۆر و ئەدەبی جەماوەر بوون. ئەو کتێبانەی کە چاپکراون بەپرێس یانی

١. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل.٣٥.

(پاڵەپەستۆ) چاپ نەكراون، بەڵكو چاپەكە بە شێوەیەكی زۆر ئاسان بووە، وەك: پیاو فۆرمەكەی دادەناو مەرەكەبی لە سەر پەرت دەكرد و كاغەزی لەسەر دادەنا و دواتر كاغەزەكەی بە تەختەیەك بە دەست پاڵەپەستۆی دەكرایە سەر و لە لایەكی لاپەڕەكە نووسینەكە چاپدەكرا.

ئەو كتێبانە لەبەر ئەوەی پاڵەپەستۆی زۆر دەخرایە سەر لاپەڕەكە، تەنیا دەتوانرا سوود لە یەك لای لاپەڕەكە ببینرێت. كاغەزی ئەو كاتە پەڕەكانیان ئەستوور بوون و بەكێشانی گرامی ئەمڕۆ لەنێوان ١٥٠-٢٠٠ گرام دەخەملێنرێن.

ئەو جۆرە چاپە زیاتر لە چاپی چینییەكان نزیك بوو، لەوێ ئاسنگەرێك بە ناوی پی شێن لە سەدەی ١١ یانزە توانی وشەی جیاجیا لە قوڕی تەنك دروست بكا. ئەو وشانە دەكرا لە شوێنێك بۆ شوێنێك بگوازرێنەوە، ئەو هونەرەش پێی دەگوترێ ئیدیوگرافەر "Ideografer" ئەو وشانەی زۆر جار دووبارە دەبوونەوە ئەوا پی شێن ژمارەی زۆرتری لێ دروست دەكردن و هەمووشیانی لە تەنیشت یەك ڕێك دەخست و نێوان خەتەكانیش جۆرێك لە "كەتیرە" یان "ڤاكس" (Lime, Vax, Harz)ی بەكاردەهێنا. هەمووی لە ناو فۆرمێكی ئاسن دادەناو دەی بەست و توندی دەكرد بۆ ئەوەی وشەكان لە كاتی چاپ گەمە نەكەن و نەجوولێن. كارەكانی ئەو هونەرمەندە لە چاپی دار باشتر نەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا هەنگاوێكی باش بوو بۆ دۆزینەوەی هونەری چاپ. كە خۆی مرد كەس نەبوو لە سەر هونەرەكەی ئەو بەردەوام بێت.

هونەری چاپی پی شێن تا كۆتایی سەدەی ١٩ لە ئەوروپا و هەموو جیهان لەسەر هەمان پرینسیپ و تەكنیكی ئەو بوون.

لە كۆندا بابلی، میسری، یۆنانی و ڕۆمەكان، سوودیان لە مۆری ئاسن وەرگرتووە بۆ ئەوەی بەندەكانیان پێ نیشان بكەن، ئەو مۆرانەی ئەو كاتە وەك مۆری قەسابخانەكانی ئەمڕۆ وا بوون.

دۆزینەوەی هونەری چاپ بەشێوەی كە ئەمڕۆ تێی دەگەین، یەكەم جار لە ئەڵمانیا بووە، ئەویش لە لایەن زانای بەناوبانگ یوهان گوتنبێرگ "Johan Guttenberg" بوو. مێژووی لەدایكبوونی دیار نییە، بەڵام وا دەخەملێنرێت كە لە نێوان ١٣٩٧- ١٤٠٠ی زاینی بووبێت، و گۆتنبێرگیش منداڵی سێیەمییان بووە. **(سەیری وێنەی ژمارە ٥ بكە)**





**وێنەی ژمارە (٥)**

كۆنترین پۆرترێتی گوتنبێرگ

كۆپی وێنەی شاری ماینزە، ئۆرگینالەكەی لە ١٨٧٠ لە ستراسبورگ سووتا

لە چ ساڵێك ئەو بۆ یەکەمجار چاپی کردووە، تا ئێستا روون و ئاشکرانییە، بەلاّم بە گـوێرەی دەکۆمێنتەکانی ئەو کاتەی ئەوا لە ساڵی **١٤٣٩** خەریکی کارێکی نهێنی بـووە و لـە هـەمان کاتیش ویستوویەتی خەڵکیش فێر بکا. ئەوەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو زۆر لـە دۆزینـەوەکان نزیك بووە، چونکە لە راستیدا هونەری چاپکردن تەنیا یەك دۆزینەوە نەبوو، بـەڵکو کۆمـەڵێك دۆزینەوە بووە، مرۆڤ لەو بارەیەوە دەڵێ: هونـەری دۆزینـەوەی چـاپ لـە ستراسـبۆرگ دەسـتی پێکردووەو لە شاری ماینز Mainz تـەواو بـووە. بۆیـە سـەیر نییـە کـە دەڵـێن ستراسـبۆرگ گۆتنبێرگی پەروەردە کردووە و دانیشتوانی ماینیزیش دیارییان پێشکەش کرد.



## مێژووی چاپخانە لە ئەوروپا "سەدەی پازدە"

هونەری پیت دروستکردن لەدەوروبەری ساڵەکانی ١٠٥٠ لە چین هەبوو. لە سـاڵی ١٠٤٠-١٠٤٨ ئاسنگەرێکی چینی بەناوی پی شێن پیتەکانی لە قوڕ دروست دەکرد(١). پی شێن دواتر لەناو فڕن پیتەکانی دەسووتاند و ئینجا مەرەکەبی لەسەر ڕوو دەکرد، پاشـان کاغـەزی لەسـەر پیتەکان دادەنا و بەدەست یان بەشتێکی تر پاڵەپەستۆی دەکردە سەر کاغەزەکە، بـەو شـێوەیە ئەو نووسینەی بیویستبایە لەسەر قاقەزی لوولکراو چاپی دەکرد.

لە ساڵی **١٣٩٢** لە کۆریا سەرکەوتنی زۆریان لـە هونـەری چـاپ بەدەسـت هێنـا و ئـەوان توانییان پیتەکانیان لە قورقوشم (کۆپەر) دروست بکـەن. لـە سـاڵی **١٤٠٣** لەسـەر فـەرمانی ئیمپراتۆر تای تزونگ بە ئامانجی ریفۆرمی خوێندن وپەروەردە، فەرمانی دا کتێبی کـۆری بـەو جۆرە پیتانە چاپ بکرێن(٢).

هونەری چاپی چینی و کۆری لە ئەوروپا ناسراو نەبوو. بۆیە هونەری دۆزینەوەی چاپی ئەوێ هیچ پەیوەندی بەدۆزینەوەی هونەری چاپ لە ئەوروپا نەبووە.

لە سەرەتای ساڵەکانی ١٤٠٠ لە ئەڵمانیا و هۆڵەنـدا کلێـشە بـۆ چـاپ دروسـت دەکـران. بەکۆڵین لەسەر دار، دەیانتوانی وێنەی پیاوچاکان و پادشاکان، بەهەمان پرینـسیپی چـینییەکان دانەی زۆری لێ زیاد بکەن.

ئەوان هەندێك جار نووسینیشیان لەگەڵ نیگارەکان چاپ دەکرد. جگە لە چاپکردنی وێنـەی پیاوە ئاینییەکان، زۆرجـار کـارتی قوماریـشیان بەهـەمان شـێوە چـاپ دەکـرد. لەسـەر دارە

1. Беспалова А. Г., Корнилов Е. А., Короченский А. П., Лучинский Ю. В., Станъко А. И.История Мировои Журналистики. М., 2003- С.9

٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل.٩.

هەڵكۆڵدراوەكە مەرەكەبیان ڕوو دەكرد و كاغەزیان لەسەر مەرەكەبەكە دادەنا و بە تەختەیەك یان شتێكی تر پاڵەپەستۆیان دەكردە سەر كاغەزەكە و شتی مەبەست چاپ دەكرا. بەم شێوەیە هەموو نووسینەكە چاپ دەكرا و وەك كتێب بەرهەم دەهێنرا.

ئەو ئەدەبەی بەشێوەی سەرەوە بڵاو دەكرایەوە بریتی بوو لەچاپكردنی ڕۆژ ژمێری، ڕێزمان...هتد.

چاپكردنی كتێبی ئەو كاتە نەدەخرایە قالبی هونەری كتێب چاپكردن.

ماوەیەكی زۆر لەنێوان زانای هۆڵەندی لاورێنس كۆستەر Laurens Coster لەگەڵ زانای ئەڵمانی یوهان گوتنبێرگ Johann Gutenberg مشتومڕ هەبوو، كە كامەیان لەپێشدا هونەری چاپیان دۆزیەوە. بەڵام ئێستا ئاشكرایە كە یوهان گوتنبێرگ بۆ یەكەم جار بەپیتی جیا جیا توانی كتێب چاپ بكات.

زۆرجار ناوی ئەو كتێبانەی كە پێش ساڵی ١٥٠١ چاپكراون بەناوی یۆنانی بانگ دەكرێن و پێیان دەگوترێ **پالیۆتیپەر** Paleotyper بە زمانی كوردی دەكاتە (كۆن).

هانس سالاندەر Hans Sallander دەڵێ هەرچەندە جیاوازی نێوان كتێبەكانی كەلە ساڵی ١٤٩٩ چاپكراون و ئەوانەی كە لەساڵی ١٥٠١ چاپكراون ئەوەندە زۆر نییە، لەگەڵ ئەوەش ساڵی ١٥٠١ وەك سنوورێكی باش بۆ هونەری چاپكردن دەناسرێت[1].

پاش ساڵی ١٥٠٠چاپخانەكان زیاتر پێویستییان بەوە نەدەكرد كە خۆیان پیت دروست بكەن بەڵكو كارگەی تایبەت بۆ دروستكردنی پیت دامەزرابوون. ئەو كارگانە تیپیان بە چاپخانەكان دەفرۆشت. لە چاپخانەكاندا لە سەرەتادا كتێبە ئاینییەكان چاپ دەكران و تاڕادەیەك ئەدەب و بابەتەكانی تر پشتگوێ خرابوون.

ئەگەر تا دۆزینەوەی هونەری چاپ لە ئەوروپا و لەلایەن گۆتنبێرگ تەنیا ٣٠ هەزار دانە كتێب هەبوون، بەماوەی ٥٠ ساڵ ژمارەیان گەیشتە ٩ ملیۆن كتێب[2].

لە ساڵی ١٥٠٠ بۆ یەكەم جار كتێب بەمانای ئەمڕۆی كتێب چاپكرا. ئەوەش وەك: نووسینی ناوی نووسەر، ناوی كتێب، شوێنی چاپكردن، دەزگای بڵاوكردنەوە، كاتی چاپ و ساڵی چاپ...هتد.

1. Hans Sallander, Medeltidens Boktryckerihistoria. Uppsala، 1959.- p.11
2. Беспалова А. Г., Корнилов Е. А., Короченский А. П., Лучинский Ю. В., Станько А. И. История Мировои Журналистики. М., 2003- С.11.



لە ساڵی ١٥٠١ یش بۆ یەكەم جار جگە لە چاپكردن بە تیپی ڕاست، پیتی خوار (لار) یش بۆ چاپكردن بەكار هێنراوە.

لەڕاستیدا ئامێرەكانی چاپی ساڵەكانی ١٤٠٠ "سەدەی پانزە"جیاوازییەكی ئەوەندە زۆریان لەگەڵ ئامێرەكانی ساڵی ١٨٠٠ "سەدەی نۆزدە" نەبوو.

لەو كاتەی گوتنبێرگ هونەری چاپی دۆزییەوە و شوێنی بۆ داڕشتنی پیت دەكۆڵی، هیچ یاسایەك نەبوو پەیڕەوی بكا دەربارەی ئەوەی كە پیتەكان چۆن دروست بكا و چۆنیان داڕێژێ؟ بۆیە تا بۆی كرابا هەوڵی دەدا پیتەكانی ئەو لەشێوەی دەستخەتی سەردەمی خۆی كردبا.

یەك لە بەناوبانگترین كتێب كە لە پەنجا ساڵی یەكەمی دۆزینەوەی هونەری چاپ، چاپكرا، ڕۆمانی Hypnerotomachia Poliphili كە لەلایەن Francesco Colonnas نووسرابوو، ساڵی ١٤٩٩ لە شاری ڤینێسیای ئیتالیا لە چاپخانەی Aldus چاپكرا. ١٦٨ كلێشەی دار ڕۆمانەكەیان ڕازاندبۆوە. بەدرێژایی چەندین سەدە، چاپخانەكان لەكاتی چاپكردن، سوودیان لە دیزاینی كتێبی ناوبراو وەرگرت و تا ئەمڕۆش جوانی خۆی لەدەست نەداوە. **(سەیری وێنەی ژمارە ٦ -٧ -٨ بكە).**

لە ساڵی ١٤٥٢-١٤٥٥ گۆتنبێرگ ئینجیلێك، كە بەناوی ٤٢ خەت بەناوبانگە چاپكرد. ئەو كتێبەش نموونەی بەرزی هونەری چاپی ئەوكاتەی پێوە دیارە.

چاپكردن بەڕەنگی جیا جیا بۆ چاپچی دەبووە دوو كار (ئیشەكەی بۆ دەبووە دەبل) هەر جارێك ڕەنگێكی چاپ دەكرد، دەبوایە جاری دووەمیش هەمان لاپەڕە بەڕەنگێكی تر چاپ بكات و ئامێرەكەش لە مەرەكەبی پێشتر پاك بكاتەوە و بشوا.

لە ساڵی ١٤٦٣ بۆ یەكەم جار سەر گوتارێك تایتڵ Titel كە بەگەورە لەلایەن (فوست Fust لەگەڵ شێفەر Schöffer لە شاری ماینز Mainz چاپكرا. لەو كتێبە ناوی كتێبەكە بەگەورەیی چاپكرایە. كە پیتی گەورەتر لە نووسینی ناو كتێبەكە بەكارهێنرا، مەبەست ئەوە بوو كە چاو خێراتر پیتە گەورەكە ببینێ و لە ناوەڕۆكی نووسینەكەی ئاگادار بكاتەوە. نووسەرانی ئەو كتێبە نەیاندەزانی كە شۆڕشێكیان لە هونەری چاپكردن بەرپاكردووە و هەرگیز بایەخی خۆی لە ڕاگەیاندن لە دەست نادات.

هەر لەو سەردەمەوە هەندێك چاپخانە و نووسەران گلەییان دەكرد كە گوایە خەڵك كتێبە چاپكراوەكان ناكڕن بۆیە دەستیان بە چاپكردنی ڕێكلام بۆ كڕینی كتێب كرد.




POLIPHILO QVIVI NARRA, CHE GLI PARVE ANCORA DI DORMIRE, ET ALTRONDE IN SOMNO RITROVARSE IN VNA CONVALLE, LAQVALE NEL FINE ERA SERATA DE VNA MIRABILE CLAVSVRA CVM VNA PORTENTOSA PYRAMIDE, DE ADMIRATIONE DIGNA, ET VNO EXCELSO OBELISCO DE SOPRA. LAQVALE CVM DILIGENTIA ET PIACERE SVBTILMENTE LA CONSIDEROE.

LA SPAVENTEVOLE SILVA, ET CONSTIpato Nemore euaſo, & gli primi altri lochi per el dolce ſomno che ſe hauea per le feſſe & proſternate mẽbre diffuſo relicti, me ritrouai di nouo in uno piu delectabile ſito aſſai piu che el præcedente. El quale non era de monti horridi, & crepidinoſe rupe intorniato, ne falcato di ſtrumoſi iugi. Ma compoſitamente de grate montagniole di non tropo altecia. Siluoſe di giouani quercioli, di roburi, fraxini & Carpini, & di frondoſi Eſculi, & Ilice, & di teneri Coryli, & di Alni, & di Tilie, & di Opio, & de infructuoſi Oleaſtri, diſpoſiti ſecondo laſpecto de gli arboriferi Colli. Et giu al piano erano grate ſiluule di altri ſiluatici

**<u>وێنەی ژمارە (٦)</u>**

**کتێبی نووسەر Francesco Colonnas ڕۆمانی Hypnerotomachia Poliphili لە ڤینێسیا لە چاپخانەی Aldus لە ساڵی ١٤٩٩ چاپکرایە.**



ساڵی١٥٠٠ بۆ یەکەم جار کتێبێك (بەمانای ئەمڕۆی کتێب) لەلایەن یوهان گلۆگۆڤیسێنسیس Johannes Glogoviensis چاپکرا. لەو کتێبە ئەم زانیارییانــەی خــوارەوە: نــاوی کتێــب، ناوی نووسەر، دەزگای چاپ، چاپخانە، کارتی چاپ، ساڵی چــاپ، هــەبوون. **(ســەیری وێنــەی ژمارە ٩ بکە).**

## ژمارە دانان لەسەر لاپەڕەی کتێب

بۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٤٧٢ لە لایەن یوهان کۆێلهۆف Johann Koelhoff لە شــاری کۆڵن Köln کتێب چاپکراو لەسەر لاپەڕەکانی ئیمزا دەکرا، مەبەست لــە ئیمــزا ئــەوەبوو کــە لەسەر هەر لاپەڕەیەك پیتێکیان دەنووسی، پێش ئەوە بەدەست لەسەر لاپەڕەکانیان دەنووســی، چاپکردنیش لەسەر لاپەڕە، بووە هەواڵێکی گرنگ چاپخانەکانی تریش زوو لاساییان کردەوە[1].

لە ئیتالیا لەوەش دوورتر ڕۆیشتن. ئــەوان دەســتیان کــرد بــەپیت دانــان لەســەر لاپــەڕەکان لەجیاتی ژمارە چاپکردن. پیتەکان قەبارەیان بچووکتر بوو. کە پیتەکان تەواو دەبــوون، هــەموو ئەلف و بێکەیان سەرلەنوێ بەکاردەهێناوە بەڵام بەقەبارەی گەورەتر.

بۆ ژمارە دانان وەك گوتمان لەلایەن تێرهۆێرنێن Therhoernen بوو. ئەو لە ساڵی ١٤٧٠ کتێبی چاپکرد، ئەو ژمارەی لە ژێرەوە یان سەرەوەی لاپەڕە چاپ نەدەکرد، بەڵکو لەلای ڕاســت و ناوەڕاستی لاپەڕەکە ژمارەی دادەنا. **(سەیری وێنەی ژمارە ١٠ بکە)**

**یوهان گۆتنبێرگ** لە شاری ماینز لە دەوروبەری ساڵی ١٤٠٠ لە دایك بووە. لە ستراسبۆرگ لە ساڵی١٤٣٠ ناوی لە هەندێك دەکۆمێنتی ئەو کاتە بەرچاو دەکەوێت کە مــافی گەڕانــەوەی بۆ شاری ماینز پێدەدرێت، جاری

1. Hans Sallander, Medeltidens Boktryckerihistoria. Uppsala, 1959.- p.47.



Exercitium
Super omnes tractatus parvorum logicalium Petri hispani. Magistri Johannis Glogoviensis alme florentissimeque universitatis Studii Cracoviensis, maioris Collegii artistarum Collegiati, et ad sanctum Florianum Canonici. ad impensas providi: circumspecti humanissimique viri domini Johannis Haller / Civis cracoviensis virorum doctorum fautoris excellentissimi / optimis atque correctissimis characteribus: per dominum Baccalarium wolfgangum Steckel monacensem / conciuem Lipsensem fauste impressum Anno Jubilei. M.CCCCC.

Cum privilegio Regie desuper descripte ut presentia in detrimentum prefati Johannis Haller nullus cracoviensium imprimere audebit.

**وێنەی ژمارە (٩)**

یەکەم کتێب بەزمانی ئەمڕۆ لە ساڵی ١٥٠٠ لە لایبزگ چاپکرا.





& nature hominum adversa est quam utilibus. viciis ac lasciuienti populo frenum. preest enim eis pavor undique oriens. quippe amare iniquos expedit timere nemo autem tam trux dominus ut non truculentior sit voluptas. prosperitatis comes ac filia. agentibus quoque nil prius quam securitas ac libertas. Qui enim nichil metuit proximus est ruine. Misera plebs malum dominum patitur. Michi crede nullus in misera plebe miserior quam tirannus: Dyonisium tirannum Sicilie contemplare. Ille vir improbus nec indoctus de seipso suaque tirannide quid sentiret populus. apertissime pendentis supra amica verticem gladii cuspide declaravit. nota est historia. Timet quidem plebs tirannum. sed et etiam tirannus plebem. sic reciproco pavore se cruciant. Unde hoc refert: quod miseria plebis apparet lateque tiranni. non tamen minus affligit purpureo velamine tectum vulnus. neque minus gravant auree compedes quam ferree. est et sua ut in sordibus utque in fumo. sic et in laqueariis et splendore miseria. Aurea quidem tiranni vestis extrinsecus quantumque fulgida. obruere illam si posses ardentibus intus aculeis plena est. Ita ergo non impune ut vides serviunt tiranni quantumcumque splendidi. nec inulta plebs premitur. Non intelligens dominus est. Non tot passim essent domini nec tam late furerent si non insanirent ipsi. atque cuique civium pro se carior foret privata res quam publica voluptas quam gloria pecunia quam liber- 138

**وێنەی ژمارە (١٠)**

کتێبێك کە لەلایەن Therhoernen لە ساڵی ١٤٧١ لە Köln چاپکرایە. لاپەڕەی ژمارە ١٣٨ لەلای دەستە ڕاست ژمارەی بۆ دانراوە.

دووەم لە دادگای قەشەکان بەوەی کەلەگەڵ ژنەکەی جیا بۆتەوە ناوی لە دەکومێنتەکان بەرچاو دەکەوێت. ئەوەش لەساڵی ١٤٣٦ بوو. مرۆڤ لەسەر ئەو دادگایە هیچ نازانێت.

چەند ساڵێك دواتر لە دەکۆمێنتەکانی دادگا لەساڵی ١٤٣٩ سەرلەنوێ ناوی لـە هـەمان شـار بەرچاو دەکەوێت و ئەو دادگایەش ئەوە بوو کە لەگەڵ برایان یۆری Jörg، کلاۆس دریتزن Dritzen بوو. ئەو دوو برایە پێش چەند ساڵێك کۆمپانیایـەکی دروسـتکردنی ئاوێنـەیان لەگـەڵ گـۆتنبێرگ دامەزراندبوو. ئەو کۆمپانیایە دەستی بەکار نەکرد. کۆنتراکتێکی "سەنەد" تریان ئیمزا کرد[1].

بـەگوێرەی کـۆنتراکتی دووەم دەبوایـە گـۆتنبێرگ لەهـەمـەموو دۆزینـەوەکانی خـۆی بەشـی شەریکەکانی بدات. بەم شێوەیە گـۆتنبێرگ لـەکۆمپانیا ٢٥٠ زێـر وەردەگرێـت. بـەلاّم پـێش ئەوەی ئەم پارەیە وەربگرێ، ئەوا دریتزن کۆچی دوایی دەکات. بـە گـوێرەی پێکهاتـەکانی دوا جار دەبوایە گۆتنبێرگ ١٠٠ زێر بداتە خێزانی مـردوو، بـەلاّم لەبـەر ئـەوەی دریتـزن ٨٥ زێـر قەرزار بوو، گۆتنبێرگ دەبوایە ١٥ زێر بەخێزانی دریتزن بدات. لە جیاتی ئەو ١٥ زێرە، ئـەوان دەیانەویست لە کۆمپانیای ئەو ببنە هاوبەش، کەچی گۆتنبێرگ بەوە ڕازی نەبوو. کار گەیـشتە دادگا و لەوێ گۆتنبێرگ دەیویست تەنیا ١٥ زێرەکە بداتەوە.

بە گوێرەی قسەی شایەدەکان گـۆتنبێرگ لـە سـتراسـبۆرگ خـەریکی ئامـادەکردنی کتێـب چاپکردن بووە. دروستکردنی ئاوێنە لە راستیدا مەبەست لـە دروسـتکردنی ئاوێنـەی تایبـەتی نەبوو، بەڵکو مۆر بۆ ئاوێنەکان بوو.

لە سـاڵی ١٤٥٧ لـە کتێبـەکانی ئەرشـیڤی دادگـا نووسـراوە کـە گـۆتنبێرگ نـەیتوانیوە قەرزەکانی خۆی بداتەوە و جگە لەوەش، ئەو نەیتوانیوە فایزی ئەو پـارەی کـە لەسـاڵی ١٤٤٢ وەریگرتبوو بداتەوە. قەرزەکەی لەسەر ڕەش نەکراوەتەوە تا ساڵی ١٤٧٤ لەو کاتـە گـوتنبێرگ شەش ساڵ بوو لەژیان نەمابوو. ئەو لە ٣-٢-١٤٦٨ لە شاری خۆی کۆچی دوایی کرد.

کۆنترین چاپی گۆتنبێرگ کە تائێـستا مابێتـەوە، ئـەوا ڕۆژ ژمێـری تورکیـە لەسـاڵی ١٤٥٣ چاپکراوە. ساڵی ١٤٥٣تورکەکان شاری کوستەنتینۆپلیان داگیرکرد. پاپای رۆمـاش بـەیانی جـەنگی دژی تورکـەکان دا. لـەو تەقویمـە گـۆتنبێرگ باسـی داگیرکردنـی شـاری کوستەنتینۆپلی کردووە.

١. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل.٢٧.



دانـەری هونـەری چـاپ و چـاپخانە گـۆتنبێرگ سـاڵی ١٤٥٥ ئینجیلـە ٤٢ خەتەکـەی چاپکرد. ئەوە یەکەمین پەژمۆردەی چاپە لەهـەمـەموو سـەردەمەکان. ئینجیلـی ٤٢ خـەت لـە ٣١٧ لاپەڕە پێکهاتبوو.

گۆتنبێرگ لەساڵی ١٤٥٢ دەستی بەچاپکردنی ئینجیل کردووە سـاڵی ١٤٥٥ یـش تـەواو بوو. ئینجیلی ناوبراو بەتیراژی ١٥٠ دانە چاپکرا. ئێستا ٤٨ دانەی بەتەواوی لەگـەڵ چـەندین لاپەڕەی تەنیا و جیا جیا لەو ئینجیلە ماون.

ئینجیلێکی تر بەناوی ٣٦ خەتی چاپکرا. ئەوەیان لەوەی پێش چاپەکەی جـوانتر و باشـترە. ئینجیلی ٣٦ خەتی ٨٨٤ لاپەڕەیە و هەر لاپەڕەیەکیش لەدوو سـپاڵت (سـتوون) پێکهـاتووە. **(سەیری وێنەی ژمارە ١١ بکە).**

تیپەکانی ئەم ئینجیلە نـوێتر و جـوانترن. لـە ئینجیلـی ٣٦ خـەتی ١٣ ژمـارەی مـاون و پارێزراون. چاپی لەساڵی ١٤٦٠-١٤٦١ تەواو بووە. لەسەر چاپکردنی ئینجیلی دووەم قـسە و باسی زۆر هەیە، بەلاّم هەموویان بۆچوون و بەڵگەیان نییە.

لە سەدەی پانزە شاری ستراسبۆرگ گەورەترین و زۆرترین چاپخانەی لە ئەڵمانیا تێدا بوو.

پێش ئەوەی سەدە تەواو بێت لە شاری ناوبراو ٢٠ چاپخانەی تێدا بوو. بە هۆی پەیدابوونی چاپخانە، زمانەکانیش زیاتر بوونە ستاندارت.

## مێژووی چاپخانە لە ئیتاڵیا

یەکەم دەوڵەت دوای ئەڵمانیا کە هونەری چـاپی تێـدا بلاّوکرایـەوە ئیتالیـا بـوو. ئـەوەش لەوانەیە لەبەر ئەوە بێت کە لەو کاتە ئەدەبی ئیتالیا زۆر بە هێز بوو.

دوو ئـەڵمان بـەناوی کـۆنراد سـڤێینهێیم Conrad Sweynheymو ئارنۆڵـد پـەنارتز Arnold Pannartz کە هەردووکیان لە شاری ماینز لەلای فۆست و شـێفەر کاریـان دەکـرد. لەساڵی ١٤٦٠ لە سۆبیاکۆ Subiaco کە چەند میلێك لە رۆژهەلاّتی رۆم دوور بوو بەیەکـەوە یەکەم چاپخانەیان دامەزراند. یەکەم کاری چاپیان ئەوا رێزمانی دۆناتۆس Donatus بوو، کە تا ئەمڕۆ نموونەی ئەو کتێبە پارێزراوە و ماوە. **(سەیری وێنەی ژمارە ١٢ بکە).**

تا ساڵی ١٤٧١ توانرا ٢٨ کار چاپ بکەن. کۆنراد و ئارنۆڵـد بەیەکـەوە تاسـاڵی ١٤٧٣ کاریان کرد و کۆمپانیای خۆیان بەرێوە دەبـرد. پـەنارتز بەتـەنیا تاسـاڵی ١٤٧٦ کۆمپانیـای

بەڕێوە برد و لە هەمان ساڵیش کۆچی دوایی کرد. وەستا و کرێکارەکانی ئـەڵمانی لـە سـەدەی پانزە رۆڵی زۆر بەرچاویان لە چاپخانەکان و پێشخـستنی هونـەری چـاپ لـە هـەموو ئـەورووپا هەبوو. لەو ٣٨ چاپخانەی کە لە شاری رۆمی ئیتالیا هەبوون، بیست و پێنج ئـەڵمان بـەڕێوەی دەبرد و کاری تێدا دەکرد.

لە شاری ڤینێسیا تا ساڵی ١٥٠١ نزیکەی ١٥٠ بیرۆ "مەکتەبی چاپ" هـەبوو. یەکـەمین چاپچی ئەو شارەش یوهان ڤۆن سپێیەر Speyer Johann von ی ئەڵمانی بوو، کە لە سـاڵی ١٤٦٩ سێ کاری گەورەی چاپکرد، دوو لەو کارانە نامەکانی سیـسێرۆ "Cicero، Marcus Tullius" 106-43 پێش زاین بوو. سیسێرۆ سیاسییەکی گەورەی رۆمـاو نووسـەرێکی بـاش بوو. ئەو وەك گەورەترین و باشترین خوتبەدەر (ئەراتەر) ی رۆما بەناوبانگ بوو. ئـەو شـاعیرو نووسەرێکی باشیش بوو، هەر ئەویش بەزمانی لاتینی فەلسەفەی یۆنانی هێنایە رۆما. لەگـەڵ کتێبێکی پلینیوس بـەناوی Naturalhistoriaی چاپکرد[1]. هـەمان سـاڵ یوهـان لەلایـەن ئەنجومەنی شارەوانییەوە مافی هەموو چاپکراوەکانی شاری ڤینێسیای پێسپێردرا. یوهان ساڵی ١٤٧٠ کۆچی دوایی کرد. کۆنتراکتی مافی چـاپی ڤینێـسیا بـۆ بـرای ڤێنـدێلین Wendelin میراتگری پاش مردنی نوێ نەکرایەوە. لە سەدەی پانزە یەك لە بەناوبانگترین کەس لە هونـەری چاپ، نیکۆلاس جێنسۆن Nicolas Jenson ی فەرەنـسی بـوو. ئـەو لەسـاڵی ١٤٧٤ تیپـی یۆنانیشی هەبوو. لە سـاڵی ١٤٧٠ تـا سـاڵی ١٤٨٠، ١٥٠ کـاری چـاپکرد. جێنـسۆن بـووە دەوڵەمەندترین کەسی شاری ڤینێسیا. زۆربەی ئەو کتێبانـەی ئـەو چـاپی دەکـردن دەربـارەی: ئایین، یاسا، ئەدەبی کلاسیك لەگەڵ هەندێك کاری مێژوو و مێدیسین بوون.

لە ساڵی ١٤٨٠ جۆنسن و یوهان هەردووکیان مردبوون، دوای ئـەوان هێربـۆرت Herbort سەرپەرشتی کاری چاپی لە ڤینێسیا کرد، بەڵام ئەویش ساڵی ١٤٨٤ کۆچـی دوایـی کـرد. تـا کۆتایی سەدە زۆربەی شارەکانی ئیتالیا چاپخانەی تێدامەزرابوو.

---

١. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل. ٦٩.




OGITANTI MIHI SEPENUMERO & memoria uetera repetenti perbeati fuisse.Q. frater illi uideri solent qui in optima.RE.PV: quom & honoribus & rerum gestarum gloria florerent eum uitae cursum tenere potuerunt: ut uel i negotio sine periculo: uel in ocio cum dignitate esse possent: At nunc quid mihi quoque initium requiescendi atque animum aduertendi ad nostra praeclara studia referendi fore iustum et prope ab omnibus concessum arbitrarer: si infinitus forensium rerum labor: et ambitionis occupatio de cursu honorum etiam aetatis flexu constitisset: quam spem cogitationum & consiliorum meorum cum grauis communium temporum: tum uarii nostri casus fefellerunt: Nam qui locus quietis & tranquillitatis plenissimus fore uidebatur: in eo maxime moles molestiarum & turbulentissime tempestates exstitere: Neque uero nobis cupientibus atque exoptantibus fructus ocii datus est: ad eas artis quibus a pueris dediti fuimus celebrandas inter nosque recolendas: Nam prima aetate incidimus in ipsam perturbationem disciplinae ueteris: & consulatu deuenimus in medium rerum omnium certamen atque discrimen: & hoc tempus omne post consulatum obiecimus his fluctibus: qui per nos a communi peste depulsi in nos met ipsos redundarent: Sed tamen in eis uel asperitatibus rerum uel angustiis temporis obsequar studiis nostris: ac quantum mihi uel fraus inimicorum uel causa amicorum: uel res.p. tribuet ocii ad scribendum potissimum conferam: Tibi uero frater neque hortanti deero neque roganti: nam neque auctoritate quisquam apud me plus ualere te potest: neque



**وێنەی ژمارە (١٢)**

بەرهەمێك بەناوی Cicero كە لەلایەن Conrad و Arnold لە سوبیاكۆ لە ساڵی ١٤٦٥ چاپكرایە.

## مێژووی چاپخانە لە فەرەنسا

یەکەم کتێبی چاپکراو لە فەرەنسا لە ساڵی ١٤٧٠ بوو. گرنگترین هۆ کە هونەری چاپخانە ئەوەندە درەنگ گەیشتە فەرەنسا، ئەوەبوو کە ئەو کەسانەی خەریکی نووسین و نووسینەوەی کتێب بەدەست بوون، تەواو بەربەرەکانێی ئەو هونەرە نوێیەیان دەکرد. ئەوان لەو بڕوایەدا بوون کە لە نێوان ئەوان و چاپچییەکان دەبێتە پێشبڕکێ و بەدووریش نازانرا خۆیان لەم هونەرە بیدۆڕێنن. ئەوەش لەبیر نەکەین لەو کاتە لە ئەڵمانیا کتێبی چاپ دەگەیشتە فەرەنسا.

لەسەر داوای یوهان هێینلین Johann Heynlin و گویلاومێ فیچێت Guillaume Fichet پرۆفیسۆری سۆربۆن سێ چاپچی ئەڵمانی بەناوی میکائیل فریبورگەر Michael Friburger، ئولریش گێرینگ Ulrich Gering لەگەڵ مارتین گرانتز Martin Grantz لە سۆربۆن ئامێرەکی چاپیان دامەزراند. لە راستید چاپخانەیەکی مەدەنی بوو کە کاریان بۆ هێینلینس و فیچێت دەکرد.

ئەوان خەرجی چاپیان دەدا. ئەو سێ کەسە توانییان ٢٢ کتێب بەو ئامێرە چاپ بکەن. کتێبەکان پێکهاتبوون لە کتێبی کلاسیك -ریتۆریك- لەگەڵ رێزمان. کتێبەکان تیراژیان کەم بوون زیاتر فیچێت و هێینلین لەناو برادەرانی خۆیان بلاوٚیان دەکردەوە. ساڵی ١٤٧٦ بۆ یەکەم جار کتێب بەزمانی فەرەنسی چاپ کرا. **(سەیری وێنەی ژمارە ١٣ بکە).**

لە نێوان ١٤٩٠- ١٥٠٠ گەی مارچاند Guy Marchand توانی نزیکەی ١٠٠ کتێب بەتێکستی کلاسیکی- ئەدەبی — ئاین — ئەستێرەناس — زمانی فەرەنسی — ئەدەبی جەماوەری چاپ بکات. دووەم شاری فەرەنسا کە هونەری چاپی تێدا بلاوٚکرایەوە شاری لیۆن Lyon بوو. لە ساڵی ١٤٧٣ لەسەر داوای بارتلێمی بویەر Barthelemly Buyer هونەری چاپ گەیشتە شاری لیۆن. بۆیەر لە ماڵی خۆی ئامێری چاپی دامەزراند. بۆیەر کابرایەکی زۆر دەوڵەمەندی سەردەمی خۆی بوو. ئەو داوای لە لی ڕۆی Le Roy بەلجیکی کرد کە کار لەسەر چاپخانەی ئەو بکات. ڕۆی هونەری چاپی لە شاری ڤینێسیا وەرگرتبوو. یەکەم کار کە لەو شارە چاپ کرا، کارێکی لاتینی بوو. ڕۆی تەواو پشتی بەبویەر دەبەست بەلاّم کە بویەر ساڵی١٤٨٣ مرد، چاپخانەکەی تێك نەدرا و لەسەر چاپکردنی کتێب بەردەوام بوو.

چاپخانەی دووەم کە لە هەمان شار دامەزرا، لەلایەن دوو ئەڵمان بە ناوی نیکۆلاوٚس فیلیپی Nicolaus Philippi و مارکۆس ڕێینهارد Markus Reinhard بوو.





oroisons propres et alors fut baille le
dit ciel aux dessusditz . viii . religie-
ulx lesquelz le porterent iusques a
leglise saint denis sur ledit corps
Item apres lenterrement dudit co
rps eut grosse altercation entre ledit
grant escuier et les aultres escuiers
descuirie dudit roy et les religieulx
dudit saint denys pour le poille qui
estoit soubz la dessusdicte figure pour
ce que yceulx escuiers disoient ledit
poille leur appartenir et lesditz reli-
gieulx au contraire et tellement que
ledit poille fut mis en la main de mon
seigneur de dunois et de monseigneur
le chancelier de france et finablement
fut appointe que ledit poille qui e-
stoit de drap dor bien riche demourroit
a ycelle eglise
Item et au millieu de la dessusdi
cte grant messe y eut une predication
que fist maistre thomas de courcelles
docteur en theologie a laquelle avoit
grant peuple present pour ledit office
et les ungs plorans lequel roy fut
intitule le roy charles vii. de ce nom
tresvictorieulx
Item et apres lenterrement dice-
lui roy fut crie dieu ait lame du roy
charles tresvictorieulx comme dessus
est dit-puys apres vive le roy loys
et adonc les huissiers et aultres ser-
gens getterent leurs verges sur la
fosse dicelluy
Item apres toutes ses choses fai-
ctes alla ung chascun diner en la
grant salle de labbe dicelle eglise ou
fut court planiere et ouverte a tous
venans et de ceste heure le diner fait
et graces dictes monseigneur de du-
nois dist a haulte voix que luy et
tous les aultres serviteurs avoient
perdu leur maistre et pourtant que
ung chascun pensast de soy pourveoir
a quoy furent plusieurs moult do-
lens et par especial commencerent
les pages fort a plorer

Cy finist le tiers volume des cro-
niques de france contenant charles . vi .
vii . viii . bien ordonne par tables et
par chappitres Et pareillement les
deux volumes pardevant Fait a paris
en lostel de pasquier bon homme lung
des quatre principaulx libraires de
luniversite de paris ou pend pour en
seigne limage saint christofle le xvi.
iour de ianvier Lan de grace mil .
CCCC . lxxvi .

**وێنەی ژمارە (١٣)**

یەکەم کتێب کە بەزمانی فەرەنسی بەناوی: Chroniques de France بوو.
لە پاریس ساڵی ١٤٧٦ چاپکرا.

چاپخانە لە سەدەی پانزە تەنیا لە دوو شاری فەرەنسا هەبوو، ئەو شارانەش پاریس و لیۆن بوون. شارەکانی تری ئەوکاتەی فەرەنسا یان چاپخانەیان تێدا نەبوو یان ژمارەی زۆر کەم چاپخانەی لێبوو. لە بەشی فەرەنسی سویسرا یەکەم چاپخانە لە ژنێڤ لەساڵی ١٤٧٨ لەلایەن کابرایەکی ئەڵمان بەناوی ئادەم سفێینسچابەر Adam Sfeinschaber دامەزرا.

**مێژووی چاپخانە لە هۆڵەندا**

لە دەوروبەری ساڵی ١٤٧٠ هونەری چاپ گەیشتە هۆڵەندا، لە چ مانگێک یان ساڵێك چاپخانە لەوێ دامەزرایە زۆر دیارنییە، بەڵام بەگوێرەی ئەو بڵاوکراوانەی لە شاری ئوتریخت Utrecht دەرچووین، ئەوا لە دەوروبەری ساڵی ١٤٧٠ هونەری چاپخانە گەیشتۆتە هۆڵەندا. بڵاوکراوە و چاپەکان زیاتر پەیوەندیان بە قوتابخانەو پەروەردە لەگەڵ هەندێك نووسینی کلاسیك هەبوو. ئەوانەی هونەری چاپیان هێنایە هۆڵەندا یوهان ڤۆن پادەربورن Johann von Paderborn و دیرك مارتێنس Dirk Martens بوون. پادەربورن هونەری چاپ لە ئیتاڵیا فێربوو بوو. هەردووکیان بەیەکەوە لە ئەلۆست Alost لە نێوان ١٤٧٣-١٤٧٤ چوار کاریان چاپکرد[1].

لەوێ نزیکەی ٢٠ بەرهەم کە پێکهاتبوون لە بابەتی دین و فەلسەفی بەچاپ گەیاند. لە ساڵی ١٤٧٣ دووەمین مەکتەب لە شاری ئۆترێخت لەلایەن گێرارد لێمپت Gerard Leempt و نیکۆلاس کێتەلاێر Nicolas Ketelaer کرایەوە. هەردووکیان بەیەکەوە بە لای کەم ٢٥ کتێبیان چاپ کرد. بەناوبانگترین شاری هۆڵەندا کە بەرهەمی چاپی زۆر بێ، شاری دیڤێنتەر Deventer بوو. لەوێ نزیکەی ٦٠٠ ئینکونابلەر Inkunabler چاپکران. هەمووش تەنیا لە دوو چاپخانە. ئەوەی بووە هۆی ئەوەی کە ئەو شارە بەرهەمی چاپی زۆر بێ، شوێنی جوگرافی شار بوو. دیڤێنتەر کەوتۆتە سەر رووباری ئیسێل Ijssel ئەوەش دەکاتە ئەوەی کە شاری ناوبراو لەگەڵ شارەکانی ئەڵمانی پەیوەندی و هاتوچۆی ئاویان زۆر بەهێز بێ. لەوێ یەکەم چاپخانە لەلایەن ریچارد پافرایت Richard Paffraet کرایەوە[2]. پافرایت خەڵکی شاری کێڵنی ئەڵمانیا بوو. ئەو لیستە درێژەی کە لەلایەن پافرایت و بە ئیمزای چاپخانەی ئەوەوە

١. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل.١٣٣.

٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل.١٤١.



چاپکران، زۆر درێژ بوون وەك: کتێب بۆ کەنیسە، رێزمان، لۆژیك (مەنتق)، قوتابخانە، فەلسەفە، کتێبەکانی دەستنووسی کەنیسە و زۆری تریش. زۆر بەکەمی پافرایت کتێبی بەزمانی هۆڵەندی چاپ دەکرد. لەوانە چوار بەرهەم کە ساڵی لەسەر نەنووسرایە پێکهاتبوون لە کۆکردنەوەی فەرهەنگ بەزمانی هۆڵەندی، لاتینی بەناوی گێمولا ڤۆکابولارۆم Gemmula Vocabularum کە لە ساڵەکانی ١٤٨٩ – ١٤٩٥ – ١٤٩٧ – ١٤٩٨ چاپکران.

یەك لەوانەی ناوبانگی زۆرەو رۆڵی زۆر بەر فراوانی لە مێژووی چاپخانەی هۆڵەندا بینیوە ئەوا گێرارد لییۆ Gerard Leeu بوو. ئەو جگە لەوەی کتێبی زۆری بەچاپ گەیاند، هونەری چاپیشی زۆر چاك بوو.

ئەو لەساڵی ١٤٧٧ چاپخانەیەکی لە شاری خۆی گۆودا Gouda دانا و تا ساڵی ١٤٨٤ هەر لەوێ مایەوە، دواتر چووە شاری ئەنتوێرپێن Antwerpen و لێرەش بووە باشترین چاپچی ئەو شارە. ساڵی ١٤٩٣ نزیکەی ١٥٠ کاری بەچاپ گەیاند. ئەو کتێبانە پێکهاتبوون لە کتێبی دین، کتێبی مەکتەب، کتێبی دوعا و نوێژ، فەلسەفە، تێکستی کلاسیکی....هتد.

یەك لەو شارانەی کە رۆڵی دیاریان لە مێژووی چاپخانەی ئەوروپا هەبوو، شاری هۆڵەندی لێیدن Leiden بوو. ئەو شارە تا ناوەڕاستی سەدەی ١٦ رۆڵی چاکی هەبوو لە چاپکردنی کتێب. لێرە تەنها چوار چاپخانە هەبوو. هێنریسۆس هێینریسی Heynricus Heynrici لە ساڵی ١٤٨٣-١٤٨٤ شەش کتێبی بە چاپ گەیاند، یەك لەوانە بەناوی کرۆنیکای هۆڵەندا بوو.

**مێژووی چاپخانە لە هەنگاریا**

هونەری چاپ لە سەردەمی پادشا ماتهییاس کۆرڤینۆس Matthias Corvinus گەیشتە هەنگاریا.

سکرتێری پادشای ناوبراو لادیسلاوس کارای Ladislaus Karai لە سەردانەکەی بۆ رۆما دۆستایەتی لەگەڵ ئەندریاس هێس Andreas Hess ی ئەڵمانی پەیدا دەکا. ئەو لە چاپخانەی پانارتز و سوییێنهێیمس Sweynheyms و Pannartz کاری دەکرد. کارای هێسی دەعوەتی بوودا Buda کرد و لەوێ چاپخانەیەکی دامەزراند. ئەو لە ساڵی ١٤٧١ گەیشتە پایتەختی هەنگاریا. پاش ماندووبوونی زۆر لە ١٤٧٣\٦\٥ توانی یەکەم کتێب چاپ بکات، ئەو کتێبە بە ناوی کرۆنیکا هۆنگارۆروم Chronica Hungarorum بوو. **(سەیری وێنەی ژمارە ١٤ بکە).**


Egestis igr̄ hunorū natalibus prelijs felicibus& sinistris:
quotiensq eorum loca immutauerūt.uidendum nunc est
quo tempore in pannoniam redierunt iterato.quiq redeuntiū
fuerūt capitanei.quantus quisq numerus armatoꝝ in exercitu
fuit:apponere in presenti opusculo dignum duxi.

Hec secunda pars coronice est de secundo ingressu
hungaroꝝ in pannoniam.& de uita & morte regū
eorundem in dicto regno hinc inde successorum.

Orro Eleud filius Vgek ex filia Ennodbila in
magor genuit filium qui nominatur Almus ab
euentu.qa matri eius in somnio innotuerat auis
quasi in forma austuris ueniens dū eēt grauida.
& q de utero eius egrederet̄ torrens:ac in terra
non sua multiplicaretur.ideoq fatatū fuit:q de lumbis
eius gloriosi reges ppagarent̄.qa uero somniū in lingua
nr̄a dicit̄ alm.& illius ortus per somniū fuit pnosticatus
ideo ipse uocatus est Almus.qui fuit Eleud.qui fuit Vgek.qui
fuit Ed.qui fuit Chaba.qui fuit Atile.qui fuit Bendekur.q fuit
Turda.qui fuit Scerreyn.qui fuit Ethei.q fuit Opus.qui fuit
Cadicha.qui fuit Berend.q fuit Zulta.qui fuit Bulchu.qui fuit
Bokg q fuit Zambur.q fuit Zamur.q fuit Leel.q fuit Leuite
qui fuit Kulche.qui fuit Orrpud.q fuit Miske.q fuit Mike.q
fuit Beztur.q fuit Budli.qui fuit Chanad.q fuit Buken.qui fuit
Bodofart.q fuit Farkas.qui fuit Othmar.qui fuit Cadar.qui
fuit Beler.qui fuit Kear.q fuit Keue.q fuit Keled.q fuit Darra
qui fuit Bor.q fuit Hunor.q fuit Nemroth.qui fuit Thara.qui
fuit Iaphet.q fuit Noe.Almus aūt genuit Arpad.Arpad ge-
nuit Zoltan.Zoltan genuit Toxun.¶ Imperante igitur Ottone
Cesare de saxonia oriūdo:in italia & germania.in fracia Lotarii
regis filio Lodouico.ac Antonio Duro filio Theodori¶ Anno
octingentesimooctuagesimooctauo ab incarnatione Ihesu xp̄i

**وێنەی ژمارە (١٤)**

یەکەم کتێب لە هەنگاریا بەناوی Chronica Hungarorum لە بودا
لەلایەن Andreas Hess ساڵی ١٤٧٣ چاپکرا.



کرۆنیکا هۆنگارۆروم تەنیا ٧٠ لاپەڕە بوو، بەڵام هونەری بەرزی چاپی پێوە دیاربوو. کتێبێکی تریشی چاپکردووە و دوای ئەوە ژیانی هێس دیار نییە چی بەسەر هاتووە. ساڵەکانی ١٤٧٧-١٤٨٠ چاپخانەیەکی تریش هاتۆتە هەنگاریا. ئەم چاپخانەیە لە چ شوێنێکی هەنگاریا بووە، زۆر ئاشکرا نییە. مرۆڤ نازانێ ناوی چاپچییەکەش چی بووە.

چەند بەرهەمێکی تر لە هەنگاریا چاپکران. لە ناو ئەو سنوورەی کە ئەمڕۆ پێی دەڵێن هەنگاریا تا ماوەیەکی زۆر لە سەدەی شانزە چالاکی چاپخانەکان نەما.

## مێژووی چاپخانە لە پۆڵۆنیا

یەکەم چاپخانەی پۆڵۆنی لە شاری کراکۆڤ Krakow بوو. ئەو چاپخانەیە لەساڵی ١٤٧٤ یان ساڵێك زووتر دامەزرایە. لە ساڵی ١٤٧٣ئەلمەناکەیەکی (تەقویم) یەك لاپەڕەیی بەلاتینی چاپکراوە. هیچ لەو چوار کارەی کە لە چاپخانەی کراکۆڤ چاپکران ناوی چاپچییان بەسەرەوە نییە. لە ساڵی ١٤٧٦ ناوی کاسپەر دێ باڤاریە Caspar de Bavaria وەك چاپچی دێت. یەك لەوانەی رۆڵی باشی لە مێژووی چاپخانەی پۆڵۆنی گێڕا سێباڵد فێیل Sebald Feiel ی ئەڵمانی بوو[1]. هەر ئەویش لە کراکۆڤ ساڵی ١٤٩٠ بۆ یەکەم جار پیتی کریلی بۆ چاپ بەکار هێنا. ئەو پیتانە کە پێشتر، بۆ ئەرتەدۆکسی یۆنانی بەکاریان دەهێنا. بیرۆیەك بەناوی فێیل Feiel لە نێوان ١٤٨٥ — ١٤٩٠ دامەزرایە تا کتێب بۆ کەنیسەی سلاڤی چاپ بکا. ئەوەش وەك دیارە چاپخانە کاری زۆری ویستووە. فێیل توانی چوار تا پێنج کتێب بۆ کەنیسەکانی ئۆکراینی چاپ بکا. دوو لەوانە ساڵی ١٤٩١ یان لەسەر نووسراوە[2]. (**سەیری وێنەی ژمارە ١٥ بکە**).

---

١. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل.١٥١.

٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل.١٥٢.



**وێنەی ژمارە (١٥)**

یەکەم کتێب کە بەپیتی کریلی چاپکرابێت، لەلایەن Sebald Feiel بوو.
ئەم کتێبە لەکراکۆڤ ساڵی ١٤٩١ چاپکرا.



کتێبەکانی ئەو بەرەنگی سوور و رەش چاپکراین و بەهـەمان دەسـتخەتی ئـەو کاتـەی زمـانی بولگاری. ساڵی ١٥٠٠ سێیەم چاپخانە لە کراکـۆڤ دامـەزرا. ئـەویش لەلایـەن یۆهـان هاڵـەر Johann Hallerی ئەڵمانی بوو.

### مێژووی چاپخانە لە چیك و سلۆڤاکیا

دەوروبەری ساڵی١٤٧٦ لە شـاری پیلـسێن Pilsen ی چیکـسلۆڤاکیا یەکـەم چـاپخانە دامەزرا. لە هەمان چاپخانە کۆنترین کتێبی ئەو کاتەی چیکی، بەزمانی چیکی چاپکرا. ئەو کتێبـە کتێبـی وەرگێـڕدراوی گۆیـدۆ دیٚ کۆلۆمنـاس Guido de Columnas بـوو. لەلاپەڕەکانی کۆتایی ئەو کتێبە ساڵی ١٤٦٨ نووسرایە. ئەوان زۆر شانازی بەوە دەکـەن کـە هونەری چاپی گۆتنبێرگ لە کاتێکی وا زوو گەیشتۆتە بێهمێن Böhmen، ئەو مێژووەی کە لەسەر کتێبەکە یانی١٤٦٨ بەبیٚ گومان مێژووی گەیشتنی کتێبەکەیە چاپەکەش وەك گوتمان ساڵی ١٤٧٦بوو. تا ساڵی ١٤٩٨ پێنج ناوی تری بیرۆی چـاپ ئاشـکران. **(سـەیری وێنـەی ژمارە ١٦ بکە).**

هەر چاپخانەو شێوەی خەتی (فۆنتی) جیای بەکارهێناوە، لەو پێنج کتێبە سێی بەلاتینی و دووش کە ئینجیلە نوورە بەزمانی چـیکین. یـەك لەوانـە سـاڵی ١٤٧٥ ی لەسـەر نووسـرایە و ئـەوەی تـریش هـیچ مێـژووی چـاپکردنی لەسـەر نییـە. بـەڵام لـەو بڕوایـەدان پـێش ١٤٨٧ چاپکرابێت. دووەم بەناوی ئینجیلی دلاباس Dlabac بەناوبانگـە. یەکـەم چاپـچی کـە نـاوی زانرابێت و گەیشتە پیلسێن نیکۆلاس بەکالەر Nicolaus Bakalar بـوو. ئـەو لـە زانکـۆی کراکاو Krakau دەیخوێند و هونەری چاپ لە نورنبێرگ Nurnberg فێر بـوو بـوو[1]. یەکـەم کاری چاپی لەساڵی ١٤٩٨ بوو. ئەوەی تا ئێستا ئاشکرایە نۆ بەرهەم لای ئەو چاپکراون.

یەك لەوانە باس لە وڵاتی پیرۆز دەکات و دواتریش باس لە ئادەم و حەوا دەکات.

١. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل.١٥٣.



Nikžkoli dawne wiecy no
winy dašdy zapadagi. Na
ssak nekteri wiecy dawne daw
no gsu pominuly. Kterezto
swu welikosti dwostoyny gsu
wzdy ziwucie pamieti. Ze
ani gich wetchost slepym ohey
zemim mocz zahladiti. Ale
minuleho czasu wetcha leta
vsnulu milczedliwosti zawzies
ti Neb trwagi wnich dziewr
dalych wiecy welebnosti vsz
tawna zpominame. kdyzto przedkow kupotomnim czeg
bywa wiernym pismem poslana. Ale dawnych o kla
dacziow wierna popsanie kterezto swym zachowanim
minule wiecy iakozto przitomne zrzeymie okazugi
Almuzow statecznych kterezto dluhy swieta wiek
dawno skrze smrt pohltil. bedliwym knih czitanim zi
we obrazy duchom nassim oznamugi. Protoz. Tro
ianskeho Miesta zrussenie nenie hodne by ktereho dlu
heho czasu wieku wetchosti bylo zahlazeno Nez aby
vstawicznym zpominanim kwetlo namysli lidske. Ale
mnohych pisarzow wsla wiernym pismem gest popsala
Mnozy take o kladagi teto przihody stalu prawdu
obyczegem herczowym wuzliczna podobenstwie gsu
przetrwali. Take ze gsu o hledany neprawdy. Ale
wymysslene basnie sepsawsse. Wezyminzto za swych

**وێنەی ژمارە (١٦)**

کتێبی Kronika Trojanska،Guido de Columna دەوروبەری ساڵی ١٤٧٦ لە Pilsen چاپکرایە.



یەکەم کتێب کەلە پایتەخت "پراگ" مێژووی لەسەر بێت ئەوا لە ساڵی ١٤٨٧ بوو. چاپچی بەناوی یۆهان ڤۆن هۆهێنماوس Johann von Hohenmauth کە لە ساڵی ١٤٨٢ کتێبی چاپ کردووە، ئەوانە بەڕەنگی ڕەش و سوور چاپکرابوون. ١١ یان ١٢ کتێب لە چاپخانەی ئەو چاپکراون. چاپە کۆنەکانی ئەو ئینجیلی یەکەمی چیکی بوو، کە لە ساڵی ١٤٨٨ چاپکرایەو ژمارەی لاپەڕەکانی گەیشتە ٦١٠ لاپەڕە. هەمان ساڵ کتێبی مارتیمیانی Martimaiani کە دەکاتە کرۆنیکای قەیسەری ڕۆم چاپکرا. ئەو کتێبە لەلایەن یاکوبۆس دێ ڤەراگینێس Jacobus de Voragines وەرگێردرابووە سەر زمانی چیکی. لە باشووری ڕۆژهەڵاتی بێهمن لە ڤینتەربێرگ Winterberg، یوهان ئەلاکراو Johann Alakrow ی ئەڵمانی ساڵی ١٤٨٤ توانی دوو کتێب چاپ بکات، ئەو لە ڕاستیدا پێشتر وەك چاپچی لە پاساو Passau کاری دەکرد. چاپی دووەمی ئینجیل لە شاری کوتێنبێرگ Kuttenberg لەلایەن مارتین ز تیشینۆڤە Martin z Tisniova ساڵی ١٤٨٩ چاپکرایە، ئەو بە ١١٧ وێنەی جوان کە لە کلێشەی لە دار دروستکرابوون ڕازاوەتەوە. زۆر کەس لەو بڕوایەدان کە ئەو کلێشانە لە ئەڵمانیا ئامادەکراون[1].

## چاپخانە لە مۆنتینێگرۆ

سەرکردەی مۆنتینێگرۆ ئیڤان کرنۆژێڤیچ Ivan Crnojevic ساڵی ١٤٨٣ لە شاری ڤینێسیا بوو. ئەو هەمان ساڵ کتێبێکی لەوێ چاپکرد. هەر ئەوساڵ ئیڤان ئامێرێکی چاپی لەوێ بۆ وڵاتی خۆی بردەوە. ئەو لەو کاتە کۆشکی لە ئۆبۆد Obod بوو. شاری ئۆبۆد لەژێر دەسەڵاتی تورکان دابوو. ئیڤان کرنۆژێڤیچ کەنیسەیەکی لە سێتینیە Cetinje دروستکرد و چاپخانەکەشی گواستەوە بۆ ئەوێ. ئیڤان لە سێتینیە لە کانونی دووی ساڵی ١٤٩٤ یەکەم کتێبی بە زمانی سێربی کە لە گۆرانی پێکهاتبوو چاپ کرد. چاپچییەکە کابرایەکی قەشە بوو بە ناوی ماکاریە Makarije ئەو هونەری چاپخانە لە ڤینێسیا فێر بوو بوو. مەکاریا لە کتێبی ناوبراو دەنووسێ کە هەشت کەس لەچاپکردن یارمەتییان داوە. **(سەیری وێنەی ژمارە ١٧بکە).**

---

١. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل.١٥٥.

یەکەم کتێبی چاپکراوی مۆنتینێگرۆ چاپێکی زۆر جوانە و هونەری دەوڵەمەندی چاپی پێوەدیارە. ئەو کتێبە بەڕەنگی سوور و ڕەش، بە تیپی کریلی چاپکرایە.

ساڵی ١٤٩٤ — ١٥٠٨ چاپخانەیەك لە سێنج Senj لەسەر دەریای کراواتیا دامەزرا. ئەوەش لەژێر چاودێری بلاز بارۆمیك Blaz Baromic بوو[1]. ئەوەی تائێستا ئاشکرایە دوو کتێب لێرە بەزمانی کنیسەی سلاڤیانی کۆن کە لە٧-٨-١٤٩٤چاپکرایە. ئەو دوو کەسەی یارمەتیان داوە لە چاپکردنی دوو کتێبەکە سیلڤێستەر بێدریسیس Sylvester Bedricic و گاسپەر تورچیسی Gaspar Turcic بوون. کتێبی دووەم کتێبێکی وەرگێڕدراوە لەلاتینی بە ناوی سپۆڤید Spovid، کتێبی ناوبرای ٢٥-٤-١٤٩٦ لە چاپ تەواو بووە.

### مێژووی چاپخانە لە ئیسپانیا

چەند شارێك لە ئیسپانیا مشتومڕیان بوو لەسەر ئەوەی کە یەکەم جار چاپخانە لە شارەکەی ئەوان دامەزرایە. بەڵام دەوروبەری ١٨٣٠ لە یەك لە کتێبخانەکانی کەنیسە کتێبێکی بچووك لەسەر ڕێزمانی قوتابخانە دۆزرایەوە. لەو کتێبە بچووکە نووسرابوو کە لە٧-١٠-١٤٦٨ لە شاری بەرشەلۆنە لەلایەن یۆهان گێرلینك Johann Gherlinc چاپکرایە. گفتوگۆ لەسەر کتێبی ناوبراو هەبوو. هەندێك بڕوایان نەدەکرد کە ئەو مێژووەی لەسەر نامیلکەکە چاپکرایە ڕاستە. ئەوەش لەبەر ئەوەی تا ئێستا ئەو دەکومێنتانەی دۆزراونەتەوە، لەهیچیان نەنووسرایە کە هونەری چاپ پێش ١٤٨٩ گەیشتبێتە شاری بەرشەلۆنە. بۆیە ئەوان زۆر لەو بڕوایەدان لەبری نووسینی ساڵی ١٤٨٨، بەهەڵە ساڵی ١٤٦٨ نووسرایە.

ئەوەش بەگوێرەی قسەی ئەوان دەکاتە هەڵەی چاپی. ماوەیەکی زۆر ئیسپانییەکان لەو بڕوایە دابوون کە شاری ڤالێنسیا Valencia یەکەم چاپخانەی ساڵی ١٤٧٤ تێدا دامەزراوە. پێش چەند ساڵێك لە لایەن زانای ئیسپانی کۆنراد هایبلەر Konrad Haebler کۆنتراکتێکی چاپ بەزمانی کەستیلی چاپکراوە دۆزراوەتەوە. مێژووی ئەو دەکۆمێنتە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٤٧٣. ناوی چاپخانەو چاپچی لەم دەکۆمێنتە دیار نییە. دەڵێن شوێنی چاپ شاری سێگۆڤیا Segovia یە. لەوێ نوێنەری پاپا لەگەڵ هێنریکی چوارەمی کاستێلیا نامەی هەڵگیرسانی

١. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل.١٥٧.



شەڕ دژی تورکانیان ئیمزا کردووە. ئەو نامەیە زۆرتر لەونامەیە دەچێت کە لە کۆلن Köln بڵاوکرایەوە. لە هەمان شار نامەیەکی چاپکراو کە ئەنجامی کۆبوونەوەی کەنیسە بوو، چاپکراوە. مێژووی ئەو چاپە دەگەڕێتەوە مانگی شەش ساڵی ١٤٧٢. ئەوەش لە کەنیسەی سێگۆڤیاس بوو.

لە ڤالێنسیا چەندین چاپخانەی لێدامەزرا و چەندین کەس کاری تێدا دەکرد. یەك لەوانە کە چارەنووسی بەتراگیدی کۆتایی هات ناوی فێرناندز Fernandez بوو. ئەویش لە دوای کۆچی پاڵمارت. پاڵمارت Palmart ساڵی ١٤٩٤ مرد. ناوی فیرناندز یەك چاپی لە ئینجیلی ئەنتۆنیۆس فلۆرەنتینۆس Antoninus Florentinus Confessionale کە لە ساڵی ١٤٧٧ چاپکرا دێتن. ئەو لە شاری ڤالێنسیا Valencia لە ساڵی ١٤٨٠ ڕادەکات و ساڵی ١٤٨٣ بە تۆمەتی ئەوەی کە پیتی عیبری بۆ چاپخانەیەکی جوولەکە هێناوە لە هیجار Hijar حوکمی ئیعدامی بەسەر دەدرێت و بەڕای زۆر کەسیش دواتر حوکمەکەی تەنفیز دەکرێ.

نیکۆلاوس سپیندێلەر Nikolaus Spindeler ی ئەڵمانی ساڵی ١٤٨٩ چاپخانەیەکی لە ڤالێنسیا دامەزراند. لەسەر داواکاری کتێبفرۆش هانس ریکس Hans Rix کتێبێکی بچووکی لویس ئەلکانیز Luis Alcaniz ی چاپکرد. سپیندێلەر کۆنترین ڕۆمانی ئیسپانی بەناوی ڕۆمانی سوارچاك چاپکرد. لەنێوان ١٤٩٣ — ١٤٩٥ دوو ئەڵمانی تر بەناوی لیۆنهارد هوتز Leonhard Hutz و پێتەر هاگنباخ Peter Hagenbach چەند کتێبێکیان لە شاری ڤالێنسیا چاپکرد. یەکەمین بەرهەمی ئەو دوو ئەڵمانە بەناوی فینۆلارس ئیستۆریا دێ لا پاسیۆ Fenollars Istoria de la Passio کە مێژووی ١١-١-١٤٩٣ لەسەر نووسرایە.

لە زاراگۆزە Zaragoza یەکەم کتێب بەناوی گوایدۆ دێ مۆنتێ ڕۆچێنس مانیپولوس کوراتۆریۆم Guido de Monte Rochens Manipulus Curatorum مێژووی ١٥-١٠-١٤٧٥ لەسەر چاپکرایە. ئەو کتێبە ماتهاوێس ڤۆن فلاندێرن Matthaeus von Flandern بەچاپکردنی هەڵسا[1].

شاری بەرشلۆنە نێوی وەك چوارەمین شاری ئیسپانیا دێت کە هونەری چاپی تێدا سەری هەڵداوە. لێرە یۆهان ڤۆن سالسبورگ Johann von Salzburg لەگەڵ پاول هورروس Paul

١. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل.١٦٢.

Nicolaus لـە کۆتـایی سـاڵی ١٤٧٥ کتـێبی نیکـۆلاّوس پێرۆتـوس ڕودیمێنتـا Hurus
Perottus Rudimenta کە ڕێزمان بوو چاپیان کرد. **(سەیری وێنەی ژمارە ١٨ بکە).**




Capitulo.xv.del fijo del rey: τ de sus compañeros. E reza se dela diuina sentencia: ala qual ninguno puede huyr.

Emarauilla me ha plazido saber/dixo el rey a Sendebar: a quē deue el rey hazer mercedes τ gras. Querria agora mucho saber/del hombre nesçio τ bouo/puesto en alto lugar, τ como la diuina voluntad no se puede escusar. Respuso el philosopho. Assi como no se prueua el hombre bien/si no por la muger. assi el sauio no se conosce: sino por el entendimiēto: el q̄l tiene principal origen de dios. como se prueua enlo q̄ acahescio al fijo d̄l rey cō sus cōpañeros

Compañaron se quatro mācebos dispuestos en vn camino delos quales el vno era fijo de rey: el segūdo hijo de vn mercader: el tercero era muy lindo/hijo de vn cauallero: el quarto era vn caminante/ o correo. τ todos quatro eran tan pobres que ninguno dellos tenia otro/saluo sus vestiduras. τ andando todos por el camino: dixo el fijo del rey. verdaderamente todas las cosas estan ordenadas por la diujna bondad. dixo el fijo del mercader: el entē.

__وێنەی ژمارە (١٨)__

ئەم بەرهەمە بەناوی Exemplario contra los enganos،Johannes de Capua لەلایەن
Paul Hurus لە Zaragoza ساڵی ١٤٩٣ چاپکرایە. هورۆس چەندین نووسەر و وەرگێڕ و
هونەرمەندی لە چاپخانەکەی خۆی کۆکردبۆوە و بەرهەمەکانی ئەوانی چاپ دەکرد. تا ساڵی
١٥٣٧ لە چاپخانەی خۆی لەسەرکار بەردەوام بوو. تەنیا لەنێوان ١٤٩١-١٥٠٠ توانی
نزیکەی پەنجا کتێب چاپ بکات.

ساڵی ١٤٧٧ یەکەم کتێب لە سێڤیلا Sevilla چاپکرا. ئەویش لەلایەن سێ کەسی ئیسپانی بەناوی: ئەنتۆنیۆ مارتینێز Antonio Martinez، ئەلفۆنسۆ دێل پورتۆ Alfonso del Puerto لەگەڵ بارتۆلۆمێ سێگورە Bartolome Segura لە شاری ناوبراو هونەری چاپیان دەکرد. پەیوەندی و هاوکاری هەرسێ ئیسپانییەکە بەیەکەوە درێژەی زۆر نەکێشا. لە ساڵی ١٤٨٠ چەند کتێبێك چاپکراون، کە تەنیا ناوی دوو چاپچی دواوەی تێدایە.

چاپکردنی نۆتەی مۆسیقا لەکارێك بەناوی پرۆسێسیۆناریۆم ئۆردینیس پرایدیکاتۆریۆم Processionarium ordinis Praedicatorum ساڵی ١٤٩٤ بووە. لەنێو کارە مێژووییەکان ئەوا کارێکی فلاڤیۆس یوسفۆس Flavius Josephus کرۆنیکای جولەکە لە ساڵی ١٤٩٢ هاتووە. کتێبێکی تر بەناوی کورتیۆس ڕوفۆس هیستۆریا دێ ئەلێکسەندەری Curtius Rufus Historia de Alexandri ساڵی ١٤٩٦ چاپکرایە.

لە شاری سالامانسا Salamanca ساڵی ١٤٨١ چەندین کتێب چاپکراون، بەڵام نێوی هیچ چاپچییەکیان لەسەر نەنووسراوە.

هەروەك چۆن لەئیتالیا چەند چاپخانەیەکی جولەکە هەبوین، ئەوا لە ئیسپانیاش بەهەمان شێوە چەند جولەکەیەك خەریکی چاپکردنی کتێبی عیبری بوون.

کۆنترین چاپخانەی جولەکە کە خاوەنەکەی خوان دێ لوسێنە Juan de Lucena بوو، مێژووی دامەزراندنەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٤٧٠ لە مۆنتالبان Montalban. لەسەر چاپخانەی ناوبراو هیچ دەکومێنتێك لە ڕۆژگاری ئەمڕۆ نەماون. **(سەیری وێنەی ژمارە ١٩ بکە).**




A honor lahor e gloria de nostre senyor deu Jesu christ e dela gloriosa sacratissima verge Maria mare sua senyora nostra. comenca la letra del present libre appellat Tirant lo blanch: dirigida per mossen Joanot martorell caualler al serenissimo princep don Ferrando de portogal.

Molt excellent virtuos e glorios princep Rey spectant Jatsia per vulgada fama fos informat de vres virtuts: molt maiorment ara he hagut noticia de aquelles per vostra senyoria voler me comunicar e disueltar vostres virtuosissime desigs sobre los fets dels antichs virtuosos: e en fama molt gloriosos cauallers dels quals los poetes e hystorials han en ses obres comendat perpetuant lurs recordations e virtuosos actes. E singularment los molt insignes actes de caualleria de aquell tan famos caualler que com lo sol resplandeix entre los altres planets: axi resplandeix aquest en singularitat de caualleria entre los altres: cauallers del mon apellat Tirant lo blanch: qui per sa virtut conquista molts regnes e prouincies donant los a altres cauallers no volent ne sino la sola honor de caualleria. E mes auant conquista tot limperi grech cobrant lo dels turchs qui aquell hauien subiugat a lur domini dels cristians grechs. E com la dita hystoria e actes del dit Tirant sien en lengua anglesa: e a vostra illustra senyoria sia stat grat voler me pregar la giras en lengua portoguesa opinant per yo esser stat algun temps en la illa de anglaterra degues millor saber aquella lengua que altri. Les quals pregaries son stades a mi molt acceptables manaments. Car ja yo sia per mon orde obligat manifestar los actes virtuosos dels cauallers passats maiorment car en lo dit tractat sia molt stesament lo mes de tot lo dret e orde de armes e de caualleria. E jatsia considerada ma insufficiencia e les curials e familiars occupacions qui obsten e les aduersitats de la noyble fortuna qui no donen re

**وێنەی ژمارە (١٩)**

کۆنترین ڕۆمانی ئیسپانی بەناوی سوارچاکی: Tirant lo Blanch لەلایەن Johannot Martorell نووسرایە و لەساڵی ١٤٩٠ لە Valencia چاپکرایە.

بەناوبانگترین چاپخانەی ئەوکاتەی جولەکە لە هیجار بوو. ئەویش لەلایەن ئێلیێسەر بێن ئەلانتانس Elieser ben Alantans بوو. ئەو لەنێوان ١٤٨٥-١٤٩٠ کتێبی عیبری چاپ دەکرد. پیتەکانی عیبری لە کارە چاپکراوەکان لەلایەن چاپچییەکانی ڤالێنیاوە بەناوی Alfonzo de Cordoba داتاشرابوون. لەو کاتە جولەکەکانی ئیسپانیا دووچاری ژیانی زۆر ناخۆش هاتن. ئەوان لەلایەن دەوڵەتەوە ریسوا دەکران و دەگیران و دەکوژران، تەنیا لەبەر ئەوەی بەرەگەز جولەکە بوون. لەساڵی ١٤٩٢ لەلایەن دەوڵەتی ئیسپانیاوە بەرەسمی فەرمانی دەرکردنی جولەکەکان لە ئیسپانیا درا. زۆر لەوان بۆ پورتوگال رایان کرد و هەندێك لە هەلاتووەکان پیشەیان چاپچی بوو.

## مێژووی چاپخانە لە پورتوگال

یەکەم چاپخانە لە پورتوگال لە شاری لیسەبۆن Lissabon لەلایەن رابیی ئێلیێسێر Rabbi Elieser لەساڵی ١٤٨٩ دامەزرا[1]. لەوێ کتێبی پێروس ها- تۆرە Perus ha-Tora لەلایەن مۆسێس بێن ناخمان Moses ben Nachman چاپکرا. پیتەکانی چاپخانەی هیجار لەسەر هەمان کتێب بەکار هاتوون. چاپخانەیەکی تری جولەکە لە شاری لێیریا Leiria لە ساڵی ١٤٩٢ دامەزرا. ئەو لەلایەن ئەبرەهام دێ ئۆرتاس Abraham de Ortas دامەزرابوو. هەر ئەویش کتێبێکی فەرهەنگی لەگەڵ چەند کتێبێکی ئاسمان ناسی چاپکرد.

بەناوبانگترین چاپچی پورتوگالی ئەو سەردەمە ڤالێنتین فێرناندێز Valentin Fernandezی خەڵکی مێهرن Mähren ئەڵمانیا بوو. ئەو یەکەمین چاپخانەی لەگەڵ نیکۆلاوس دێ ساکسۆنیۆ Nocolaus de Saxonio لە ساڵی ١٤٩٥ دامەزراند. ئەوان کتێبی زۆریان چاپکرد. بەناوبانگترین کتێب، ئەوا کتێبێکی وەرگێڕدراو بۆ سەر زمانی پورتوگالی بەناوی لودۆلفۆس دێ ساکسۆنیاس ڤیتە چریستی Ludolphus de Saxonias Vita Christi بوو. ئەوان پیتی ڤ، ن V, N یان وەك کورتکراوەی ناوی خۆیان لەسەر کتێبەکان دەنووسی و چاپ دەکرد. **(سەیری وێنەی ژمارە ٢٠ بکە).**

١. هەمان سەرچاوەی پێشوو. ل.١٧٧.



## مێژووی چاپخانە لە بەریتانیا

ویلیەم کاکستۆن William Caxton پاش چەندین ساڵ ژیان بەسەربردن لە هۆڵەندە، ساڵی ١٤٧٦ گەڕایەوە بەریتانیا. ئەو لە شاری وێستمینیستەر Westminster، کە ئەوکاتە شارێکی بچووکی نزیك لەندەن بوو بۆ یەکەم جار چاپخانەیەکی دامەزراند. بۆ ئەوەی کارەکانی بەڕێکوپێکی بەڕێوە بچێ، وینکین دێ ۆردێ Wynkyn de Wordeی لەگەڵ خۆی هێنابوو. کە باری ئابووری چاکتر بوو. ویلیەم زیاتر خۆی بەکاری وەرگێڕان خەریك دەکرد. وەك گوتمان لە سەرەتادا کاری چاپی دەکرد، بەلاّم دواتر کاری چاپی بەکرێکارەکان سپارد.

ئەو خۆشەویستیەی کە ئەو بۆ ئەدەبی ئینگلیزی هەبوو، لە نووسینەکانی تەواو ڕەنگی دابۆوە. ئەو زۆر بایەخی بەلایەنی تەکنیکی و هونەری چاپ و جوانی چاپ نەدەدا، بەڵکو بەلای ئەو گرنگ ئەوەبوو کە کتێبەکان بگەنە دەست خوێنەران.

یەکەم کاری ئینگلیزی کە چاپکرابێ، ئەوا کۆنتراکتێك بوو، هەرچەندە مێژووی چاپکردن لەسەر سەنەدەکە نییە، بەلاّم بەگوێرەی مێژووی نووسینی نامەکە، دەبێت لەپێش ١٣-١٢-١٤٧٦ چاپکرابێت[1]. یەکەم کتێبی چاپکراوی ئەو، وەرگێڕدراوێکی فەرەنسی بەناوی: دیکتس ئۆر ساینگیس ئۆف ز فیلۆسۆفەر Dictes or sayengis of the Philosopher بوو. کتێبی ناوبراو لە ١٨-١١-١٤٧٧ چاپکردنی تەواو بووە. جگە لە کتێبی سەرەوە Dictes، چەند کارێکی چاوسێر Chaucer یشی چاپکرد.

لەساڵی ١٤٧٧ کاکستۆن دەستی بەبەکارهێنانی ئەلف و بێی نوێ کرد. یەك لەو نووسینانە پێشتر فۆستس و شێفرس Schöffers, Fusts بەکاریان هێنابوو. کاکستۆن بۆ ناونووسین چاپی ڕەشی بەکاردەهێنا. ئەو نووسینانەی زۆر زەق بوون، پیتە لاتینییەکانی بەکار دەهێنا. یەك لەو نووسینانە ئۆردینالێ ساروم Ordinale Sarum بوو، کەهەمان نووسینی تێدا بەکار هاتووە. **(سەیری وێنەی ژمارە ٢١ بکە).**

دوا کتێب کە مێژووی چاپکردنی لەسەرە، لە ١٤-٦-١٤٨٩ بوو. هێنریکی حەوت لەو کاتە چوارەمین ساڵی حوکمڕانی بوو. هێنریك زۆر ئارەزووی لەکتێب خوێندنەوە دەکرد. یەك لەو کتێبانەی کە لە کتێبخانەی تایبەتی خۆی هەیبوو، دەستخەتی چریستینا پیسان Christine

١. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل.١٨٠.

Pisan دەربارەی شەڕ بوو. کتێبی ناوبراوی دابوو بەکاکستۆن بۆ وەرگێڕان و چـاپکردن. کتێبەکـە بەزمانی ئینگلیزی دەیکردە ز فەیتتیێ ئۆف ئارمێس The fayette of armes جگە لەوە زیاتر لە بیست کتێبی تری هونەرمەند لەنێوان ساڵەکانی ١٤٨٩-١٤٩١ چاپکران. کاکـستۆن لەسـاڵی ١٤٩١ کۆچی دوایی دەکا. تاکە کتێبی خۆی لەسەر مێدیسین بـەناوی ز گۆڤـەرناڵ ئـۆف هـێلس The governal of health چاپکرد.

کە ئەو کۆچی دوایی دەکا، چاپخانەکەی دەبێ بە هی سەرپەرشتیاری کرێکارەکان ویـنکین دێ وۆرد تا ساڵی مردنی کە ١٥٣٥ بوو سەرپەرشتی چاپخانەکەی خۆی دەکرد. وینکین لەو ماوەیـەدا زیاتر لە ٧٠٠ کتێبی چاپکرد[1]. کتێبەکان لەسەر بابەتی جیا جیا وەك: ئەدەب، دین، فەلـسەفە، مێژوو، کتێبی مەکتەب بوون.

١. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل.١٨٣.




dn̄i iiᵉ vᵉ. erūt de scā maria. et sol' med
de dn̄o. et in v fe dn̄r resp fer'. ¶ Dn̄ica
in Ramis palmaꝝ. et p ebdom̄ de. tēpali
et nl' de scō Richardo. Festū vero sci Am
brosij. differat' usq ad iij feri̅. post oct
Pasche. ¶ In die Pasche et p ebdom̄. de
solᵉ festi. Dn̄ica in oct Pasche. totū
fiat de oct. et sol' meō de reᵉ. nichil fiet de
mrib. Feria iij. de scō Ambrosio. Fe ij.
et iiij. de fe. resp de ij. et iij fe. Fe v. et sab'
de comeōb. Si fuerit iij comeōs. tr iiij
fe. fiat vna comeō. Fe vj. de scō Alphego
Inuitat' dx. et sic in oib fest. sine regie
chori usq ad oct die corpis xpi. ¶ Dn̄o
pma post oct pasche. de seruic dn̄i. Fe iiij
et vj. de fe. resp de ij. et iij fe. Fe ij. et sab'
de comeōb. Si fuerit iij comeōs. in iiij
fe. fiat vna comeō. ¶ Dn̄ica ij. de sacto
Vitale. meō de dn̄o. et de reᵉ. Fe ij. et v. de
fe. resp de ij. et iij fe. Fe iij. et sab' de co ⸗
meōb. Dn̄o iij. de seruic dn̄i. resp. Si
oblitus. Fe iij. de scō Johe Beuerlaco.

**وێنەی ژمارە (٢١)**

یەکەم کتێبی ئینگلیزی بەئەلف و بێی نوێ بەناوی: Ordinale secundum usum Sarum لە Westminster لەلایەن William Caxton لە ساڵی ١٤٧٧ چاپکرا.

وۆرد وەك كاكستۆن چاپخانەی بەمەبەستی ئامانجی خزمەتكردن بەڕێوە نەدەبرد، بەڵكو ئەو زۆرتر بیری لەدەوڵەمەند بوون دەكردەوە. بۆیەش لە كتێبە چاپكراوەكانی ئەو، لایەنی هونەر و نەخش، تارادەیەك پشتگوێ خراون. وۆرد لە ساڵی ١٤٩٤ ئیمزای خۆی خستە سەر كتێبەكانی كە خۆی چاپی كردوون.

لە شاری لەندەن بۆیەكەم جار لەساڵی ١٤٨٠ چاپخانە لەلایەن یوهن لێتۆ John Lettou دامەزرا بوو. هەمان ساڵ كتێبێكی بەناوی Antonius Andreaes Quaestiones super X11 libros Metaphysicae Aristotelis بەهەمان تیپەكانی پێشتر كە لە شاری ڕۆما بەكاری هێنابوو. سێ نامەی تۆماس والێنسیس Thomas Wallensis لەساڵی ١٤٨٠-١٤٨١ چاپكراون. ساڵانی داهاتوو لەگەڵ ویلیەم دێ ماچیلینیا William de Machlinia دەستی بەكاركردن كرد. بەیەكەوە شەش كتێب، كە مێژووی چاپكردن لەسەر هەموویان نییە بەزمانی فەرەنسی چاپكرد. چاپكردنی كتێبەكان لەوانەیە بۆ خوێنەرانی هۆڵەندی بەزمانی فەرەنسی بێت. سێ لەو كتێبانە باس لە مێژووی هاوبەشی بەریتانیا و فەرەنسا لە سەردەمی پادشای هێنریكی شەشەم دەكەن.

لێتۆ لە ساڵی ١٤٨٣ خۆی لە كۆمپانیاكە كێشاوەتەوە، بەڵام ویلیەم تاساڵی ١٤٩٠ بەتەنیا لە چاپخانە بەردەوام بووە. ریچارد پینسۆن چاپخانەی ویلیەمی وەرگرت و هەربۆیەش دواتر نێوی پینسۆن لەكتێبە چاپكراوەكان بەرچاو دەكەوێت.

لەنێوان ساڵەكانی ١٤٩٠-١٤٩١ ڕیچارد پینسۆن Richard pynson وەك چاپچییەك لەشاری لەندەن خەریكی چاپكردن بوو. بەماوەیەكی كەم بووە باشترین و بەناوبانگترین چاپچی لە هەموو بەریتانیا.

لە ساڵی ١٤٩٥ پینسۆن دەستی كرد بەچاپكردنی كۆمەڵێك كتێبی كۆمێدی لەسەر تێرێنتیۆس Terentius. لە سەرەتادا سێ كتێبی چاپكرد و سێ كتێبەكەی تریشی ساڵی ١٤٩٧ لەچاپكردن تەواو بوون.

جگە لەو شارانەی لەسەرەوە ناومان هێنان، لە شاری تریش وەك: ئۆكسفۆرد و سانت ئەلباس چاپخانە هەبوون. لەشاری ئۆكسفۆرد یەكەم كتێب بەناوی Hieronymus in symbolum apostolorum expositio لە ساڵی ١٤٧٨ چاپكرا. مێژووی ١٧-١٢-١٤٧٨ لەسەر كتێبەكە چاپكرایە، بەڵام چاپچی ناوی خۆی فەرامۆش كردووە. دوو كاری تریش



بێ ئیمزا لە ساڵەكانی ١٤٧٩-١٤٨٠ بەهەمان تیپ هیێرۆنیمۆس Hieronymus چاپكراون. ئەو تیپانە سەر بەتیپەكانی (كێلن) ی ئەڵمانیا بوون. لەساڵی ١٤٨١ وەستایەكی ئەو شارە بەناوی تیۆدریك ڕوود Theodoric Rood وەك چاپچی لە ئۆكسفۆرد رۆڵی هەبووە. ئەو سێ بەرهەمەی لەسەرەوە ناومان هێنان لەوانەیە بەرهەمی ئەو بن، بەڵام ئەو بۆ یەكەم جار ناوی خۆی لە كتێبی ئەلێكسەندەر دێ هەیلێس ئێكسپۆسیتیۆ سوپەر لیبرۆس ئەریستۆتیلیس دێ ئەنیمە Alexander de Hales Expositio super libros Aristotelis De anima دێت. كتێبی ناوبراو لە ١١-١٠-١٤٨١ لە چاپكردن تەواو بووە.

ڕود لەنێوان ساڵانی ١٤٨١-١٤٨٦ توانی ١٤ كتێب چاپ بكا و زۆربەی كتێبەكانیش بەزمانی لاتینی بوون. یەك لە كتێبە جوانەكانی ئەو سەردەم بەناوی ز بوك ئۆف هۆكینگ The book of hawking بوو. **(سەیری وێنەی ژمارە ٢٢ بكە).**

كتێبی ناوبراو ١٨٠ لاپەڕە بوو كە لەساڵی ١٤٨٦ لە سانكت-ئەلبانس St-Albans چاپكرا. یەكەم كتێبە كە بەچەند ڕەنگێك چاپكرابێت.

**مێژووی چاپخانە لە دانمارك**

ساڵی ١٤٨٢ لەسەر داوای كارل ڕێنۆڤ، Karl Rönnov یوهان سنێل Johann Snell ی خەڵكی لوبێك گەیشتە شاری ئۆدێنسێ Odense لەدانمارك، بۆ ئەوەی نامەیەك بۆ كەنیسە چاپ بكا. سنێل چاپخانەی خۆی لە شاری ئۆدێنسێ دامەزراند و یەكەمین كتێبی بەناوی برێڤیارییۆم ئۆتۆنیێنسێ Breviarium Ottoniense چاپكرد. تا ئەورۆش دانەیەك لەو كتێبە پارێزراوە، بەڵام هەموو لاپەڕەكانی لەسەر نین و نەماون. **(سەیری وێنەی ژمارە ٢٣ بكە).**

كتێبی سەرەوە نزیكەی ٥٠٠ لاپەڕە بوو. ئەو كتێبە بەهەمان پیت كە سنێل پێشتر لە ڤێیگێلس كلاڤیكولا Weigels Clavicula زووتر بەكاری هێناون. سنێل لەو كاتەی كە لە ئۆدێنس بوو كتێبێكی لەسەر پارەی خۆی چاپكرد. كتێبی ناوبراو دەربارەی داگیركردنی دورگەی ڕۆدۆسی یۆنانی لەساڵی ١٤٨٠ لەلایەن توركەكان بوو. دواتر سنێل دەگەڕێتەوە شارەكەی خۆی لوبێك و ئەو گەڕانەوەشی پێش ساڵی ١٤٨٣ بووە. دوای دوو ساڵ كتێبێكی تر لەناو سنوورەكانی ئەوسای دانمارك چاپ دەكرێ. ئەوجارەش ئەڵمانێك بەناوی ستێفان ئارندێس Stephan Arndes پاش وەرگرتن و فێربوونی هونەری چاپ لەئیتالیا، بۆ چاپكردنی كتێبی

میسالێ سلێڤیسێنسیێ Missale Slesvicens دەگاتە شاری سلێڤیگ Slesvig. کتێبی ناوبراو لەساڵی ١٤٨٦ لەچاپ تەواو بوو. بەدووریش نازانرێ کە ئاڕندێس پێش ئەوە خەریکی کارێکی زۆر گەورە لە هەمان شار بووبێ. کتێبی سەرەوە جوانترین کتێب بووە کە تا ئەو کاتە لە دانمارك چاپکرابێت. نووسینەکان ڕەنگدانەوە و کارتێکردنی هونەری چاپی ئەوکاتەی ئیتالیایان پێوە دیارە. ئەوەش وەك چاپچییەکەی پێش خۆی




Post dies vero quadra
ginta quinqz filii eius occi-
derunt regem & reuersus to
bias in domum suam om-
nisqz facultas restituta e ei.
Post hoc vero cum es-
set dies festiuus domini & fa
ctum est prandium bonum
i domo tobie Dixit filio suo
vade & adduc aliquos de tri
bu nostra timentes deum vt
epulent nobiscu. Cumqz
abiisset reuersus nunciauit
vnu ex filiis isrl iugulatu ia
cere in platea. Statimqz ex
iliens de accubitu suo relin-
quens prandium ieiunus p
uenit ad corpus: tollensqz
illud portauit in domum su
am occulte vt dum sol occu
buisset caute sepeliret eum.
Cumqz occultasset cor-
pus manducauit panem cu
luctu & tremore. Cum aute
occubuisset sol abiit & sepe-
liuit corpus. Memorans
illum sermonem quem dix-
it dominus per amos pro-
phetam Dies festi vestri co
uertentur in lamentaconem
& luctum Arguebat au-
tem eum omnes proximi sui
dicentes. Iam hui' rei cau
sa interfici iussus es: & vix
effugisti mortis imperium.
& iterum sepelis mortuos.
Sed tobias plus timens de
um q regem rapiebat cor-
pora occisoru & occultabat
eos in domo sua & mediis
noctib' sepeliuit ea Con-
tingit autem quadaz die fa
tigatus fuissz a sepultura ve
nies domum iactasset se iux
ta parietem & obdormissz ex
nido hyrundinum domie
ti illi stercora inciderent su
per oculos ei' fieretqz cec'.
Tu autem domini miserere
Sabbato secundo ad vesperas
Benedictus. Responsoriu. Be-
nedixit te dominus. Ympnus.
O lux beata trinitas. Versiculus.
Vespertina oracio ascendat.
Ant. O adonay dne deus mag-
ne & mirabilis qui dedisti salu-
tem manu femie exaudi preces
seruorum tuorum. Ad matuti
nas ynu. Lectio prima.
Apparuit itaqz rex
medorum subiu
gau-rat multas gentes suo
imperio & ipse edificauit

**وێنەی ژمارە (٢٣)**

کتێبی یەکەم لە دانمارك بەناوی: Breviarium Ottoniense لە Odense لەلایەن Johann Snell لە نێوان ١٤٨٢-١٤٨٣ چاپکرا.

دوو کتێبی ڕێزمانی لاتینی ڕێمیگیۆس Remigius لەگەڵ کتێبێك بەناوی دیالۆگوس سالۆمۆنیس ئێت مارکۆلفی Dialogus Salomonis et Marcolphi لەسەر پارەی خۆی چاپکرد. کتێبی دووەم زۆر ئاشکرا نییە کێ چاپی کردووە، بەڵام زۆربەی زانایان لەو بڕوایەدان کە ئارندێس چاپی کردبێ.

سێیەم چاپخانە لە دانمارك لەلایەن گۆتفرێد ڤان گێمێن Gotfred van Ghemenی هۆڵەندی کە ناوی گوودە و لێیدن هاتۆتە کۆپنهاگن.

ساڵی ١٤٧٩ کۆپنهاگن زانکۆی لێدەکرێتەوە، بۆیە دامەزراندنی چاپخانەیەك بۆ شار زۆر پێویست دەبێت. چاپخانە، لەلایەن پێدر ئەلبێرتسۆنی Peder Albertsen جێگری سەرۆك زانکۆ، یارمەتی دەدرا و دەشپارێزرا[1]. کاتی گەیشتنی چاپخانە بۆ کۆپنهاگن زۆر دیارنییە، بەڵام هەندێك لەو بڕوایەدان لەساڵی ١٤٨٩ بووبێت. یەکەم کتێب کە بەزمانی دانمارکی چاپ کرابێت لەساڵی ١٤٨٥، بەناوی دانسکە ڕیمکرێنیکا Danske Rimkrönike بووە. لەگەڵ چاپکردنی کتێبی ناوبراو سەدەکە تەواو دەبێت و دانمارك دەکەوێتە قۆناغێکی تری هونەری چاپ. گێمێنس تا ساڵی ١٥١٠ لە کۆپنهاگن مایەوە و تا ئەو کاتەش نزیکەی ٢٠ کاری چاپکرد[2]. کارەکان زۆربەیان بەزمانی دانمارکی بوون.

### مێژووی چاپخانە لە سوید

یەکەم چاپخانە لە سوید لەسەر داواکاری یاکوب ئۆلفسۆن Jakob Ulfssonی قەشە بوو. ئەویش وەك دانمارك هەمان چاپچی بەناوی یوهان سنێل بۆ چاپکردنی کتێبێکی کنیسە بۆ شاری ئۆبسالا هێنا.

لە ٢٠-١٢-١٤٨٣ یەکەمین کتێبی لە وڵاتی سوید بەناوی دیالۆگوس کرێیاتورارۆم مۆرالیزاتوس Dialogus creaturarum maralizatus چاپکرد[3]. (**سەیری وێنەی ژمارە ٢٤ بکە**).

---

١. هەمان سەرچاوەی پێشوو. ل.١٩٢.

٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل.١٩٣.

٣. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل.١٩٣.




Dyalogus creaturaꝝ optime moralizatus· omni materie morali iocundo modo applicabilis· ad laudē dei et edificationē hoim Incipit feliciter·

De sole et luna Dyalogus primus ·:·

Sol est scōm philosophū oculus mundi· iocunditas dei· pulchritudo celi· mensura temporꝝ· virtus et origo oim nascentiū· dominus planetaꝝ· ductor ꝛ pfector oim stellaꝝ· Luna vero ut dīt Ambrosius in exameron· est decor noctis· mater toci⁹ humoris ꝛ ministra· men

a j

**وێنەی ژمارە (٢٤)**

یەکەم کتێب لە سوید بەناوی: Dialogus creaturarum لە ستۆکهۆڵم لەلایەن Johann Snell لە ساڵی ١٤٨٣ چاپکرا.

ئەو کتێبەی سونێل بۆ کنیسەی ئۆپسالای چاپکرد، چەند دانەیەکی ماون، بەڵام هەموو لاپەڕەکانی نەماون و دیارنین. لەناو لاپەڕە ونبووەکان، نۆ لاپەڕە دیار نین، لە هەمووی گرنگتر، دوا لاپەڕەیە، کە مێژووی چاپکردنی لەسەر دەنووسرێ دیار نییە.

سونێل چەند کارێکی تر لە سوید چاپ دەکا و پایزی ١٤٨٤ دەگەڕێتەوە لوبێك. دووەمین چاپچی کە دێتە ستۆکهۆڵم، ئەویش هەر خەڵکی شاری لوبێك و بەناوی بارتهۆلۆمایۆس گۆتان Bartholomaeus Ghotan بوو. بەگوێرەی دەکومێنتەکان، ئەو لە ئۆکتۆبەری ١٤٨٦ لە شاری ستۆکهۆڵم بووە. یەکەمین کتێبی لەسەر ژیانی کاتەرینای کچی برگیتای بەناوی ڤیتە کاتێرینە Vita Katherina بوو. کتێبی ناوبراو ساڵی ١٤٨٧ چاپکراوە. لەم کتێبە ١٧٠ دانە چاپکرایە و تا کۆتایی ساڵی ١٤٨٧ سێ کتێبی تر چاپکران، تا ئەمڕۆ ماون، بەڵام چەند لاپەڕەیەکیان کەمە. گۆتان ستۆکهۆڵم لە ساڵی ١٤٨٧ بەجێ دێڵێ. یەکەم چاپ بەزمانی سویدی بریتی بوو لە یەك لاپەڕە کە لە ٢٠-١٠-١٤٨٩ چاپکرایە.

یەکەم کتێب بەزمانی سویدی بەناوی: ئەف دیئێفولسێنس فرێستیلسێ Aff dyäffwlsens frästilse کە نووسرایە لەلایەن یوهانس گێرسۆن لە ساڵی ١٤٩٥ چاپکرایە. فابری چاپچی کتێبی ناوبراوی چاپ کردیە. کە فابری دەمرێ خێزانەکەی لەسەر چاپکردنی کتێبەکە بەردەوام دەبێ. لە ٣٠-٩-١٤٩٦ تەواوی دەکەن([1]) "٢٢". **(سەیری وێنەی ژمارە ٢٥ بکە)** دوا کتێب لەو پانزە کتێبەی لە سوید چاپکرا بەناوی: ئەلانوس دێ ڕوپس دێ دیگنیتاتێ ئێت ئوتیلیتاتێ پسالتەری ب. مارییە ڤیرگینیس Alanus de Rupes De dignitate et utilitate psalterii B. Mariae Virginis بوو. کنیسەی مارییە فرێد کتێبی ناوبراوی چاپکرد و ئەو کتێبە مێژووی ٢٤-٣-١٤٩٨ ی لەسەر نووسرایە. کتێبی ناوبراو بەپارەی ستێن ستورێس گێمۆل ئینگەبۆری تۆت Sten Stures gemål Ingeborg Thott چاپکرایە.

---

١. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل.١٩٥.




thz mik bór ath góra Men ſanneligha mik bór mer
ok mer fara thē effthī· lika wiſth ſwa ſom enough ath
en ſrok menniſke werh ekke vm hō ſkal warðha hel
brygða ellī ey. Alth foroy mz rāch gōr hon thī tyl
thz hēne bór Tyl ath gōra en ándha. tha ſighie wy
ath vnthe lārar ſwa menniſkene j fornemoa fraſthil
ſe· ok oſághelicha māgh annar ſwa ſom guðz naðh·
Som faas ok forwārffwes menniſkene mz guðhe
ligha bón ok láſnyngh ſom goðh wārðhī j oyrwpa
ðomyrwkth ok hiārthans anghī The ſame naðhēne
mz forſkillan ok bón alla helgha māna ok helgha
qwinor werðhogha ſik tyl ath giffwa os/faðhī ok
ſon ok then helghe anðhe Amen.

Thār ánas meſter Johans gerſon bok aff dyāfwl
ſens fráſtilſe Arom ephtē guðhz byrðh. M.cdxcv.
Trykt aff Johannes ſmeðh j Stokholm ath meen,
gha almoghī genhōffthen dyāff wlē mz ſyt ſialſkap

**وێنەی ژمارە (٢٥)**

یەکەم کتێب لە سوید بەزمانی سویدی بەناوی: Aff dyäffwlsens frästilse لە ستۆکهۆڵم کە Johannes Gerson نووسیویەتی و لەلایەن Fabri لە ساڵی ١٤٩٥ چاپکرا.

ئەو کتێبە بە پیتی ئینیتیالەر Initialer کە پێشتر فابری Fabri لە ستۆکهۆڵم بەکاری هێنابوو چاپکرایە. لاپەڕەیەکی هەڵبژێری ئەو سەردەم ساڵی ١٤٩٨ تا ئەمڕۆش پارێزراوە و ماوە. چاپچی ناوی سیگفرید Sigfrid بوو. ئەو سویدی بووە یان ئەڵمانی، تا ئێستا ساغ نەبۆتەوە، بەڵام دیارە ئەگەر سویدیش نەبووبێ ئەوا زمانی سویدی زانیوە. بەزمانی ئەمڕۆ لەسەر لاپەڕەکە وا نووسراوە: "سیگفرید! ئەو هەڵانە چاکە و دانەی دووەمی هەڵبژێریم لەگەڵ ئەو دانەیە بۆ بهێنە. ئەگەر من نووستبم، تکایە بۆم لە پەنجەرەکە دابنێ، من ئەمشەو لاپەڕەکە هەڵبژێری دەکەم". **(سەیری وێنەی ژمارە ٢٦ بکە).**





**وێنەی ژمارە (٢٦)**

لاپەڕەیەکی هەڵبژێری لە کتێبی Alanus de Rupe، De dignitate et utilitate psalterii B. Mariae Virginis. کە ٢٤ مارتی ١٤٩٨ ی لەسەر نووسرایە و تا ئەمڕۆش پارێزراوە و ماوە.
"سیگفرید! ئەو هەڵانە چاکە و دانەی دووەمی هەڵبژێریم لەگەڵ ئەو دانەیە بۆ بهێنە. ئەگەر من نووستبم، تکایە بۆم لە پەنجەرەکە دابنێ، من ئەمشەو لاپەڕەکە هەڵبژێری دەکەم".

## جۆرەکانی چاپ

**سیٚ جۆری چاپ هەیە:**

١-چاپی قوولٚ.

٢-چاپی بەرز.

٣- چاپی پان (ئۆفسیٚت).

**چاپی قوولٚ:** تەواو پیٚچەوانەی چاپی بەرزە. بەیارمەتی پرۆسیٚسی فۆتۆکیمیك، نووسین یان ویٚنەکە بەچەقۆ دەکۆلٚدریٚ. دواتر دەخریٚتە سەر پلیٚت لەسەر مەکینە گەورەکان دەخریٚتە سەر سلیٚندەری مس - کۆپەر Copper دواتریش دەخریٚتە سەر کاغەز، ئەم جۆرە چاپە لە جیهاندا زۆر بلاٚو نییە.

**چاپی بەرز:** کۆنترین جۆری چاپە و بەشیٚوەی گۆتنبیٚرگی.دەلٚیٚن چاپی بەرز، چاپی بەرز تیپەکانی لە قورقوشم دروست دەکریٚن.

**چۆنیەتی کارکردن بە شیٚوەی چاپی بەرز**

تەختەیەکی دار خانەی زۆری لیٚدروست دەکریٚت و هەر خانەی تیپیٚکی تیٚدەکریٚت. ئەم تەختەیە ئەگەر تیپەکانی ناوی بۆ کتیٚب چاپکردن بن، ئەوا ژمارەی خانەکانی دەگاتە نزیکەی ٣٠٠ خانە. "من تەختەیەکم لە چاپخانەی کوردستان لای مامۆستا کوردۆ ژمارد، ژمارەی خانەکانی گەیشتە ٣٦١. ئەم تەختەیە تیپی عەرەبی و کوردی تیٚدابوون"، بۆ نووسینی لاتینی، ژمارەی خانەکان کەمترن. بۆ نووسینی کوردیش بۆ سەردیٚر و ناو و ناونیشان، خانەکان زۆر کەمترن و ژمارەی پیتەکانیش ئەوەندە زۆر نین.



ئەگەر کریٚکارەکە وشەی هەولیٚر کۆ بکاتەوە بەم شیٚوەیە دەبیٚت: (ه ە و ل یٚ ر) یانی لەناو شەش خانە و لەهەر خانەیەکیش تیپیٚك هەلٚدەگریٚت ئینجا وشەی هەولیٚری لیٚ دروست دەبیٚ. دواتر لەناو قالبیٚك دایدەنیٚ و بەکلیل نووسینەکە لەناو قالبەکە توند دەکات. لەپاشان قالبەکە دەخریٚتە نیٚو مەکینەی چاپ و چەند دانەیەکی بۆ هەلٚبژیٚری لیٚ چاپ دەکریٚ. ئەگەر نووسینەکە هەلٚەی تیٚدابوو، بە ماشە پیتەکە، یان وشەکە دەردەهیٚنریٚت و لەشویٚنی ڕاستییەکەی دادەنریٚت.

پاش هەلٚبژیٚری و چاکردن، دەستدەکریٚت بەچاپکردن. دوای چاپکردن، تیپەکان دەخریٚنەوە شویٚنی خۆی ( مامۆستا گیو موکریانی بەم پرۆسەیەی دەگوت: بلاٚوکردنەوە). ئەم تیپانە بەرزن و بە پیٚچەوانەش نووسراون، بەلاٚم لەکاتی چاپ بەڕاستی دەکەویٚتە سەر کاغەز و بۆ خویٚنەر بەڕاستی دەردەچن، بۆ چاپکردنی کتیٚبیٚکی ٢٠٠ لاپەڕە بەتیراژی ١٠٠٠ دانە لەلای ئیٚمە لە چاپخانەی کوردستان، بەلای کەمی شەش هەفتەی تەنیا بۆ چاپەکە دەویست.

ئەو جۆرە چاپە تا ئەمڕۆش لەزۆر چاپخانەو دەولٚەتی جیای جیهان ماوە و بە کاردیٚت، یانی لەسەردەمی گۆتنبیٚرگەوە تائەمرۆش بۆ نووسین و چاپکردن سوودی لیٚ وەردەگیریٚ و هەر بەردەوامە لەکارکردن پیٚی. پاش بەکارهیٚنانی ماوەیەك یان نزیکەی ١٠٠-٢٠٠ هەزار لاپەڕە، تیپەکان کۆن دەبن و پیٚویستییان بەگۆڕین دەبیٚت. ئەوەی لیٚرە گرنکە باس بکەین ئەوا تا سالٚی ١٨٩٠ هەموو ئەو چاپکراوانەی پیٚشتر، بەدەست پیت دوای پیت، دیٚر دوای دیٚر، لاپەڕە دوای لاپەڕە کۆکراونەتەوەو پاش چاپکردنیش پیتەکان بەسەر خانەکان بلاٚوکراونەتەوە. هەر بۆیەش ئینسکلۆپیدیای فەرەنسی بۆ چاپکردنی ٣٥ بەرگ ٣٠ سالٚی خایاند، لە سالٚی ١٧٥١ دەستیان بەچاپکردن کرد و لە سالٚی ١٧٨٠ تەواو بوو. فەرهەنگی ناوبراو ١٩٠٠٠ لاپەڕە بوو[1]. لەسەدەی نۆزدە زۆر هەولٚدرا بۆ دۆزینەوەی چارەیەك بۆ بەخیٚراکردنی چاپ و ریٚکخستنی پیتەکان، یەك لەو گرفتانە ئەوە بوو کەئامیٚرەکان دەبوایە دیٚر دیٚر بنووسن و دیٚرەکانیش هەر هەموویان وەك یەك دریٚژ بن.

لە سالٚی ١٨٩٠ یەکەم ئامیٚری پیٚویست دروستکرا. ئەوەش لە لایەن هاولاٚتی ئەلٚمانی و ئەمریکی ئۆتمەر مارگیٚنتالەر Ottmar Mergenthalar 1854-1899 بوو. بناغەی

1. Jokum Smith, Bokframställning. Stockholm, 1970.- p.24

دروستکردنی ئەم  ئامێرە ئەوە بوو کە هەر جارە و دێرێکی دەتاواندەوە و ئامادەی دەکرد. یانی ئێستا لە جیاتی پیت پیت کۆبکرێتەوە، دێر دێر نووسینەکان کۆدەکرانەوە و لەمس دادەڕێژران.

مارگێنتالەر ناوی ئامێرەکەی خۆی نا لینۆ تایپ Linotype. **(سەیری وێنەی ژمارە٢٧ بکە)**.

دوای ئەوە ئامێرەکی تر کەوتە بازاڕ کە لەسەر هەمان پرینسیپ دروستکرابوو بە ناوی ئینتەرتایپ Intertype . بە هۆی لاینۆتایپ و ئینتەرتایپ مرۆڤ دەیتوانی بەکاتژمێرێك نزیکەی چوار لاپەڕە پیت ڕیزبکا و دواتر چاپی بکا. لەکاتی کۆکردنەوەی نووسین بەدەست، هەر تیپێك هەڵەبێت، لە شوێنی خۆی تەنیا پیتەکە دەگۆڕێت و ڕاستەکەی لە شوێنی دادەنرێت، بەڵاّم لەکاتی نووسینی دێر دێر، ئەگەر لە دێرێك یەك پیت هەڵە بێت، ئەوا هەموو دێرەکە دەبێت بگۆڕێت و سەرلەنوێ دابڕێژرێتەوە.






**وێنەی ژمارە (٢٧)**

مەکینەی ئینتەرتایپ

١- تانگێت بۆرد. ٢- مەخزەن. ٣- دێرەکان دێنە ئێرە. ٤- فرنەکە دەکەوێتە پشت ئێرە. ٥- دێرە نووسراوەکە دێتە ئێرە. ٦- پاش تووانەوە، قالبەکان بێرەدا دەگەڕێنەوە نێو خانەکانی خۆیان.

بۆیە پێش ئەوەی دێرەکان بخرێنە ناو مەنجەڵە مسە کولاوەکە دەخوێنرێنەوە بۆ ئەوەی ئەگەر هەڵەی تێدا بێت و بەرچاو بکەوێت، هەڵەکە چاك بکرێ.

دوای ئەو سێ جۆرەی سەرەوە کە تا ساڵی ١٩٥٠ بەردەوام بوو، ئـەوا شـێوەی نـوێ پەیـدا بوو، وەك تێلەتایپ Teletype ئەو جۆرە نوێیە تەواو بـووە ئۆتۆماتیـك. ئـەم سیـستەمە بـۆ یەکەم جار لە ئەمریکا بەکارهات و زیاتریش بۆ چاپی ڕۆژنامـەکان بـەکار دەهێنـرا. ڕۆژنامـە هەبوو دەبوایە لەچەندین شوێن چاپ بکرێ، بۆ ئەوەی کـاری چـاپکردنیان بـۆ ئاسـانتر بکـرێ، سوود لەم سیستەمە وەردەگیرا. **(سەیری وێنەی ژمارە ٢٨ بکە)**

تێلەتایپ لەکاتی نووسینی هەر پیتێك لەسەر کاغـەز کـە شـێوەی لەشـریت دەکـا، کـون دەکرێت، ئەو شریتەش بەئامێرەکی قورقوشمی خەت داڕشتنەوە بەستراوەتەوە، بەڵام دەکرێ سێ ئامێری شریتی کونکراو بەیەك ئامێری قورقوشمەوە ببەسترێتەوە و رەوانە بکات، لەو کاتـە لـە کاتژمێرێك لە جیاتی ئەوەی ٤ لاپەڕە یان ١٠-١٥ هەزار زناك "خاڵ" چاپ بکـا. لـەو کاتـە ژمارەی دەگاتە ٣٥-٤٠ هەزار خاڵ یانی سـێ جـار خێراتـر دەبێـت. سـێ سـاڵ دوای ئـەوەی ئامێری لاینۆتایپ کەوتە بازاڕەوە، تۆلبێرت لانستۆن (Tolbert Lanston 1844-1913) ی ئەمریکی ئامێری نوێی بەناوی مۆنۆتایپ Monotype دروست کرد. ئـەو ئـامێرە دواتـر لـە بەریتانیا گەشەی پێدراو ڕۆڵی خۆی لە مەیدانی کتێب چاپکردن بەباشی بینی[1]. مۆنۆتایپ لە دوو ئامێر پێك دێت، لە سەرەتا شـریتەکە کـون کـون دەکـات دواتـر دەیخەنـە سـەر ئـامێری قورقوشم، ئینجا لە بەکرەیەك (ڕۆڵە) کۆدەکرێتەوە و دەیبەنە سەر ئامێری قورقوشـم، لـەکاتی سووڕانی بەکرە تانگێتبۆردەکە دەسووڕێت و دەبێتە هۆی نووسینی ئەو تێکستە کە کابرا خـۆی دەیەوێت، ئەو دێرانەی کە لەم ئامێرە چاپ دەکرێن، درێژییان ٩-١٠ سەنتیمەترە.

١. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل.٢٨.






**وێنەی ژمارە (٢٨)**

تێلێتایپ، فابریك هێڵ

١- نووسینەکە. ٢- تانگێت بۆرد. ٣- ڕولەی کاغەز کە کون دەکرێت و بۆ ژمارە ٤ دەڕوا. ٤- ڕۆلی کاغەز. ٥- ترانسمیتەر.

کاغەزەکە بەگوێرەی نووسینەکە کون کراوە.

پاش ئەوەی نووسینەکە تایپ دەکرێ، بەو ئامێرەوە دەبەسترێتەوە. ئەم ئامێرە بەگوێرەی نووسینەکە دێرەکان دەتاوێندرێنەوە و لە قورقوشم دروست دەکرێن.

بۆ چاپکردن بەهۆی مۆنۆتایپ وەك چاپکردن بە لاینۆتایپ، پێویستی بەدووکەس هەیە، هەر یەکەو لەسەر ئامێرێك کار بکـات. خێرایـی ئـەم ئـامێرە ٧-٩ هـەزار خالـە لەیـەك کاتژمێردا. چاپکردن و هەڵەبژێری بەمۆنۆتایپ زۆر ئاسانترە، چـونکە مـرۆ دەتـوانێ هـەر پیتێ بیەوێ بیگۆڕێ، دەتوانی بیگۆڕی، نەك هەموو دێرەکـە. ئەگـەر یـەك بیـەوێ چـاپی دووەمی کتێبەکە بکات، یان جاری دووەم چاپی بکات، ئەگەر کـابرا ڕۆڵەکـەی پاراسـتبێ سەرلەنوێ دەتوانێ سوودی لێ وەربگرێتەوە، ئـەوەش دەکاتـە کەمکردنـەوەی خـەرجی بـۆ چاپکردنی جاری دووەمی نووسینەکە.

ئامێری مۆنۆتایپ بۆ چاپکردنی کتێبی ئاڵۆز و گران بەکاردێت، وەك چاپکردنی فەرهەنگ، ئینسکلۆپیدیا، کتێبی هەندەسی، بەلاّم بۆ چاپکردنی جۆرەکانی تری کتێب، لەوانەیـە گـران و پارەی زۆر بووەستێت.

**چۆنیەتی دروستبوونی کلێشە**

کلێشە پێکدێت لە پارچەیەك زەنگ، قورقوشم و لەسەر یەك ڕووی وێنەکە، نووسینەکە کـە مرۆ خۆی مەبەستییەتی چاپ دەکرێت. کە وێنەکە چاپکرا، مرۆ لەسەر دارێـك یـان قـالبێکی تایبەتی دادەنێت و دواتر دەخرێتە نێو ئامێری چاپ و لەسەریەوە چاپ دەکرێت. کلێشەیەك کە لەسەر زینگ Zink دروستکرابێت، دەتوانرێ ٦٠-٧٠ هەزار دانـەی پێـچاپ بکـرێ و ئەگـەر هەمان کلێشەش لە کۆپەر دروستکرابێ دەتوانرێ تا ٢٠٠ هەزار دانەی پێچاپ بکرێ. **(سەیری وێنەی ژمارە ٢٩-٣٠ بکە)**

بۆ دروستکردنی کلێشەی ڕەنگی، دەبێت بـەلای کەمـەوە سـێ کلیـشەی سـێ ڕەنگـی بناغەیی ئامادە بکات. ئـەو ڕەنگانـەش: زەرد، سـوور، شـین. جگـە لـەو سـێ ڕەنگانـەی سەرەوە زۆر جار ڕەنگی چوارەمیشی کە ڕەنگی ڕەشە، لێزیاد دەکرێ. ئەگەر ڕەنگـی ئـەو وێنەی کە کلێشەی بۆ دروست







**وێنەی ژمارە (٢٩)**

فۆرمێکی چاپی هەشت لاپەڕەیی. لێرە کلێشە لەسەر فۆرمی خۆی دادەنرێ.



**وێنەی ژمارە (٣٠)**

مەکینەی دروستکردنی کلیشە.
١- ئۆرگینال. ٢- گلۆپ. ٣- سکیەك بۆ هێنانە پێش و دوورکردنەوەی کلێشە. ٤- عەدەسە. ٥- کۆنترۆل کردنی وێنەکە. ٦- تەختە. ٧- فیلم و راستەکەی دەخرێتە ناو.



دەکەن لە ئەنجامی تێکەڵاوکردن ڕەنگی مەبەست نەیەتە ئەنجام، ئەوا کلێشە بۆ ڕەنگی تایبەتی دروست دەکەن.

ڕەنگی ڕەش کلێشەی خۆی هەیە، ڕەنگی سوور کلێشەی خۆی هەیە، ڕەنگی زەردیش کلێشەی تایبەتی خۆی هەیە. بۆ جیاکردنەوەی ڕەنگەکان، کاری فیزیاوی ئەنجام دەدرێت نموونە: ئەگەر لە شووشەی ڤیۆلێت (شین) سەیری وێنەکی ڕەنگی بکەین، دەبینین وێنەکە هەموو ڕەنگێکی تێدایە جگە لە ڕەنگی ڤیۆلێت. بۆیەش ڕەنگە زەردەکان بەتەواوی ون دەبن. ئەگەر لە شووشەی سەوز سەیری وێنەی ڕەنگی بکەین، ئەوا ڕەنگە سوورەکان ون دەبن. ئەگەر لەڕێگای شووشەی نارنجیەوە سەیری وێنەی ڕەنگی بکەین، ئەوا ڕەنگە شینەکان ون دەبن. مرۆ لەکاتی دروستکردنی کلێشە بۆ وێنەی ڕەنگی، سوود لەو یاسایەی سەرەوە وەردەگرێت.

جیاکردنەوەی ڕەنگەکان لەوێنە، بەشێوەی ئۆتۆماتە و ئەو ئامێرەی کە کلێشەکانیش دروست دەکات، پێی دەگوترێ سکانەر Scanner لە بنچینەدا وشەیەکی ئینگلیزییە وەك تو سکان To Scan کە دەکاتە گەڕان بەدوای، بینین لە ڕێگای ئەوەوە، بینین لە ناوەوە.

ئەو کلێشانە وەك گوتمان دەکرێ لەسەر زینك، ئەلەمنیۆم، مس، پلاست وێنەی بگیرێت. دواتر دەخرێتە نێو ئامێرەی چاپ و وەك پێویست چاپ دەکرێت. بۆ چاپکردنی وێنەی ڕەنگی دەبێت کاغەزەکە زۆر باش بێت، تاکو وێنەکە وەك ئەوەی خۆمان ئارەزوومانە دەربچێت[1].

## چاپی بەرز

زانای ئەڵمانی فرێدریخ کێنینگ Friedrich König ساڵی ١٨١٠ بۆ یەکەم جار ئامێری چاپی خێرای دروست کرد. هەمان زانا ساڵی ١٨١٢ ئامێری چاپی سلیندەری دروست کرد. ئەو ئامێری ناوبراوی فرۆشتە رۆژنامەی ز تایمس The Tims لە لەندەن. تا ئەمرۆش لەسەر هەمان پرینسیپ ئامێری چاپ بۆ نووسینی بەرز بەکار دەهێنن. **(سەیری وێنەی ژمارە ٣١ بکە).**

لەکۆنەوە ئاشکرایە کە چەوری لەگەڵ ئاو تێکەڵ دەکرێ، دڵۆپە ئاوی وردی لێدروست دەبێ کە دەکاتە ئەوە ئاو ناگاتە مەتریالەکە. لەسەر هەمان پرینسیپ مەکینەی چاپی ئۆفسێت پەیدا بوو.

---

١. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل.٥٠.

زانای ئەڵمانی ئـەلۆیس سـێنێفێلدەر Alois Senefelder 1771-1834 لـە سـاڵی ١٧٩٦-١٧٩٨ بۆیەکەم جـار ئـەو پرینـسیپەی بـۆ چـاپکردن بـەکار هێنـا. دواتـر نـاوی لیتۆگرافی Lithography پێدرا. ئێستا ئەو جۆرە چاپە نەماوە، ئەگەر لە هەندێك شوێن ماشبێت، ئەوا زۆرتر بۆ کـاری هونـەری و جـوان و چـاپی جـوان بـەکار دێـت. لێتـۆگراف وشەیەکی یۆنانییە: لیسۆس یانی بەرد، گراف، دەکاتە: نووسین. بەیەکەوە بەزمانی کـوردی دەکاتە نووسین لەسەر بەرد[1].

سـاڵی ١٩٠٥ زانـای ئەمـەریکی ئـیرا روبێـل Ira Rubel تـەکنیکی نـوێ کـە شـوێنی لیتۆگرافی گرتەوە بەکار هێنا. مێتـۆدی نـاوبراو ئیمـڕۆ پێـی دەگـوترێ ئۆفـسێت. لـە چـاپی ئۆفسێت یەکەم جار چاپەکە لەسەر سـلیندەرێکی قـایش چـاپ دەکـاو دواتـر دەکەوێتـە سـەر کاغەز. چاپی ئۆفسێت ئەو شتەی مرۆڤ چاپی دەکات، دەبـێ وێنـەی بگـیرێ و دواتـر وێنەکـە لەسەر پلێت چاپ دەکرێ. ئەو وێنەش دەکرێ نووسین یان وێنە بێـت. پلێتـی بـاش لـە فـافۆن دروستکراون و پاش ئامادەکردنیان دەخرێنە ناو ئامێری چاپ و شتی مەبەست چاپدەکرێ.

لەکاتی چاپکردنی ئۆفسێت بە تـیراژی پێویـست، دەتـوانرێ پلێتەکـە لـە مەرەکـەب پـاك بکرێتەوەو بۆ جارەکانی داهاتوو هەڵبگیرێ. ئەگەر مـرۆ بیـەوێت کتێبێـك بـۆ جـاری دووەم و چاپی دووەم بەبێ دەستکاری چاپ

١. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل.٦٨.






**وێنەی ژمارە (٣١)**

ئامێرێکی Heidelberg چوار ڕەنگی کە لە پێنج خانە پێك هاتووە. ئەم ئامێرە دەتوانێت بەیەکجار پێنج ڕەنگ چاپ بکات.

بکاتەوە، پێویست ناکا هەموو نووسینەکان سەرلەنوێ تایپ بکرێنەوە، بەڵکو لاپەڕەکانی کتێبەکە وێنەی دەگیرێ و لەسەر ئەوانیش پلێتی نوێ دروست دەکەن. دەشکرێ فلیمەکانی جاری یەکەم و چاپی یەکەم بپارێزین.

## کاغەز

کاغەز بۆ یەکەم جار لە جیهان لە سەدەی یەکی زاینی لە وڵاتی چین دروستکرا.

ساڵی ٧٥١ ی زاینی ئاسنگەرە ئیسلامەکانی شاری سەمەرقەند چەند دیلێکی چینییان گرت. لەناو ئەو دیلانە چەند کەسێك پێشتر لە چین فێری هونەری کاغەز دروستکردن کرابوون. بەگوێرەی بۆچوونێك بەندەکان لەسەر ڕەزامەندی خۆیان لە شاری سەمەرقەند خەریکی کاغەز دروستکردن بوون. بەگوێرەی بۆچوونی تر، پاش لێدان و سزادانی زۆر نهێنی کاغەز دروستکردنیان ئاشکرا کرد[1]. بەم شێوەیە هونەری کاغەز دروستکردن لە ناو دەوڵەتانی ئیسلامی و عەرەبی پەرەی سەندو کاغەز شوێنی پێستی گرتۆتەوە، لە سەدەی دوانزە عەرەبەکان کاغەزیان گەیاندۆتە ئیسپانیا و لەوێشەوە بۆ هەموو ئەوروپا بڵاوبۆتەوە، بە ڕێگای سیسیلیاوە کاغەز دروستکردن گەیشتۆتە ئیتالیا و ساڵی ١٢٧٦ کاغەز لە فابریانۆ Fabriano ی نزیك ئەناکۆنا Ancona دروست دەکرا. لەدواتریش کارگەی کاغەز دروستکردن گەیشتە باکوری ئیتالیا[2].

کاغەز تا ساڵێ ١٧٩٩ هەر بەدەست دروست دەکرا. لویس ڕۆبێرت ی Louis Robert زانای فەرەنسی بۆیەکەم جار ئامێری کاغەز دروستکردنی دروست کرد. ساڵی ١٨٠٦-١٨٢٠ توانرا کاغەزی زۆر لە کارگەکانی کاغەز بەرهەم بهێنرێت و ئامێرەکان زۆرتر بن. سەرەتا کاغەز لەپاشماوەی پەڕۆکەکان (تێکستیل مەتریال) و پارچە پەڕۆك دروست دەکرا. پارچە قوماش لەوکاتە بەهەرزانی و ئاسانی دەست نەدەکەوت.

زانای ئەڵمانی لە ساڵی ١٨٤٠ توانی بۆیەکەم جار کاغەز لە دار دروست بکات[3]. لە شەستەکانی سەدەی ڕابردوو یەك ئامێری گەورە لە شەو و ڕۆژێکدا دەیتوانی ١٥ ملیۆن کاغەزی A4 دروست بکات. **(سەیری وێنەی ژمارە ٣٢ بکە).**

---

1. Donald Jackson، Skrivkonstens Historia. Hongkong، 1987.- p.116.

٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل.١١٦.

3. Jokum Smith، Bokframställning. Stockholm، 1970.- p.54.






**وێنەی ژمارە (٣٢)**

ئامێری سەرەوە وێنەی مۆنۆ تایپە. ١-نووسینەکە. ٢-تانگێت بورد. ٣-کاغەزە کونکراوەکە. ٤-دێرەکان دەژمێری.

ئامێری خوارەوە دێرەکان لەقورقوشم دروست دەکات. دەکرێ فرنیشی پێبگوترێ.

دەگوترێ کە فلانە کاغەز چەند گرامە، مەبەست لە یەك مەتر چوارگۆشەی ئەو کاغەزەیە. ئەو کاغەزانەی کە بۆ فۆتۆکۆپی بەکاردێن، ٨٠ گرامن، یانی یەك مەتری چوارگۆشەی کاغەزەکە ٨٠ گرامە بۆیە بەهەشتا گرامیش بەناوبانگن. ئەستووری یان گرانی کاغەز بۆ بەکارهێنانی دەگەڕێتەوە سەر ئەوەی کە چ جۆرە بەرهەمێکی پێ چاپ دەکەین نموونە: ئەگەر کتێبێکی شیعری ٨٠ لاپەڕە چاپ بکەین، ئەوا چاکە کاغەزی ئەستوور هەڵبژێرین وەك: ١٣٠ گرام، بەڵام ئەگەر ڕۆمانێکی ٦٠٠ لاپەڕە چاپکەین، چاکە کاغەزێکی ٩٠ یان ١٠٠ گرامی بۆ چاپکردنی کتێبەکە هەڵبژێرین.

باشە ئەوە بهێنینەوە یاد، نرخی کاغەز دەکەوێتە سەر ئەوەی کە چەند کاغەزەکە ئەستوورەو چەندیش کاغەزەکە باشە.



## سەرچاوە لەگەڵ ئەو کتێبانەی بۆ ئەم بەرهەمەم سودم لێوەرگرتوون

**بەزمانی سویدی:**


1- Björn Nöljer. Så snickar du en tidningsartikel. Borås, 1994. – 187 s.

2- Catharina Grunbaum. Språkbladet. Borås, 1998. – 142 s.

3- Donald Jackson. Skrivkonstens Historia.Hongkong, 1987–176 s.

4- Eva Ram-Inghult. Svenska skriv regler. Uppsala, 1993. – 150 s.

5- Hans Sallander. Medeltidens boktryckerihistoria. Uppsala, 1959. – 211 s.

6- Janerik Larsson. Fri radio en utopi. Stockholm, 1990. – 87 s.

7- Jarl Backman. Att skriva och läsa vetenskapliga rapporter. Lund, 1985. – 73 s.

8- Jokum Smith. Bokframställning. Stockholm, 1970. – 103 s.

9- Lars Larsson, Bertil Ludvigsson. Nya Bilden. Falun, 1985. – 136 s.

10- Nielsen L. Chr., Boktryckerikonstens uppfinning. Malmö, 1900.p.203

11- Stig Hadenius, Lennart Weibull. Massmedier. Falun, 2003. – 505 s.

12- Sören Larsson. Att skriva i en tidning. Borås, 1992. – 212 s.

13- Trond Berg Eriksen. Budbärarens övertag. Kristianstad, 1992. – 246 s.

14- Åke Edwardson, Kenth Andreasson, per andersson-Ek. Göra tidning. Värnamo, 1998. – 235 s.

**بەزمانی روسی:**


1- Беспалова А. Г., Корнилов Е. А., Короченский А. П., Лучинский Ю. В., Станько А. И. История мировой журналистики. М., 2003. – 432 с.

2- 33- Ворошилов В. В. Журналистика и рынок. СПб., 1997. – 232 с.

3- Ворошилов В. В. Журналистика. СПб., 1999. – 304 с.

4- Головня И. А. С чего начиналась фотография. М., 1991. – 176 с.

5- Гуревич С. М. Работа с письмами в редакции. М., 1991. – 159 с.

6- Гуревич С. М. Газета и рынок. М., 1998. – 240 с.

7- Гуревич С. М. Номер газеты. М., 2002. – 191 с.

8- Есин Б. И. История русской журналистики. М., 1991.– 320 с.

9- Засорина Т, Федосова Н. Профессия – журналист. Ростов н/д; 1999. – 320 с.

10- Засурский И. И. Масс-медиа второй республики. М., 1999. –272 с.

11- Камионко В. Ф. Работы и самураи: Телевидение и радио современной Японии. М., 1989. – 174 с.

12- Корконосенко С. Г. Основы творческой деятелъности журналиста. СПб., 2000. – 272 с.

13- Кузнецов И. В., Овсепян Р. П., Иванова Р. А. История отечественной журналистки.(1917-1945) М., 1999. – 272 с.

14- Лазутина Г. В. Профессионалъная этика журналиста. М., 1999. – 208 с.

15- Лазутина Г. В. Основы творческой деятельности журналиста. М., 2000. – 240 с.

16- Мельник Г. С. Mass-media: Психологические процессы и эффекты.СПб.,- 1996. 160 с.

17- Миньяр-белоручев Р. К. Теория и методы перевода. М., 1996. – 208 с.

18- Михайлов С. А. Современная зарубежная журналистика: состояние, переспективы. СПб., 1998. – 113 с.





19- Михайлов С. А. Мировые тенденции и национальные особенности в современной зарубежной журналистике. СПб., 2002. – 301 с.

20- Михайлов С. А. Современная зарубежная журналистика: Правила и парадоксы. СПб., 2002. – 446с.

21- Михайлов С. А. Журналистика стран северной европы. СПб., 2003. – 368 с.

22- Накорякова К. М. Литературное редактирование. М., 1994. – 189 с.

23- Орлов Ю. Я. Печать ФРГ. М., 1970. – 280 с.

24- Парфенов Л., Чекалова Е. Нам возвращают наш портрет. М., 1990. – 207 с.

25- Прохоров Е. П. Введение в теорию журналистики. М., 1995. – 294 с.

26- Самолетов С. А. Дизайн современной газеты. СПб., 1998. – 39 с.

27- Сапан М. Печать курдской диаспоры: история и современное состояние. СПб., 1998. – 140 с.

28- Смелкова З. С. Риторические основы журналистики. М., 2002. – 320 с.

29- Станько А. И. Журналистские расследования. Ростов н/д; 1997. – 222 с.

30- Соколов В. С., Виноградова С. М. Периодическая печать Италии. СПб., 1997. – 100 с.23- Соколов В. С.,

31- Соколов В. С., Михайлов С. А. Периодическая печать соединенных штатов Америки. СПб., 1998. – 144 с.

32- Таказов В. Д. Журналистика и литературный процесс в Осетии. СПб., 1998. – 184 с.

33- Тертычный А. А. Жанры периодической печати. М., 2000. –312 с.

34- Тертычный А. А. Расследовательская журналистика. М., 2002. –384 с.

35- Шереля А. А. Радио журналистика. М., 2000. – 480 с.

36- Юровски А. Я. Телевизионная журналистика. М., 1964. –237 с.

## بەزمانی ئینگلیزی:

1- Joseph T. Klapper. The effects of mass communication. NewYork, 1960 .- 302p.

## بەزمانی عەرەبی:

١- قصطنتين سيمينوف. كنت و ابقى صحفيا. موسكو، ١٩٨٩. ٣٧٦ ص. ترجمة سليم توما.







**وێنەی ژمارە (3)**

ئەم راوکەرە لەسەر بەلەمێك لە ناو ئاو راوەستایە و بەلەمەکەشی لە پاپیرۆس


Matheus

tunicam tuā tollere dimitte ei et palliū:
et quicunq; te angariauerit mille pas-
sus: vade cū illo et alia duo. Qui aūt
petit a te da ei: et volenti mutuare a te
ne auertaris. Audistis quia dictū ē:
diliges pximū tuū · et odio habebis
inimicū tuū. Ego aūt dico vobis dili-
gite inimicos vestros: benefacite hiis
qui oderūt vos · et orate pro psequē-
tibus et calūniantibz vos: ut sitis filij
patris vestri qui in celis est · qui solem
suū oriri facit super bonos ⁊ malos:
et pluit sup iustos et iniustos. Si enī
diligitis eos q̄ vos diligūt: quā mer-
cedem habebitis? Nōne et publicani
hoc faciūt? Et si salutaueritis fratres
vestros tātū: qd̄ amplius facitis? Nōne ⁊
ethnici hoc faciūt? Estote ergo vos pfe-
cti: sicut ⁊ pater vester celestis pfectus est. VI
Attendite ne iusticiā vestrā facia-
tis corā hominibz ut videami-
ni ab eis: alioquin mercedem nō habe-
bitis apud patrem vestrū qui in celis ē.
Cū ergo facis elemosinā noli ante te tu-
ba canere: sicut ypocrite faciūt i synago-
gis et in vicis ut honorificent ab ho-
minibus. Amen dico vobis: receperūt
mercedē suā. Te aūt faciēte elemosinā:
nesciat sinistra tua quid faciat dextera
tua: ut sit elemosina tua i abscōdito: ⁊
pater tuus qui videt i abscondito red-
det tibi. Et cum oratis: non eritis ypo-
crite qui amāt in synagogis et in an-
gulis platear stantes orare: ut vide-
antur ab hominibus. Amē dico vo-
bis: receperūt mercedē suā. Tu aūt cum
oraueris intra i cubiculū tuū: ⁊ clauso
ostio ora patrem tuū in abscondito: ⁊
pater tuus qui videt in abscōdito red-
det tibi. Orantes aūt nolite multum
loqui: sicut ethnici faciūt · putant enī
q in multiloquio suo exaudiantur.

Nolite ergo assimilari eis. Scit enim
pater vester quid opus sit vobis: an-
tequā petatis eum. Sic ergo vos ora-
bitis. Pater noster qui es in celis san-
ctificetur nomē tuū. Adueniat regnū
tuū. Fiat volūtas tua: sicut in celo et
in terra. Panē nostrū supsubstātialē
da nobis hodie. Et dimitte nobis de-
bita nostra: sicut et nos dimittimus
debitoribus nostris. Et ne nos indu-
cas in temptationē: sed libera nos a
malo. Si enim dimiseritis hominibz
peccata eoꝝ: dimittet et vobis pater
vester celestis delicta vestra. Si autem
non dimiseritis hominibus: nec pa-
ter vester dimittet vobis peccā vestra.
Cū aūt ieiunatis: nolite fieri sicut ypo-
crite tristes. Extermināt enī facies suas:
ut pareant hominibus ieiunantes.
Amen dico vobis: quia receperunt
mercedem suā. Tu autem cū ieiunas
unge caput tuū et faciē tuā laua: ne
videaris hominibus ieiunās sed pa-
tri tuo qui est in absconso: et pater tu-
us qui videt in absconso reddet tibi.
Nolite thesaurizare vobis thesauros
in terrā: ubi erugo et tinea demolitur:
et ubi fures effodiūt et furant̄. Thesau-
rizate aūt vobis thesauros i celo: ubi
nec erugo nec tinea demolit̄: ⁊ ubi fu-
res nō effodiūt nec furātur. Ubi ē the-
saurus tuus: ibi ē ⁊ cor tuū. Lucerna corp-
ris tui ē oculus tuus. Si oculus tuus fu-
erit simplex: totū corpus tuū lucidū erit.
Si aūt oculus tuus fuerit neqꝫ: totū
corpus tuū tenebrosum erit. Si ergo
lumē qd̄ in te est tenebre sunt: ipe tene-
bre quāte erūt? Nemo potest duobus
dñis seruire. Aut enim unū odio habe-
bit ⁊ alterū diliget: aut unū sustinebit
et alterū contemnet. Non potestis deo
seruire et māmone. Ideo dico vobis:

**وێنەی ژمارە (7)**

لاپەڕەیەك لە كتێبی ئینجیلی بەناوبانگ: بە ٤٢ خەت ئایەتی ٥:٤١-٦:٢٤. لە ماینز یوهان گۆتنبێرگ ساڵی ١٤٥٥ چاپیكردووە




lxxvij

Credo Simbolū apostolorū.
In vnū deū Patrē omnipotētē
factorē celi et terre visibiliū omniū
et invisibiliū. Et in vnū dñm nrm
ihm xpm filiū dei unigenitum: et ex
pre natū ante omnia scl'a. Deū de deo
lumē de lumīe: deū verū de deo vero
genitū nō factū cōsubstātialē patri:
per quē omnia facta sūt. Qui propter
nos homines et propter nostrā salutē
descendit de celis: et incarnatus est
de spū sancto: ex maria virgine Et
homo factus est Crucifixus etiam pro
nobis sub pōtio pylato passus et se-
pultus ē. Et resurrexit tertia die scdm
scripturas: ⁊ ascēdit in celū sedet ad
dexteram pris Et iterū venturus est
cū gl'ia iudicare vivos ⁊ mortuos:

**وێنەی ژمارە (8)**

ساڵی ١٨٨٠ ئەم كتێبە بە ناوی Missale speciale لە دەوروبەری باسێل دۆزرایەوە. بە گوێرەی تیپەكانی ئەم چاپە، دیارە پێش ئینجیلی ٤٢ خەت چاپكرایە، بەڵام كەی لە كوێندەر چاپكرایە، جارێ ئاشكرا نییە، لەگەڵ ئەوەش هەموو زاناكان یەكن لەسەر ئەوەی كە پێش ئینجیلی ٤٢ خەت چاپكرایە، چونكە تیپەكان كۆنترن. لەبەرئەوەی لە دەوروبەری باسێل دۆزراوەتەوە، زانایان لەو بڕوایەدان هەر لەوێش چاپكرا بێت. گۆتنبێرگ لە نێوان ١٤٤٤-١٤٤٨ لە ستراستبۆرگ چۆتە باسێل، لێرەش ئەو بەرهەمەی چاپكردیە. ئەوەش دەكاتە ئەوەی كە ئەم پەرتووكە كۆنترین بەرهەمی چاپی گۆتنبێرگە.





bro. Et quosdã quidē posuit de-
us in ecclia. primū aplos. secū-
do p̄phetas. tercio doctores: de-
inde virtutes. exinde gratias cu-
racionū: opitulaciones guber-
naciones. genera linguaꝝ: in-
terpretationes sermonū. Nūquid
oēs apli? Nūqd omnes p̄phe-
te? Nūquid omēs doctores? Nū-
qd omēs virtutes? Nūqd omēs
gratiā habēt curationū? Nūqd
omēs linguis loquūtur? Nun-
quid omēs interpretant̄? Emula-
mini autē carismata meliora.
Et adhuc excellētiorē viā vobis
demonstro. XIII
Si linguis hoīm loquar et
angeloꝝ: caritatē autē nō
habeā: factus sum velut es so-
nās aut cimbalū tinniēs. Et si
habuero p̄pheciam. et nouerim
misteria omīa et omnē sciētiā
et habuero omnē fidē ita ut mō-
tes trāsferam. caritatē autē non
habuero: nichil sum. Et si distri-
buero in cibos pauperū omnes
facultates meas. et si tradidero
corpus meū ita ut ardeā: carita-
tem autē nō habuero: nichil mi-
chi p̄dest. Caritas paciēs est: be-
nigna est. Caritas nō emulatur.
nō agit perperā: nō inflatur. nō
est ambiciosa: nō querit q̄ sua
sūt. Nō irritatur: nō cogitat ma-
lū: nō gaudet sup iniqtate: con-
gaudet autē veritati. oīa suffert.
omīa credit. omīa sperat: omi-
a sustinet. Caritas nūq̄ excidit.
Siue p̄phetie euacuabūtur: siue
lingue cessabūt: siue sciētia de-
struetur. Ex parte enī cognoscimus:
et ex parte p̄phetamus. Cū autē ve-
nerit qd̄ pfectū ē: euacuabit qd̄
ex parte est. Cum essem paruu-
lus loquebar ut paruulus: sa-
piebā ut paruulus: cogitabā ut
paruulus. Quando autē factus
sum vir: euacuaui q̄ erant par-
vuli. Videmus nūc p speculū in
enigmate: tunc autē facie ad fa-
ciem. Nunc cognosco ex parte:
tunc autē cognoscā: sicut et cog-
nitus sum. Nūc autē manēt fi-
des spes caritas tria hec. Maior
autē hoꝝ est caritas. XIIII
Sectamini caritatē: emula-
mini spūalia: magis autē
ut p̄phetis. Qui enī loquitur lin-
gua: non hominibus loquitur sed
deo. Nemo enī audit. Spiritus
autē loquitur misteria. Nā qui p-
phetat: hominibus loquitur ad edifi-
cationē et exhortationem et cō-
solationem. Qui loquitur lingua.
semetipm edificat: q̄ autē p̄phe-
tat ecclesiā dei edificat. Volo autē
omēs vos loqui linguis: magis
autē p̄phetare. Nam maior ē q̄
prophetat q̄ qui loquitur linguis
nisi forte interpretetur: ut ecclesia e-
dificationem accipiat. Nūc autē
fratres. si venero ad vos ling-

وێنەی ژمارە (11)

لاپەڕەیەك لە ئینجیلی بەناوبانگ بە ٣٦ خەتی. ئایەتی ١٢:٢٨-١٤:٠٦ لەلایەن

یوهان گۆتنبێرگ لە نێوان ١٤٥٩-١٤٦١ چاپکرایە





НАВЕЛИЦѢИ ВЕЧЕРИ НА В

звахъ · стыхе́ры · въскр͠сны · гла́съ · а҃ ·

Вечерьнѧѧ наше мл҃твы · прїи-
ми ст҃ыи г҃и · и подаждь
намь ѿставлєнїе грѣхомь ·
ико ты єдинь ꙗвлеи въ мирѣ
въскр͠сенїе
Обьидѣте люд͠їе сїѡнь и ѡбь-
имѣте єго · и дадите сла-
воу въ немь въскр͠шемоу из мр҃твыхь. ико ты
є б҃ь нашь, избавлеи нась ѿ безаконїи нашихъ :
Прїидѣте людїе поимь и поклонимсѧ х҃оу · сла-
веще єго иже из мр҃твыхь въскр͠сенїе · є ко
ты є б҃ь нашь · избавлеи нась ѿ безаконїи нашихъ :

وێنەی ژمارە (17)

Makarije ئەم کتێبەی لە Cetinje لە ساڵی ١٤٩٤ چاپکردووە



Oliuro terçeyro

Aqui se começa o liuro terçeyro intitullado vida de xpo segũdo a hystoria euãgelical. Capitollo primeiro da cõfissom verdadeira sse aqual fez pedro por todos.

Apres das suso ditas cousas: jesu como saluador derramando e spargẽdo per todo lugar o lume da sua doctrina: e buscando de cada lugar os q̃ perdidos erã e saluãdo p todas partes os que eram penitẽtes. [veyo a as partidas.] e comarca. [de çidade] que auia nome. [çesaria philippe] mas agora ha nome paueas. Em esta çidade e darredor della moraua poboo dos gentios. e portanto xpo em aq̃sto quis aqui reuellar ou descobrir o segredo da sua encarnaçõ porq̃ mostrasse que o fundamento da ygreja esta em a fe dos gẽtios. Estãdo elle soo fazẽdo oraçõ no caminho. [preguntou seus discipollos.] nõ por aprẽder delles algũa cousa em q̃ duuidasse. mas por enformar a elles na verdad. E por de terminar o erro dos homeẽs per as suas respostas. ou tro si por lhes dar occasiõ d auerem merito e por affirmar a nos e cõfirmar em a fe pa sua fiel cõfissom. Jtẽ por tal q̃ cõfirmasse a fe sua delles per o seu cõsentimẽto e conheçimẽto seguinte. e por mostrar a differença dos apostollos e dos poboos. Querendo pois o senhor q̃ fosse declarad os erros d gẽti. por tal q̃ tirad aq̃lles os discipoll digã a uerdade p̃gũtou os dizẽdo [quẽ dizẽ os homẽs q̃ he o filho do homẽ?] s. da virgẽ. Segũdo crisostomo. filho do homẽ s. da virgẽ se diz aq̃lle q̃ quer q̃ seja creydo a despẽsaçõ da encarnaçõ. q̃ quer q̃ vẽham a auer della cõheçimẽto. e q̃ a cõfessem e aq̃sto a soo xpo cõuẽ. s. seer filho da virgẽ porq̃ adã foy filho da terra e os outros som filh dos homẽs porq̃ som geerad d padre e de madre: mas soo xpo foy filho d huũ soo homẽ. s. da virgẽ: e hũa soo madre teue na terra. assy como no çeeo teue huũ soo padre. Segũdo jeronimo nom disse christo quem dizem os homẽs que som eu porque nõ parecesse que o dizia por se guabar ou louuar. A qual cousa he contra aquelles que semp̃ se querẽ nomear da mais honrra da geeraçom e dos mais dign parentes q̃ teẽ. e nõ fazẽ mẽçõ dos mais peq̃n. E assi meesmo deuiã de preguntar os p̃llad e os doctores e os grãdes homẽs por sua fama aos seus chegad. porq̃ a boa fama do q̃ he p̃sidente e regedor mujto ajuda a fazer pueito e fructo: e a ma a fama grãde dãpno traz para aq̃sto. Onde diz origines preguntou xpo os discipollos porq̃ nos sejamos ensinad de sempre escoldrinhar q̃ oppiniõ teẽ os homẽs a çerca de nos por tal q̃ se alguũ mal se diz q̃ o cortem e tiremos os aazos. e as razoões porq̃ aq̃llo vyer e nasçe e se alguẽ bẽ dizem de nos q̃ o acreçẽtem. e dem aazo q̃ nossa oppiniõ e fama seja ajnda melhor. E os discipoll dos bp̃os som aqui ensinad p exẽplo dos apostoll q̃ q̃ aesq̃r oppinioões e famas q̃ ouuerẽ de se bp̃os q̃ lhes façã rellaçõ dellas. E ẽ aq̃llo q̃ o senhor p̃gũtou p a fe das cõpanhas aos appostoll deu a entender q̃ os p̃llad som tehud d dar cõtã da fe de se subdict. E porq̃ de xpo erã desuayradas oppinioões ẽ o poboo por tãto [respõderõ os discipoll dizẽdo q̃ algũ o diziã q̃ era johã o baptista. e outr diziã seer helias. outr jeremias ou hũ dos antigoos prophetas] p̃meir e q̃ resurgira do mort. E assi agora d̃suajrã os homẽs ẽ buscãdo a saluaçõ Cada huũ poõe a sua bẽauẽturãça ẽ aq̃llo q̃ auia. e aq̃llo honra e adora por ds. porq̃ segũdo agustinho. esto he adorado do homẽ q̃ p elle he mais amado [De si demãdou aos discipoll] q̃ elles meesmos cõfessassẽ aq̃llo q̃ delle entẽdiã. [E disse lhes e v:] outr q̃ nõ soões da gẽte popullar mas soões me discipoll a q̃ he dado d cõheçer o misterio: e segredo do regno de ds. e q̃ sooes luz do mũdo a q̃ eu notiffiquey q̃aesquer cousas q̃ ouui do meu padre. [quẽ me dizees que som.] E pedro conheçendo em elle diuinal natureza seer verdadeiramente: e confessando em huũ meesmo soposto seer verdadeiro deos e homem. [respondeo dizendo. Tu es christo.] e em quanto es homem es vntado de oleo de graça sobre te cõpan

وێنەی ژمارە (20)

یەکەم کتێب بە زمانی پورتوگالی بە ناوی: Ludolphus de saxonias Vita Christi, Olivro da vida de Jhesu Christo، لە شاری لیسبۆن لەلایەن هەردوو چاپچی بەناوبانگ: Valentin fernandez و Nicolaus de saxonia ساڵی ١٤٩٥





In the begynnyng of the yere. And after Michelmas whan partrickes passe her daunger I haue seen them made sum to fle the rive sum to fle the Tele vppon the Reuer: at the Jutte sume to fle the Wodecok and sum for the blacke brde and the thrushe.

The Wodecok is combrouse to fle: bot if ther be crafte. therfore when ye come to a Wode or a quech of bushus. cast yowre sparehawke in to a tre and bete the bushes then and if any Wodecok arise she Will be sure therof. Ye most first make hir to a fowle cast vp owt of the bushes. and yowre hawke most sit on loofte as ye make hir to a partriche. Also as I sayde ye may call hir a spare hawke: for an oder cause. for and ther wer a shippe fraght full of hawkis. and no thyng ellis. and ther were a spare hawke among thaym ther shuld no custom be payd becaruse of hir. And so for the most comune name thay be calde sparre hawkes for the resonee a forsayd.

An hawke flieth to the vew. to the Beke. or to the Toll. Nõ Crepe Querre Fer Jutty &c

An hawke fleeth to the Ryuer dyuersie Ways. and flethe the fowle dyuerli. That is to say she flieth to the Velõ or to the beke. or to the toll. & all is bot oon. as ye shall knawe here after She fleeth also to the quarre: to the crepe. and no mo Ways bot thoos. iij. And she Nymmyth the fowle at the fer Jutty or at the Jutty ferre.

Now shall ye knaw what theis termes betokyn & moo folowyng. as Hut. Jutty ferry. Mounte Raundon. Crepe. Ennewed.

وێنەی ژمارە (22)

ئەم کتێبە بە ناوی The book of hawking, hunting and heraldry. لە St.Albans لە ساڵی ١٤٨٦ چاپکرا.